

50

# مێژووی کوردەکانی جزیرە

447- 656 ک


نوسینی

ئومێد بەهرامی نیا

وەرگێڕانی

عبدالرحیم معرفتی

پرۆژەی تیشك (50)

# مێژووی
# کوردەکانی جەزیرە
# ٤٤٧ - ٦٥٦ك


نووسینی
ئومێد بەهرامی نیا

وەرگێڕانی
عبدالرحیم معرفتی


2009-1430

ناوی کتێب: مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧-٦٥٦ ك

ئامادەکردنی: ئومێد بەهرامی نیا

وەرگێڕانی: عبدالرحیم معرفتی

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٣٠٢) ساڵی (٢٠٠٩)

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

نەخشەسازیی بەرگ: سیف

نەخشەسازیی ناوەوە: سرمد

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، ژمارە (٥٠)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:
www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:
info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

# پێڕست

## پێشەکیی وەرگێڕ

### بە نێوی خودای بەخشندەی میهرەبان

نووسین و توێژینەوە لە بواری مێژوودا کارێکی گرینگ و فرە بایبدارە، بەڵام لە هەمان کاتدا تا بڵێی هەستیارو دژوارە و لیهاتوویی و پسپۆڕیی و بێلایەنیی و ئەمانەتداریی زۆری دەوێ، بۆ ئەوەی نووسەر لە داوی حەزو لایەنگریی لەم و لەو نەکەوێ و هەوڵ بدا لە کارەکەشیدا سەرکەوێ.

زیندووکردنەوەی رابردوو و خوێندنەوەو نووسینەوەی رووداوە مێژووییەکانی هەر گەل و نەتەوەیەك، خزمەتە بە مێژوو و شارستانییەتیی مرۆڤایەتیی بە گشتیی و ئەو گەلە بە تایبەتیی. بۆیە ئەم بوارە سوارچاك و پسپۆڕو لێزانی خۆی دەوێ و ناشێ هەر کەس دوو پەڕو پەڕتووکێکی لەم بارەوە خوێندەوە، تاو بداتە پێنووس و وەك مێژوونووسێك دێڕو نوختەو خاڵان دانێ و بە کەمتەرخەمیی و بێدەربەستییەوە لە مێژووی گەلان بڕوانێ.

گەلی کورد یەکێك لەو نەتەوە دێرینانەیە کە لە بەرەبەیانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە لە گۆڕەپانی ژیان دا چالاکانە بەشداریی لە بنیاتنانی کلتوورو شارستانییەتی مرۆڤ دا کردووە. بە درێژایی مێژوو رووداو و ململانێ و شەڕە ناوچەیی و جیهانییەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان ئێخەی ئەو گەلەیان گرتووەو بە داخەوە لە زۆربەی کات و قۆناغە مێژووییەکانیش دا زێفی زۆری لێکراوەو لە پێناوی بەرژەوەندیی بێگانەدا کاری گرانی پێکراوەو لە لایەن گەلانی مەزنیخوازەوە چاوبەست و چەواشە کراوەو رەنج و ماندووبوون و تێکۆشانی بە فیڕۆ دراوە. ئەو گەلە کە خاوەنی رۆڵەی ئازاو سوارچاك و چاونەترس بووەو وزەو هێزو توانای زۆری لەو سەرچاوە دەستەبەر کردووە و لە هەمان کاتدا نیازپاك و دڵاواو نانبدە و میواندۆست و پەیمانپارێز بووە، زۆرداران و

چاوچنۆکان کەڵکی خراپیان لە هەستی خاوێن و دڵی پاکیان وەرگرتووەو بە درۆو فێڵ و چاوبەست تا توانیویانە خزمەتی بەرژەوەندیی و دەسەڵاتەکانی خۆیان پێکردووەو خۆیان پێ لە تین و تەنگانە رزگار کردوون و هەر کە لەو گرفتانە دەرباز بوون و دەسەڵاتیان سەقامگیر بۆتەوە، دەستیان لێ بەرداون و خیانەتیان لێکردوون.

ئەو ستەم و دوژمنکارییەش تەنیا لە گۆڕەپانی شەڕو ململانێدا نەبووە، بەڵکو لە نووسینەوەی مێژوو و تۆمارکردنی رووداوە مێژووییەکانیش دا، نەیارانەو بە چاوی دوژمنکارانەوە مامەڵەی لەگەڵ کراوە و رۆڵ و کاریگەریی کورد لەو بوارەش دا لە بیر کراوەو ئەگەریش ئاماژەیەك بە ناوەکەی کرابێ، راستییەکانیان چەواشە کردووەو بەری ماندووبونی ئەو گەلەیان لە باربردووە. تەنانەت هەوڵیان داوە رەگەزو رەسەنایەتیشی لەکەدار بکەن و بە وەچەی دێوو درنج و مرۆڤی کێویی و دڕندە ناویان هێناوەو هەوڵیانداوە لە بەرەی مرۆڤیش بەریی بکەن. دیارە هۆکاری سەرەکیی ئەو گرفتەش ئەوەیە کە بە داخەوە کورد بۆخۆی نەیتوانیوە لەو بوارەدا بە رادەی پێویست کاراو چالاك بێت و زۆربەی مێژووەکەی لە لایەن بێگانەو نامۆ و نەیارانەوە بە زمانی بێگانە نووسراوەو تۆمار کراوە. هەر وەك نووسەری ئەم کتێبەش لە پێشەکییەکەی دا ئاماژەی پێکردووە، (هەر گەلێك نووسینەوەی مێژووی خۆی بە بێگانە بسپێرێ، خۆی و چارەنووسی نەتەوەکەی داوەتە دەستی ئەوان و ئەو بەخشندەییە جوێ لە شێواندنی فەرهەنگ و مێژوو و وێژەی ئەو گەلە، ئاکامێکی دیکەی نابێ).

با لەو بوارەدا بە تەواویی خۆمان بە بێکەس دانەنێین و تووشی هەڵە نەبین و ماندووبوون و تێکۆشانی ئەو مێژوونووسە کوردە کوردپەروەرانەش لە بەرچاو

نەگرین کە لە پێناوی راستکردنەوەی هەڵەی مێژوونووسە بێگانەکان و زیندووکردنەوەی مێژووی هێژاو راستەقینەی نەتەوەکەمان دا هەوڵی زۆریان داوەوەو هەنگاوی باش و بە جێیان هەڵێناوەو تەپ و تۆزی حەزی مێژوونووسە دەمارگرژەکانیان لە سەر پەڕی پەڕتووکی مێژووی گەلەکەمان رامالیوەو بە قەڵەمە بە بڕشتەکانیان مافی مێژوویی کوردیان بۆ کورد گێڕاوەتەوە. کاروانی ئەو سوارچاکانە بە پێشەوایی و سەرقافڵەیی شەرەف خان بدلیسیی دەست پێدەکاو گەلێك مێژوونووس و پسپۆڕی بە توانا لە ریزی ئەو کاروانەدا بە رێبازی کوردانەی شەرەفخان دا رێگەیان بڕیوەو دەبڕن و بە پێنووسی راستیوێژیان ورگی درۆ و چاوبەست و چەواشە دەدڕن و بە پەڕتووکی مێژوویی کوردانەیان، فرمێسکی چاوی خەمخۆرانی مێژووی کورد دەسڕن. مێژوونووسانی وەك مامۆستا ئەمین زەکی بەگ و مەلا جەمیل رۆژبەیانیی و حوسێن حوزنی موکریانیی و دوکتۆر کەمال مەزهەر و عەلائەدین سەجادی و محمد عەلی عەونیی و... هەرکامیان شاسواری زاناو بە کاری بواری مێژوو و مێژووناسیی بوون و بە پێنوسی راستینووسی خۆیان خزمەتی زۆریان بە مێژوو و وێژەی کورد کردووەو بە تۆمارکردنی راستییە مێژووییەکانی کوردو راستکردنەوەی هەڵەی مێژوونووسە رەگەزپەرستەکان، هەوری چڵکنی حەزی نەیارانیان لە ئاسمانی مێژووی نەتەوەکەمان رامالیوەو رچەو رێبازێکی روونیان بۆ هەموو ئەو کوردە قەڵەم بەدەستە مێژووزانانە دیاریی کردووە کە دەیانەوێ لەو بوارەدا خزمەتێك بە گەلەکەیان بکەن و هەوڵێك بۆ زیندووکردنەوەو زیندوو راگرتنی مێژووی کوردو کوردستان بدەن.

بێگومان هەوڵ و ماندووبوون و شیتەڵکاریی و توێژینەوەکەی کاك ئومێد بەهرامی نیاو خزمەتە بەرچاوەکەی لەم بوارەدا هیچی لەو کارە گەورەو

نووسینە پڕبەهرەو بەرهەمانە كەم نییەو خوێندنەوەو پێداچوونەوەو تۆماركردن و نووسینەوەو پوختەو پالاوتەكردنی مێژووی كوردەكانی جەزیرە، كارێكی پڕبایەخ و خزمەتێكی گەورەیە. ئەو كوردانەی كە رۆڵێكی كاریگەرو دیاریان هەبووە لە مێژووی شارستانییەتی ئیسلام و ناوچەكەداو سەروەریی و شانازیی كەم وێنەیان لە بەرگریی و پاراستن و گەشەپێدان و سەركەوتنەكانی ئیسلام و موسڵمانان دا هەبووەو بە تایبەت لە شەڕی دژی خاچهەلگرەكاندا، قارەمانەتیی و مێرخاسیی و ئازایەتییان، دەنگی دایەوە. كاك ئومێد بەوپەڕی ئەمانەتەوە دەستی بۆ ئەم كارە بردووەو پشتی بە سەرچاوە گرینگ و متمانەپێكراوەكان بەستووەو خۆی لە هەر چەشنە لایەنگریی و سۆزدارییەك پاراستووەو ئاماژەی بە زۆر هەڵەو كەم و كوورِیی هێندێك لە مێژوونووسەكان كردووەو با كوردیش بووبن ئەگەر هەڵەیەكیان كردبێ یان راستییەكیان چەواشە كردبێ، ئازایانەو بێلایەنانە، راستی رووداوەكەی باس كردووەو هەڵەكەی بۆ راست كردوونەوە. خاڵێكی دیكەی گرینگ و جێی سەرنج لە كارەكەی كاك ئومێد دا ئەوەیە كە سەرەڕای رێك و پێكیی لە نووسینەوەی مێژووەكەدا، ئاماژە بە هێندێك تێڕوانین و تێگەیشتنی هەڵەو بێ جێی هێندیك كەس دەكا كە رابردووی كەسایەتیی و ناودارانی كورد بە چاوێكی ئەمڕۆیی و بە بەراورد لەگەڵ كەش و بارودۆخی سیاسی ئێستا دەخوێننەوەو لەم سۆنگەوە رەخنە لە رەفتارو سیاسەت و هەڵس و كەوتی پیاوانی هەڵكەوتووی مێژووی كورد دەگرن و لە پشت شووشەی چاویلكەیەكی تەماویی بە كەشی سیاسی ڕۆژەوە، سەیری كارەكانیان دەكەن. لەم بوارەدا بە راشكاویی باسی چاوەڕوانیی بێ جێ و نەشیاوی ئەو كەسانە دەكا كە پێیان وایە صلاح الدین دەبوو هەشسەد ساڵ بەر لە ئەمڕۆ بە سیاسەتی ئەم سەردەمە كاری كردباو ئالای نەتەوەخوازیی و

کوردپەروەریی هەڵکربا لە سەردەمێك دا کە رەگەزو نەتەوە جیاوازەکان لە ژێر سێبەری پڕ بەختەوەریی ئیسلام دا پێکەوەو شان بە شانییەکترو بە یەکدەنگیی و هاوهەڵوێستیی، بۆ گەشەی ئیسلام و ئاسوودەیی هەموان تێدەکۆشان.

کاك ئومێد پاراستنی ئەو ئەمانەتەی ئەوەندە بە لاوە گرینگ بووە کە تەنانەت لە تۆمارکردنی سەرچاوەکان دا هەر بەوەندە وازی نەهێناوە لە کۆتایی کتێبەکەدا ناویان بێنی. بەڵکو لە هەر لاپەڕێکدا باسێکی لە سەر بابەت و رووداوێکی مێژوویی کردبێ لە پەراوێزدا ناوی سەرچاوە مێژووییەکەی نووسیوەو باسی نووسەرەکەی کردووە. خاڵێکی تر کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەم ئەوەیە کە هەوڵم داوە چەندی بۆم بلوێ بە شێوە دارشتن و نووسینێکی زمانەوانیی کوردیی کاری وەرگێڕانەکە ئەنجام بدەم و ئەوەش وایکردووە کە لە تەرجەمەی حەرفیی لابدەم و بە پێی توانا ماناو واتای فارسییەکە بکەمە کوردی.گومانیشی تێدا نییە کە کارەکەم بێ عەیب و کەم و کورتیی نییەو هیوادارم خوێنەری کوردی زانستدۆست بە چاوێکی دڵسۆزانەو خەمخۆرانە سەیری کارەکەم بکاو هەر هەڵەو لارییەکی هەست پێکرد هەوڵ بدا لە ریگەی خاوەن ئیمتیازو دەزگای سەرپەرشتی چاپی کتێبەکەوە ئاگادارم بکاتەوەو لە زانیاریی خۆی لەم بوارەدا بەهرەمەندم بکا. بۆ ئەوەی ئەگەر کارەکەم پێشوازیی لێکراو شیاوی دووبارە چاپکردنەوە بوو، ئەو کەم وکورپییانە چارەسەر بکەین و بەرهەمەکە دەوڵەمەندتر بکەین. ئومێد دەکەم بەم کارە بچووکەم خزمەتێکی شیاوم بە خوێنەری کوردو کتێبخانەی کوردی کردبێ.

عبدالرحیم مەعریفەتی

کوردستان/ هەولێر ٢٠٠٨/١٠/٢٧

## سوپاس و پێزانین

لە سایەی هاوکاریی و ڕێنوێنیی و دڵسۆزیی کۆمەڵێ لە بەڕێزان و گەورەپیاوان بوو کە ئەم نووسینە بەرەو گۆڕەپانی توێژینەوە مێژووییەکان هەنگاوی نا. هەر بۆیە لەم بوارەدا خۆی بە قەرزداریان دەزانێ و بە بێ ئەم هەوڵە ئەم دەسکەوتە دەستەبەر نەدەبوو. بە ئەرکی پێویستی سەرشانی خۆمی دەزانم ئەوپەڕی سوپاس و پێزانینم ئاراستەی بەڕێزان دکتۆر سەید ئەحمەدرەزا خزری و دکتۆر هادی عالم زادە بکەم، چونکە سەرەڕای راوێژو ڕێنوێنیی و نەهێشتنی کەم و کورتییەکانی نووسینەکە، هەرکامیان بە نووسینی پێشەکییەکی سەربەخۆ فرە چاکەیان لەگەڵ کردم.

جەنابی دوکتۆر شەهرام یوسفی فەر وێڕای ئەوە کە گەلێ خاڵ و بابەتی پڕبایەخی وەبیرهێنامەوە، زۆر دڵسۆزانەش هانی دەدام بۆ بە چاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە. بۆیە لە دڵەوە سوپاسی دەکەم و ڕێزی زۆرم هەیە بۆ هەوڵ و ماندووبوونی.

هەروەها زۆر سوپاسی هەوڵ و ماندووبوونی بێدرێغی بەڕێزان دوکتۆر سەید جەمال موسەوی، بەڕێوەبەری پێشووی گروپی "مێژووی وێژەو شارستانییەتی نەتەوە موسڵمانەکان" و دوکتۆر عەلی بەیات، بەڕێوەبەری ئێستای ئەو گرووپە، دەکەم کە ئەم توێژینەوەی بەردەستتان لە سەردەمی بەڕێوەبەریی و بەرپرسیاریی ئەوان دا ئەنجام دراوەو قۆناغە ئیدارییەکانی بڕیوەو مەودای قوتابیی بوونم لە خزمەت تێکڕای ئەو بەڕێزانەو گوڵچنین لە باغی پڕ بەرەکەتیان، هەلێکی زێڕین و بابیدار بوو بۆ من.

سوپاس و ڕێزی تایبەتیم هەیە بۆ ئەرك و زەحمەتەکانی برای بەڕێزم کاك جەلیل بەهرامی نیا کە لە کاتی خویندن و خویندکاریشمدا هەروەك قۆناغەکانی

دیکەی ژیانم، دڵسۆزانەباوەشی خۆشەویستیی بۆ کردمەوەو لە هیچ هەوڵ و کۆششێك کۆتایی نەکردو هیوادارم داهاتوویەکی روونی هەبێ و بەدەست و داوێنی پڕ لە موژدەو پەیام و چاوی گەشی هیوادارو بزەو خەندەی سەر زار، کۆش و داوێنی خۆشەویستیی و چین چین شادیی، بە سەر گیانی دا بڕژێ و هەموو کاتێکی ژیانی هەر خۆشیی بێت. تاقیامەت ئەم ووتـــانە بکەم بە پیشە سەد قیامەت رادەبووڕێ کۆتایی نایە ئەم ئیشە.

## پێشەکیی دوکتۆر هادی عالم زادە

## بە ناوی پەروەردگاری گیان و ژیریی

هەر هەوڵێك لە پێناوی روونکردنەوەی گۆشەیەك لە مێژووی ئێران بدرێ بەو مەرجە بنەماکانی شێوازی شیتەڵکاریی تێدا رەچاو بکرێ، شیاوی رێزو دەستخۆشییە. گرینگترین خاڵێك کە دەبێ لەم بوارەدا رەچاو بکرێت، ئەوەیە کە هەر لە سەرەتای کارەکەیەوە تێروانینی ئەرێنیی و نەرێنیی و پێشداوەریی خۆی سەبارەت بەو بابەتە کە توێژینەوەی لە سەر دەکاو ئاکامەکەی، بخاتە گۆشەی فەرامۆشییەوە، بۆ ئەوەی سەربەستانەو بە ئازادیی هەموو ئەو زانیارییانەی لە سەرچاوە مێژووییەکان وەریان دەگرێ، کەڵکیان لێوەرگرێ و نەکەوێتە داوی وەرگرتن و پەسندکردنی کۆمەڵەزانیارییەك بە هەست و لایەنگرییەکی تایبەتییەوە. وەرگرتن و هەڵبژاردنی بابەت و زانیاریی مێژوویی لە سەرچاوە مێژووییەکان هوشیارانە بێ یان نا، گەورەترین کۆسپی سەر رێگای لێکۆلینەوەی مێژووییەو لە رق و خۆشەویستیی دیارو نادیاری ناخ و زە ینی مێژوونووسەوە سەرچاوە دەگرێ و ئەو چەشنە زانیاریی وەرگرتنەیە کە هەر لە هەوەڵین هەنگاوەکانەوە، توێژینەوەو شیتەڵکارییەکە لە راستەڕێ لاڕێ دەکا.

لە ژێر شەبەقی ئەو راستییانەدایە دەبێ توێژەر ئەو خاڵانە بە هەند وەربگرێ و بە هەستیارییەوە سەرنجی ئەو راستییە بدات کە دەشێ و لەوانەیە ئەو سەرچاوانەش کە ئەو کەڵکیان لێوەردەگرێ، لە سەر بنەمای ئەو جۆرە توێژینەوەو بە هەست و حەزێکی لایەنگرانەوە نووسرابن و هەر چەند بۆخۆی لەرووی شارەزیی و هۆشیارانە تێبکۆشێ خۆی لە پێشداوەریی و لایەنگریی تایبەتیی و تیرەیی و نەتەوەیی و... بە دوور بگرێ و بە هەستی لایەنگرانە یان دوژمنانە هیچ زانیارییەکی مێژوویی وەرنەگرێ، بەڵام غافڵگیر دەبێ و دەکەوێتە

داوی هەڵبژاردنی زانیارییەکان لە لایەن نووسەری ئەو سەرچاوانەی بۆخۆی بە کاریان دێنێ و گیرۆدەی هەڵەی ئەوان دەبێت.

لە ژێر رۆشنایی تیشکی خۆری ئەو راستییانەی سەرەوەدایە کە پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندن و بەراوردی نێوان سەرچاوەکانی توێژینەوە، خاڵێکی گرینگ و پێویستی هەر لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییەو پێویستە توێژەر پێش ئەوەی کەڵك لە سەرچاوەکان وەربگرێ، هۆگریی و لایەنگریی سیاسیی و مەزهەبیی و نەتەوەیی و تەنانەت فەرهەنگیی نووسەر و بارودۆخیی مێژوویی سەردەمی نووسینی کتێب و سەرچاوەکە، هەڵسەنگێنێ.

بێگومان ئەگەر شارەزایی تەواو لەو بوارانەدا نەبێ کە ئاماژەمان بۆ کردن، بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوون و کارەکە توێژینەوەیەکی ئەکادیمیی و زانستییانەو راست و دروست و واقیعیی نابێت.

وا تێدەگەم بە لە بەرچاو گرتنی ئەو خاڵانەیە کە نووسەری ئەم کتێبە لە لاپەڕەی ٤ دا نووسیویەتی: (هەرکەس نووسینی مێژووی خۆی بە بێگانە بسپێرێ خۆی داوەتە دەست ئەوان و بێگومان ئەو بەخشندەییە فەرهەنگییە جیا لە پەرەپێدانی پەرتەوازەیی فەرهەنگیی، ئاکامێکی دیکەی نابێ!)

لە لاپەڕەی ٥ دا زیاتر لە سەر ئەم باسە دەڕواو دەنووسێ:

هەروەك توێژەری بیرتیژ سەید جەواد تەباتەبایی لە مەڕ مێژووی ئێران ئاماژە بەو راستییە دەکا کە (شەربەتی گرینگییدان بە مێژوو و مێژووی بیرکردنەوە کە بە قوڕگ و رێڕەوی نووسین و نووسراوەکانی ئوروپاییەکان دا تێدەپەڕێ، دەردو ژانی کەمتەرخەمیی بەرامبەر بە بنەماو بنچینەکان زیاتر دەکا.) ئەم وتەیە سەبارەت بە کوردەکان –کە بەشێکن لە مێژووی ئێران و وەك مێژووی ئێران دێرینن –، باشتر جێ دەگرێ.

بەو ڕێخۆشكردن و پێشەكییانەوە بڕیاری داوە (مێژووی كوردەكان) لە قۆناغێكی دیاریكراو و چوارچێوەی سنوورێكی جوگرافیی سنووردار دا بنووسێتەوە، مێژوویەكی پوختەی ئەوتۆ كە پارێزراو و دووربێ لە بەڵای ئەو پەرتەوازەییە فەرهەنگییە كە بە هۆی تێڕوانینی مێژووی ئێران لە پشت شووشەی چاویلكەی ڕۆژئاواییەوە، سەری هەڵداوە.

بەڵام من لە سەر ئەو باوەڕەم : مێژووی هەرگەلێك، هەر نەتەوەیەك، هەركەس پێی خۆشە بینووسێ، با بنووسێ، (ڕۆژهەڵاتیی بێ یان ڕۆژئاوایی، خۆیی بێ یان بێگانە). بەڵام دەبێ ئەو كەسە كۆمەڵێك تایبەتمەندیی و تواناو لێهاتوویی ئەوتۆی هەبێ بۆ ئەو كارە دەست بدا، كە دیارترینی ئەو تایبەتمەندییانە بریتین لە: نەبوونی ڕق و دەمارگیریی، ڕاستی ویستیی، زانین و هۆشیاریی، ڕەچاوكردنی شێوازی لێكۆڵینەوە. پێم وایە نووسینەوەی مێژوو بە لەبەرچاوگرتنی ئەو تێبینیی و مەرجانەوە، پەرتەوازەیی فەرهەنگیی لێ ناكەوێتەوە.

لە لایەكی ترەوە ئایا ئەو كتێبە مێژووییانەی لە لایەن مێژوونووسەكانی خۆمانەوە نووسراون هەموویان هەتوانی ژان و دەرمانی دەردن و حەزی خۆبەزلزانیی زیاتر ناكەن؟ ئایا وێنەی ئەو نووسین و نووسەرانە هەر وەك ئەو كەسە نییە كە دەچێتە لای قازیی و بە ڕەزامەندییەوە دەگەڕێتەوە؟ نموونەی زۆرمان لەو چەشنە نووسینە خۆماڵی یانە لە بەردەست دایە. كامەیان چیرۆك و سەربوردەو حیكایەتی سەر ڕێژ لە زێدەڕۆیی و نیشتمانپەرستیی تێدا نییە؟ ئایا ئەو ڕووداو وریوایەتە ئێرانییانەی لە كتێب و سەرچاوە مێژووییەكانی وەك (**الاخبارالطوال**)ی دینەوەریی و شانامە سەبارەت بە شەڕی ئێران و عەرەبەكان تۆمار كراون، دەگونجێ ڕاستیی ئەو ڕووداوانەیان باس كردبێ؟ بێگومان نە

ئەوانە جێی متمانەی تەواون و هەڵبەت ناشێ گێڕانەوەی رووداوە مێژووییەکانیش لە زمان عەرەبە موسڵمانەکانەوە بە تەواویی بە راست بزانین. بۆیە پێویستە هەر وەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کرد هوشیار بی و بزانی پێنووس لە دەستی کێ دا بووەو لە چ سەردەمێك و لە کوێ و لە کام بارودۆخی سیاسیی و...دا نووسراوە؟ هەروەك دەبێ لە هەڵەو چەوتیی و دەستکاریی و نیازخراپیی بیگانە وریا بین، نابێ فریوی خۆیی و دۆست و مێژوونووسە نێوخۆییەکانیش بخۆین.

هیوادارم کاك ئومێد بەهرامی نیا خوێندکاری تێکۆشەرو خاوەن هەستی بەندە، بە رەچاوکردنی ئەو تێبینییە زانستی یانە، لە هەوڵی نووسینەوەی بەشێك لە مێژووی گەل و وڵاتی خۆی دا، توێژینەوەیەکی سەرکەوتووانەی ئەنجام دابێت.

**هادی عالم زادە.**

## پێشەکیی دوکتۆر سەید ئەحمەد رەزا خزری

## بە ناوی خوا

بێگومان کۆمەڵگەی فەرهەنگیی و خوێندەوارو زانکۆیی بە هۆی ئەوە کە ئەرك و رۆڵێکی گرینگی وەك گەشەپێدان و وەبەرهێنانی زانست وزانیاریی لە سەر شانە، شوێن و پێگەی تایبەتی خۆی هەیەو ئەرکێکی بنەڕەتیی و هەستیاری بە ئەستۆوەیە کە بریتییە لە رێنوێنیی مرۆڤ بەرەو بایەخە کۆمەڵایەتییەکان و خۆشکردنی کەشی پێکەوە ژیان. لە سەر ئەم بنەمایە کۆمەڵگە جیاجیاکان ماف خۆیانە چاوەڕوانییان هەبێ لە بیرمەندو چالاکانی بواری زانستە مرۆییەکان هەست بە لێپرسراوی بکەن لە بەرامبەر بابەتە کۆمەڵایەتییەکان و هەوڵ بدەن بۆ چارەسەری زانستییانەو یاسایی ئەو گرفتانە.

ئەم پەڕتووکە کە بە هەوڵ و بڕیارو پێنووسی بەڕێز کاك ئومێد بەهرامی نیا نووسراوە، ئاکام و بەرهەمی هەست کردن بە لێپرسراویی و پابەندبوونی فکریی وفەرهەنگیی و پێکەوەژیانی مرۆڤانەو هەروەها گرینگیی و پێویستیی گرینگییدان بە مێژوو و فەرهەنگی نەتەوەکانی ئێران بە مەبەستی دەوڵەمەند کردنی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان لەم بوارەو لە نێوخۆی ئێرانە. وڵاتی ئێران و مێژووی فەرهەنگ و شارستانییەتی کۆنی ئەو وڵاتە، بەرهەمی داهێنان و هەوڵ و ماندووبوونی هەموو دانیشتوونی ئەو وڵاتەیەو فرە رەنگیی و فرە رەگەزیی و تان و پۆی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی ئەو خەڵکانە، ئەوە دەخوازێ کە دادپەروەرانە سەرنجی ماف و پێگەی نەتەوەکانی ئێران بدرێ لە پرۆژە گەورەکانی پەرە پێدانی شارەکان لە بوارەکانی فەرهەنگیی و ئابووریی و سیاسیی و....دا.

ئەم کارە سەرەڕای ئەوە کە بە هۆی بارهێنانی بارێکی دەروونی لەبارو ڕەزامەندیی دەروونیی نەتەوەکان بۆ بەشداریی لە پرۆژەی (بە نەتەوەبوون)دا یارمەتییەکگرتوویی و بەهێزکردنییەکرپزیی نێوخۆیی دەدا، توانای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ قەیران و کەم و کووڕییە جۆراوجۆرەکانی دنیای نوێ تا ڕادەیەکی بەرچاو بەهێز دەکاو بە نواندن و زیندووکردنەوەی بابەتی کاریگەریی ئەو لێکۆڵینەوەو خستنەڕووی ڕۆڵی بەرچاو و دیاریان کە سروشتییە خاڵی بەهێزو لاوازی تێدایە، هێزی باوەڕبەخۆبوون -کە مەرجی سەرەکیی پێکەوە هەڵکردنە لە کۆمەڵگەدا- لەواندا بە هێزتر دەکاو بەم جۆرەو لەم ڕێگایەوە دەبێتە پاڵپشت و یارمەتیدەری تەندروستیی و خۆشحاڵیی کۆمەڵگە. هەر وەك بە نیشاندان و ئاشکراکردنی مێژوو و بەرخودان و خاوەن هەڵوێستیی نەتەوەیەك لە ئاڵ وگۆڕە مێژووییەکاندا، نەتەوەکانی تریش لە پێگەو بایەخی ئەو نەتەوە شارەزاو ئاگادار دەکاتەوەو لەو ڕێگایەوە باری دەروونیان ئامادە دەکات بۆئەوەی ئەو نەتەوە بە فەرمیی بناسن و ڕازی بن مامەڵەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و پێکەوەژیانیان هەبێ، بێگومان ئاکام و بەرهەمی ئەو باوەڕبەخۆبوونە لە ڕووی فەرهەنگیی و گیانی حەوانەوە لەگەڵ کەسانی تردا، دەستکەوت و بەرهەمێکی ئەوەندە بە بایەخە کە مەترسیی نەبوونی ئەو جۆرە ئامادەیی و گیانی پێکەوە ژیانە، لە لایەن ئەو مێژوونووسانەوە باشتر هەستی پێدەکرێ کە چەندین جار لە خوێندنەوەی مێژوودا سەربوردەی سەرسوڕهێنەری سەرەنگرێ بوونی ئەو حکوومەت و دەسەڵاتانەیان خوێندۆتەوە کە بە ڕواڵەت فرە بە هێزبوون، بەڵام لەگەڵ گرفتی پێکەوەهەڵکردنی نێوخۆیی دەستەویەخەبوون.

گرینگییدانی تایبەت بە مێژووی نەتەوە جیاجیاکانی کۆمەڵگەی مرۆڤ – کە ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتان دا گرینگیی زۆری پێدەدرێ – وێڕای ئەوە کە پیکهاتەو پێناسەی نەتەوە یی نەتەوەکان بەرجەستە دەکاو گەشەو گۆڕانی ئەو نەتەوانە شان بە شانی ئاڵوگۆڕە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان دەخاتە روو و جیاوازیی پڕ واتای تێڕوانینی نەتەوەکان بۆ یەکتر لە مەودای مێژوودا روون دەکاتەوە، هونەرنوێنیی و لێهاتوویی هونەریی مێژوو لە پێکهاتەو پێناسەی پەیکەری چییەتیی نەتەوەکان دا دەخاتە بەرچاو و یارمەتیی مرۆڤ دەدا لە ناسینی پێکهاتەو گۆڕان و ناسنامەی نەتەوەیەك دا.

بێگومان ئێستا بە هۆی شەپۆلی لافاوی (بەجیهانیبوون) دۆزینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی لە زۆربەی وڵاتان دا بۆتە جۆرێك لە هۆگریی بەرینی فەرهەنگیی و سیاسیی و حەزی پاراستن و بەهێزکردنی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکان، بۆتە بەشێك لە کاری دەروونناسیی هێندێك لە کۆمەڵگاکان بە کۆمەڵگەی ئیمەشەوە.

ئەو بەرهەمەی بەر دەستتان هەوڵی راستگۆیانەو هەنگاوییەکەم و بە هێزو خۆڕاگرانەی لاوی خوێندکار کاك ئومێد بەهرامی نیایە کە لە پێناوی دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجە گەورەو گرانە، هەموو هەوڵ و لێهاتوویی خۆی دەکار کردووە.

بەو هیوایە کە خوێنەرانی زانست دۆست بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە و ئاراستەکردنی رێنوێنییەکانی خۆیان، یارمەتیی هاوکارو هاوهەستەکانی نووسەر بدەن لە ئەنجام دانی لێکۆڵینەوەی زانستیی دا.

**وەناو خودا**

**پێشەکی نووسەر**

(مێژوو لێوانلێوە لە لاشەی ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە هەلی هەڵکەوتوودا بەئاکام نەگەیشتن).

(سەمیر ئەمین)

رەوتی خێرای ئاڵوگۆڕەکانی ژیانی مرۆڤ لەم چاخەدا، ئەو راستییە روونەی بە هەموو کەس سەلماندووە کە رەهەندی ژیانی ماددی لە کارگەیەك بەولاوە هیچیتر نییەو هەرکەس نەگاتە کاروانی بەرهەمهێنەران، بێگومان دەبێتە کەرەسەی خاوی بەردەستی بەرهەمهێنەرانی ترو جویَ لە چەند کەسێك کە لە ئەشکەوتی تێڕوانینەکانی خۆیان دا نوقمی خەوێکی قووڵ بوون، ناشێ کەسی تر نکوولی لەو راستییە بکات. گومانی تێدا نییە بۆ ئامادەبوون و خۆنیشاندان بە کەسانی تر لەم گوندە جیهانییەی ئێستاو سەردەمی (بەجیهانیبوون)[1] دا، پێویستە لە هەنگاوییەکەم دا بەپشتەماڵی شیاوی ئامادەبوون خۆمان داپۆشین. ئەگەر وانەبێ لە ژێر تەوژمی تەزووی سەرمای جیهانێکی لەو چەشنەدا، رکابەرەکانی تر نەك هەر وڵامی سڵاوت نادەنەوە بەڵکو...! ئەوئەرکەش بەبێ چوونەناو پەردەی مێژوو و ئامادەکردنی پەردەو پشتەماڵێکی شیاوی سەردەم، بەلەبەرچاوگرتنی پەردەو پۆشاکی قۆناغە رابردووەکان، بە کردەوە پیادە ناکرێ. چونکە (ئێمەی کورتەباڵا) لە سەر شان و پیلی گەورەدێرینەکانمان وە ستاوین و هەروەك "سیسرۆن" سیاسەتمەدارو وتاربێژی بەنێوبانگی رۆمیی دەڵێ: (ئەو شتەی کە ژیانی مرۆڤانەمان دەڕازێنێتەوە، لە سەر رووپەڕی مێژوو

---

[1] Globalization

و کروپۆی ژیانی باب و باپیرانمان وێنا بووەو چاوقونجاندن لە حاند ئەو رابردووە، بە واتای ئەوەیە کە بۆ هەمیشە لە قۆناغی منالّیدا دەژین).[٢]

بە هۆی ئەوەکە مێژووی هەر گەلێك گۆڕەپانی هوشیاری نەتەوەیی و رەوتی ئالّوگۆڕی ئەو گەلەیە لە مەودای مێژوودا، پێویستە نووسینەوەی مێژووی ئەو گەلەو شیتەلّ و توێژینەوەی مێژووەکەش لە هوشیاریی و زانیاریی خۆیەوە هەلّقولّابێ. بە سەرنجدان لەو خالّە گرینگە دەشێ بلّێین: هەر گەل و نەتەوەیەك نووسینەوەی مێژووی خۆی بە بێگانە بسپێرێ، خودی خۆی داوەتە دەستی ئەوان و ئاشکرایە کە ئەم سەخاوەت و بەخشندەییە فەرهەنگییە، جوێ لە پەرەپێدانی پەرتەوازەیی فەرهەنگیی، ئاکامێکی تری نابێ.

بە داخەوە سەرەڕای گرینگیی و ئاشکرایی ئەو راستییەی کە باسمان کرد، زۆربەی ئەو نووسینەی کە ئەمڕۆ بە مێژووی ئێمەی ڕۆژهەلّاتیی دێتە ژمار، لە لایەن شیتەلّکارو توێژەرە رۆژئاواییەکانەوە نووسراوە کە لە پێناوی دۆزینەوەی ونبووی خۆیان و روونکردنەوەی ئەو راستییانەی پێوەندی بە خۆیانەوە هەیە، سەیری مێژووی رۆژهەلّاتیان کردووەو (روژهەلّاتناسییەك)[٣] کە لەو جۆرە تێڕوانینە پێکهاتووە ئاوێتەی دەستێوەردان و کوێخایەتیی و کەشی مێژوویی سەرهەلّدانی خۆیان بووە و هەولّی داوە لەودیو شووشەی چاویلکەی رۆژاواییەوە واتایەك بەو راستییە بدات کە پێی دەگوترێ رۆژهەلّات و ئاشکرایە کە رۆژهەلّاتناسان بە پێچەوانەی تێڕوانینیان بۆ فەرهەنگ و کلتووری یۆنان و رۆم کە خۆیان بە درێژەدەرو تەواوکەری ژیربێژیی ئەوان دەزانن، هەلّوێستی رەخنەگرانەیان بەرامبەر بە رۆژهەلّات نەگرتووەو پێوەندییەکییەك لایەنەیان

---

[2] لە میلانی وەرگیراوە, لاپەڕە ٦٥

[3] orientalism

لەگەڵ مێژوو و گەورەپیاوانی مێژووی رۆژهەڵات دامەزراندووە کە دیوێکی ئەو پێوەندییە بە چەشنی کامیرایەو دیوەکەی تری بابەت و مەبەستی توێژینەوەو شیکردنەوەیەو چازان و بیرمەندە رۆژاواییەکان بەم جۆرە بیرکردنەوە یان لایەنی بەرامبەرو شتێکی جیا لە خۆیان بۆ راڤەو توێژینەوەکانیان داتاشیوەو لە بەرامبەری دا مودێرن و شارستانییەتی خۆیان پێناسە کردووەو بە سەرهەڵدانی دوو جەمسەری جیاوازی ناعەقلانیی (عەقلانیی ورۆژهەلاتیی– رۆژئاوایی) هەرچی دەمارگرژیی و چەقبەستووییە بە سەر یەکەمیان دابڕیوەو هەرچی بیرکردنەوەی ئازادانەو سۆزدارییە، بۆ دووهەمیان بە رەوا زانیوە.[٤] هەر وەك توێژەری بیرتیژ سەید جەواد تەباتەبایی لە مەڕ مێژووی ئێران ئاماژە بەوراستییە دەکا کە (شەربەتی گرینگیی دان بە مێژوو و مێژووی بیرکردنەوە، کە بە رێڕەوی نووسین و نووسراوەکانی ئوروپاییەکان دا تێدەپەڕێ، دەردو ژانی کەمتەرخەمی بەرامبەر بە بنەماو بنچینەکان زیاتر دەکا).[٥] ئەم ووتەیە سەبارەت بە کوردەکان باشتر جێ دەگرێ. چونکە زۆربەی مێژووی ئەوانیش بەرهەمی پێنووسی چەند نووسەرو رۆژهەلاتناسێکی رۆژئاوایی وەك مینۆرسکی و دێرك کینان و کریس کۆچێرایەو مێژووی هاوچەرخی کوردەکانیش کە بەرهەمی بینین و شایەتحاڵیی هەواڵنێرو سیاسەتمەدارو کەسانی بواری

---

[4] مەبەست لە هێنانەگۆڕی ئەو قسانە ئەوە نیە کە حاشا لە هەوڵی پڕبایەخی رۆژهەلاتناسان لە پێناوی پوختەوپالاوتەکردنی کتێبە رۆژهەلاتییەکان و برەودان بە رەوتی نوێی گرینگیی دان بە مێژوو, بکەین. بەڵکو دەمانەوێ هوشیاریان بکەینەوە و هەوڵ بدەین روانگەیەکی رەخنەگرانەو بەراورد بەرامبەر بە نووسین و بەرهەمی رۆژهەلاتناسان بێتە کایەوە. (بۆ شارەزایی زیاتر سەبارەت بە رۆژهەلاتناسیی و روانگە جیاوازەکان لە بەرامبەریدا, بگەڕێوە بۆ "ناشرکتاب": اشوری,٦٩-٨٧. فیرحی,٣٢-٣٦. بروجردی,٩-٣٠. میرسپاسی,٤٥-٥٠.

[5] جدال قدیم و جدید.

سەربازیی رۆژئاواییە کە بە هۆی کارو پیشەکەیانەوە لەگەڵ کوردەکان تێکەڵ بوون، لە ئاستی چەند راپۆرتێکی رۆژنامەوانیی تێناپەڕێ.

نووسەر لە ژێر شەبەقی ئەو راستی یانەدا کە باس کران و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵە کە (مێژووی تایبەتی هەر گەل و نەتەوەیەك ئەو کاتە دەست پێدەکا کە لە سەر رووپەڕی پەڕتووك بنووسرێ)[٦]

بە سەرنجدان بە بوونی کوردەکان لە بەرەبەیانی مێژووداو لە رۆژهەلاتی زەوی و ناوچەی نێوان دۆڵی دووزێ (بين النهرين) وەك بێشکەی شارستانییەتی مرۆڤ، ئەگەری (نەبوونیان لە مێژوودا)[٧] پووچەڵ دەکاتەوەو لە پێناوی سەلماندنی ئەو راستییەدا و بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە بە هاوکاری گرووپی مێژووی کلتوورو شارستانییەتی ئیسلامیی کۆلێژی ئیلاهیاتی زانکۆی تاران، ماستەرنامەی پسپۆڕی باڵای خۆی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کرد. بێگومان نووسینەوەی مێژووی کوردەکان وێڕای بەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاریی مێژوویی ئەوان، یارمەتی دەوڵەمەندتر کردنی گەنجینەی فەرهەنگ و کلتووری ئێرانیش دەکا. بە هۆی ئەوە کە ئێران وڵاتێکی فرەنەتەوەیەو سەدان ساڵە کوردو گەلانی تری ئەو وڵاتە بە هاویەشیی لەسەری دەژین. لە لایەکی تریشەوە رۆشنایی دەخاتە سەر شەوەزەنگی چەند گۆشەیەکی تاریك و نادیاری مێژووی پڕهەورازو نشێوی شارستانییەت و کلتووری ئیسلام.

ئەم نووسینە لە پێناوی پێکان و وەدیهێنانی هەرسێ مەبەستەکەی سەرەوە، هەوڵێکی فرە بچووکە سەبارەت بە مێژووی بەشێك لە کوردەکان لە برگەیەکی

---

6 هیگل,٤ .

7 "تعطیلات در تاریخ" ناوی وتارێکی بە نرخە کە داریوش شایگان نووسیویەتی. (نك:نوتوویژ, ژمارە ٦, زستانی ١٣٧٣ ك.ه,ل ٧ -٢١).

دیاریكراودا كە بە هۆی هەڵكەوتەیی جوگرافیای جیاوازیان لە كوردەكانی ترو دراوسێیەتی (دار الخلافة)ی بەغداو هەڵكەوتنی ئەو ناوچە لە سەر چوارڕێیانی پێوەندی نێوان ئێران و عێراق و شام و رۆم، پێگەو گرینگیی تایبەتی خۆی هەیەو ئەو هەڵكەوتوویە لەبارە كاریگەریی قووڵی لە سەر هەورازو نشێوی ئەو مێژووە هەبووە و هەرێمی جزیرەی كردە ناوەندێكی گەرم و گوڕو پڕ رووداوی جیهانی ئیسلام.

هێندێك لە كوردەكانی ئەو ناوچەیە لە چوارچێوەی زنجیرەیەكی نیوەسەربەخۆدا بە ناوی بەنی مەڕوان بۆ ماوەی چەندین ساڵ جڵەوی فەرمانڕەوایی بەشێكی جەزیرەیان بە دەستەوە بوو وئەوانی تریش هەرچەند لە ژێر ركێفی دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی ناوچەیی وەك بەنی عوقەیل[٨] دابوون، نێوە نێوە شمشێریان لە كالان دەردەهێناو شۆرشیان هەڵدەگیرساندو دسەڵاتی حاشاهەڵنەگری خۆیان نیشانی فەرمانڕەوا دەسەڵاتدارەكانیان دەدا.

لە سەرەتاكانی سەدەی پێنجەمی كۆچیی دا هێرشی بەرینی غۆزەكان بۆ سەر ناوچەكە بارودۆخی هەرێمەكەی زیاتر شڵەژاندو كوردەكان یەكێك لەو چەند هێزانە بوون - ئەگەر نەڵێین تاكەهێزبوون- كە بە توندیی بە گژ هێرشبەران داچوونەوەو بەربەرەكانییەكی توندیان كرد.

---

[8] (لە تیرەی گەورەی عامری كوری سەعسەعە بوون كە تیرەیەكی عەرەب بوون و لە ساڵی ٣٨٧ كۆچیی دوا بە دوای كۆتاییعاتنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا حەمدانییەكان بە دەستی موسەییەب عوقەیلیی, دەستیان بە سەر شاری موسڵ داگرت.) دەوڵەتی عوقەیلیی لە سەردەمی موسلیمی كوڕی قورەیش دا دەسەڵاتێكی فرە فراوانی پەیدا كرد, بەڵام بە هۆی ئۆگریی و نزیكییان لە مەزهەبی شیعە, كەوتنە بەرامبەر هێزی زۆرو زەوەندی سەلجوقییە سوننی مەزهەبەكان ودوای ئەوە كە زۆربەی قەڵەمڕەوەكەیان كەوتە ژێر دەستی میرە توركەكان, گەڕانەوە شوێنەكانی پێشووی خۆیان لە رۆژهەڵاتی عەرەبستان. (سلسلەهای اسلامی جدید ١٨٥-١٨٧).

بەڵام سەرەنجام لە بەرامبەر لافاوی گوشاری تیرەیەکی غۆزەکان کە دواتر بە سەلجووقی ناودێر کران، بەچۆك داهاتن و پێیان نایە قۆناغێکی تری مێژوو کە نووسەر لەم توێژینەوەدا هەوڵی داوە بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەگەلی رەسەن و توێژینەوەکانی ترو تیشکێکی رووناکیدەری بخاتە سەرو بە هۆی بەدواداچوونی رەوتی ئەو قۆناغە مێژووییە، هەوڵی ئاشکراکردن و روونکردنەوەی لایەنە شاراوەکانی ئەوبڕگە مێژووییە بدات.

دیارە بنیاتنانەوەی مێژووی کورد دژوارییی و ناهەمواریی تایبەت بەخۆی هەیە. چونکە ئەوە کارێکە پێویستی بە گەڕان و پشکنینی چەند سەرچاوەیەك هەیە کە نە لە پێناو ئەو گەلەو نە سەبارەت بە مێژووەکەی نووسراون و خۆی لە حاند بەشێکی گەورەی رابردووی ئەو گەلە گێل کردووەو تەنیا لە گوڕەپانەکانی شەڕو پێکداداندا بە سیلەی چاو ئاماژەیەکی بۆ دەکاو ئەم بۆشاییە گەورە کەسی توێژەر تووشی لێشاوی بەرینی راپۆرتی پچڕپچڕو جاروبارە دژبەیەکیش دەکا کەزۆر دژوارە لە نێو جەرگەی ئەو زانیاریی و راپۆرتە ناتەواوانەوە پێ و شوێنی رەوتی ئەو مێژووە بگری و درێژە بە لێکۆڵینەوەی مێژوو بدەین لەو بوارەدا.

نووسەر بە مەبەستی نەهێشتنی ئەو کەموکوڕییەو تەخت کردنی ئەو کۆسپەو بەرینترکردنی بازنەی بابەتەکە، سەرەتا پەرتەوازە یی باری جوگرافیی کوردەکانی روون کردەوەو دواتر دەستەو تیرە جیاوازەکانی هاوێر کرد. ئەوجار لە درێژەی کارەکەی دا لە سەر بنەمای سێ وتەی گرینگی ژینگەو ناوی هۆزو تیرەکان و ئەو راپۆرت و زانیارییانەی پێوەندییان بە کوردەکانەوە هەیە، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی کەرەسەی خاوی توێژینەوەکەو پاشان بە پوختەو پاڵاوتەو هاوێرکردنی دەسکەوتەکانی و پشت بەستن بە سەرچاوە رەسەن و

پێشکەوتووەکان، درێژەی بە کارەکەی دا. ناشێ چاوپۆشی لەو خاڵە گرینگەبکەین و بە سەریدا باز بدەین کە مەبەستی سەرەکی ئەم نووسینە، بەرجەستەکردن و زەقکردنەوەی ڕۆڵی ئەو کوردە ژێردەست و چەوساوەو بێحکومەتانەیە کە تا ئەمڕۆش شیتەڵکارانی بواری مێژوو خۆیان لێ گێل کردووە. لە سەر ئەم بناغەیە خودی صلاح الدین و ئەییوبییەکانی تریش کە نووسەر چاوی تێبڕیون و چەند دێڕێکی لە بارەوە نووسیون لە بەر ئەوە نییە کە کورد بوون، بەڵکو بە هۆی پێوندییان لەگەڵ کوردەکانی ترو هێندێك ناوچەی کوردنشینی دیکە باسی کردوون و ئەگەر لە مەودای باس و توێژینەوەکەدا ئاماژەیەکی بە مێژووی خەڵکێکی تری وەك سەلجووقیی و ئەییوبی و زەنگییەکان کردووە، مەبەستی تەواوکردنی پەڕتووکی مێژووی کوردە لەبیرکراوەکان بووە بە رووپەڕێك لەباسی ئەوان، نەك خودی ئەوتیرەو هۆزانە.

بەراستی جێگەی داخ و پەژارەیە کە هەر بە هۆی (حکومەت نەویستیی) وەك نەتەوەیەك و لایەنگریی مێژوونووسانی پێشوو لە نووسینەوەی مێژووی کۆنی خەلیفەو سوڵتان و فەرمانڕەوا هەرێمایەتییەکان داو کەمتەرخەمیی مێژوونووسە موسڵمانەکان لە حاند بابەت و ووتە کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگییەکان، لەریزی ئەوان دا کەموکورتی بەرچاوی مێژووی کوردەکان، ژیانە کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگییەکەیانی زیاتر لە ژیانی سیاسی یان، لە ژێرپەردەی رەشی مێژوودا حەشار داوە. هەر لە ژێر شەبەقی ئەو راستییانەدا چۆنییەتیی ژیانی کۆمەڵایەتیی و بەشی سەرەکیی و گەورەی ژیانی فەرهەنگیی ئەو کوردانە لە لایەن مێژوونووسانەوە لەبیر کراوەوگرینگیی پێنەدراوەو تەنیا بە چەند ئاماژەیەکی کەم لەم بوارەدا وازیان هێناوەو بەم جۆرە بەشێکی گرینگی

مێژووی فەرهەنگیی و کۆمەڵایەتیی ئەو گەلە لەژێر داروپەردووی کاولەوێرانەی مێژوودا، نێژراوە.

لە ژێر رۆشنایی ئەو چەند دێڕەی سەرەوەدا، ئەم توێژینەوە لە پێشەکییەك و دوو بەش پێکهاتووە (بەشییەکەم لە پێنج بەندو بەشی دووهەم یەك بڕگەیە). بەندییەکەم باسی قەڵەمڕەوی جوگرافیی کوردەکان دەکاو بەندی دووهەم توێژینەوەیە لە مێژووەکەیان لە سەردەمی دەسەڵاتی سەلجووقییەکان داو بەربەرەکانیی دەوڵەتی کوردی بەنی مەڕوان دژی سەلجووقییەکان و رووخان و تێکشکانیان لە سەردەمی مەلیك شای سەلجووقی دا، بە گرینگترین دێڕەکانی ئەم بڕگەیە دێنە ژمار. بەندی سێهەم تەرخان کراوە بۆ باسی پێکهاتنی ئەتابەکانی زەنگیی و رووبەڕووبوونەوەی ئەوان - بە تایبەت زەنگییەکەم- دژی کوردەکان. پەرەسەندنی چالاکی کوردەکان بۆدەرەوەی جەزیرەو چوونیان بۆ ناو شام و میسرو بە دەستەوەگرتنی جڵەوی دەسەڵات لەو ناوچانەدا، بەشێکە لە باس و خواسەکانی ئەم بڕگەیە. بەندی چوارەم باسی رۆڵی کوردەکان لە دەوڵەتی ئەییوبییەکان دا دەکات. بەشداریی کوردەکان لە شەڕ دژی خاچهەڵگرەکان دا چەند خاڵ و بابەتێکی گرینگ و هەستیاری ئەم بڕگەیەو سەرەنجام لە بەندی پێنجەم دا بە درێژیی باسی هێرشی خوارەزمشاهیی و مەغۆلەکان بۆسەر هەرێمی جەزیرەو بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشە لە لایەن کوردەکانەوە کراوە کە ئەو هێرشە بە داگیرکردنی هەولێر هەر لەو ساڵەدا کە بەغدا شکستی هێنا (٦٥٦)ی کۆچیی مانگیی، کۆتایی پیٚ هات.

بەشی دووهەمی ئەم توێژینەوەیە باسی بارودۆخی فەرهەنگیی کوردەکانی ناوچەی جەزیرە دەکاو بەلەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانەی ئاماژەیان بۆ کراو بە پەیڕە ویی لە وتەی بە نرخی مەولانای رۆمیی کە پێی وایە (مرۆڤ تەنیا بیرو

ئەندێشەیە)، هەوڵ دراوە بە گوێرەی دەرفەت و توانا باسی رۆڵی ئەو کوردانە بکرێ لە خێراترکردنی هەڵچوونی شەپۆلەکانی بیری ئیسلامیی دا، کە لە چوارچێوەی ناوەندە فەرهەنگییە ناوچەییەکانی هەرێمی جەزیرەدا، ئەو ئەرکە گرینگەیان ئەنجام داوە.

کوردەکان وەك یەکێك لە نەتەوە دێرینەکانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە پێچەوانەی هێندێك دەنگۆ[٩] لە بەرامبەر هێرشی عەرەبە موسڵمانەکاندا سەنگەری بەربەرەکانییان گرت و ناوچە کوردنشینەکان کە زۆربەی زۆری لەنێو جەرگەی چیاو دۆڵەکان دابوو و تێپەڕین بەو هەرێمەدا زۆر دژوار بوو، یەکێك لەو شوێنانە بوو کە زۆربە دژواریی کەوتە ژێر دەستی سوپای موسڵمانان و دوابەدوای نەمانی لەمپەرو پەردەکان و لێك جیابوونەوەو روونبوونەوەی دوو چەمك و وتەی (شارەزایی)و (گومڕایی)، کوردەکانیش کە شارەزایی و زانیارییەکی ئەوتۆیان دەستەبەر کردبوو کە جیاوازیی نێوان ئەم دوو چەمکەیان بۆ ئاشکرا ببێ،– هەوڵ وتێکۆشانی سوپای موسڵمانانیش تەنیا بریتی بوو لە دابین کردن و رێخۆشکردن و زەمینە رەخساندن بۆ هاوێرکردنی ئەم دوو

[9] (نووسەر لە سەر ئەو باوەڕەیە کە میکانیزمی گۆڕینی روانگەو ئەخلاقی مرۆڤەکان و فەرهەنگ و داب و نەریتی کۆمەڵگایەك, ئاکام و دواهاتێکی ئەوەندە ئاڵۆزە کە ناشێ چاوەڕوان بین کوت و پڕو لە ساتێك دا روو بدا. باشتر وایە بە بێ چاویلکەی ئیدئۆلۆژیی بابەتەکان هەر بەو شێوەیە کە هەن و شیاوی بوونن, راڤە و شیکار بکەین. حسن محمود حەمەکەریم یەکێ لەو کەسانەیە هەرچەند ئاماژەی بە هێندێك دژکردەوەو بەربەرەکانیی و خۆڕاگریی کوردەکان کردووە لە هێندێك قۆناغ دا , بەڵام لە روانگەیەکی ئیدئۆلۆژیکی یەوە سەیری بەرەبەیانی مێژووی ئیسلامی کردووەو حاشا لەو راستییە دەکا کە کوردەکان بەربەرەکانییەکی بەرچاویان کردبێ لە بەرامبەر لەشکری موسڵمانان دا و بانگەشەی ئەوە دەکا کە هەر بە هاتنی پێشقەرەوڵی سوپای ئیسلام, بۆ ناوچە کوردنشینەکان, کوردەکان ئامێزیان بۆ کردوونەوەو بە بێ بەربەرەکانییەکی ئەوتۆ کە شایانی باس بێ, پێشوازییان لێ کردوون.) (کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامیی دا).

چەمکە- بە سەربەستیی و بە ویستی خۆیان، هێندێکیان باوەڕیان بەم ئایینە نوێیە هێناو بەشێکیان لە سەر دینی پێشووی خۆیان مانەوەو ئەمڕۆش وێڕای ئەوە کە شوێنکەوتووی دینەکانی تریش لە نێو ئەو گەلەدا هەن، زۆربەی پێکهاتەی حەشیمەتەکەیان موسڵمانە.

بە گەیشتنی ئیسلام بۆ نێو کوردەکان، ئەوانیش وەك خەڵکانی تر فرە رەنگیی وبیرو رای جیاوازو لایەنگریی لەمولەو لە نێوانیاندا سەری هەڵداو هەر لەو کاتەدا کە کەسانێك پاڵپشتیی خەلافەتیان دەکرد، بەشێك لە خەڵك چوونە ریزی خەواریجەکانەوەو هێندێکی تر چوونە پاڵ بزووتنەوەی شعوبییەو کۆمەڵێك لە کوردەکانیش هاتنە گۆڕەپانی ململانێی بیرو ئەندێشەو لە مەیدانی شارستانییەتی ئیسلامیی دابەشدارییان کردو بوونە شاسواری ئەو گۆڕەپانەو سەرتۆپی نێودارانی ئەو مەیدانەو نەوەیەکی چاکسازو چاکەخواز (باقیات صالحات)ی پڕبایەخی ئەوتۆیان لە دوای خۆیان بەجێهێشت بۆ خزمەتی ئەم دینەو بەم کارە بەهادارەیان نێو و نێوبانگێکی چاکیان لە مەڕخۆیان لە دڵی جەماوەردا رواند. بەڵام هەر وەك "بێرناردلۆئیس" سەبارەت بە مێژووی ئێران پێداگریی لە سەر ئەو راستییە دەکا، کوردەکان وێڕای ئیسلام ویستیی و چوونەڕیزی موسڵمانانەوە، دە ستیان لە زمانی خۆیان بەرنەداو داب و نەریت و رێوشوێنی نەتەوەیی و فەرهەنگیی خۆیان وەلانەناو بەشێك لە کلتوورو داب و نەریتەکانیان کە ڕەگی لە مێژووی پێش ئیسلامدا داکوتاوەو بەرەبەرە لەگەڵ کوردەکان قۆناغەکانی مێژوویان بڕیوەو بە وتەی گەورەپیاوێك: (ئەو فەرهەنگ و داب و نەریتە هەم پاڵپشتیان بووەو هەم پشتیوانییان لێ کردووە) و بە پێچەوانەی چەند کۆمەڵگەیەکی وەك قیبتییەکانی میسر کە بە گەیشتنی شارستانییەتی ئیسلامیی بە تەواویی ئاوێتە بوون و دە ستیان لە زمان و ئایین

و ڕێوشوێنی تایبەتیی خۆیان هەلگرت، ئێستاش چەندین ڕەمزو نیشانەی زیندوو و درێژماوە کە پێوەندییان بە مێژووی بەر لە ئیسلامەوە هەیە، لە نێو کوردو فەرهەنگ و کەلەپوورەکەیان دا دەکەوێتە بەرچاو و دوای تێپەڕینی هەزاران سەدە ئێستاش هێندێکیان ناوی دیاکۆ– کە یەکێکە لە پاشاکانی ماد– بۆ منداڵەکانیان دیاری دەکەن و زمانی کوردی بە ئاوازو دەوڵەمەندیی تایبەتی خۆیەوە هەروا لە کەف و کوڵ و گەشەسەندن دایە. ئەم ڕەوتە بەراشکاویی ئەو ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە: سەرەڕای نیشتەجێبوون و هەڵکەوتوویی جوگرافیایی کوردەکان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست داو لە چەقی چوارڕێیانی پێوە ند یدانی جیهان–کە بۆتە هۆی ئەوە چەندین جار بکەونە بەر لافاوی هێرشی لەشکری نەتەوەکانی تری وەك عەرەب و تورك و مەغۆلەکان و ...– ئەو کوردانە دەستیان لە ڕەسەنایەتیی نەتەوە یی خۆیان هەڵنەگرتووەو هەموو جارێ قەقنەس ئاسا لە نێو ناخی خۆڵەمێشی خۆیان سەریان هەڵداوەتەوە.

لە سەر ئەم بنەمایە خاوەنی ئەم پێنووسە کە پێشتر ئەم نووسین و بەرهەمەی وەك ماستەرنامەی پسپۆڕیی باڵای خۆی نووسیوە، بە هێندێك دە سکاریی وگۆڕانەوە لە ژێر ناوی (مێژووی کوردەکانی جەزیرە لە ٤٤٧– ٦٥٦)ی ك.م، کاڵای چاپی بە باڵا بڕی و ئاراستەی کۆمەڵەی فەرهەنگیی وڵاتی کرد. پێویستە ئاماژە بەو ڕاستییەش بکەین کە چاپ کردنی توێژینەوەیەکی ئەکادیمیی وەك ماستەرنامە لە دووتوێی کتێبێك دا، پێویستی بە لابردنی هێندێك بەشی لێکۆڵینەوەکە هەیە. وەك شێوازی لێکۆڵینەوەو شیمانەو گریمانەکانی ئەو توێژینەوەیە. هەرچەندە ئەو بەشانە پایەی سەرەکی هەر توێژینەوەیەکی ئەکادیمی بن، لەڕوانگەی خوێنەری ئاسایی گرینگییەکی ئەوتۆیان نییە. بەڵام نووسەر بە لە بەرچاوگرتنی تێڕوانینی بەراوردو ڕەخنەگرانە لە هەردوو بەشی

(پێشەکی توێژینەوە) و (پێداچوونەوەی سەرچاوەکان) و بە هیوای بەردەوامیی ئەم رەوتە رەخنەگرانە لە لایەن شیتەڵکارانی بواری مێژوو، بڵاوکردنەوەی ئەوبەرهەمەی لە دوو توێی ئەم پەڕتووکەی بە ردەستتان دا بە کارێکی بەکەڵك زانی.

خاوەنی ئەم نووسینە وێڕای هەوڵێکی بێوچان و تێکۆشانێکی فراوان بۆ گەیشتن بە وردبینی بەرادەی پێویست و شیاوی بابەتێکی گرینگی لەم چەشنە، بە کارێکی بێ کەموکورتی دانانێ و بەرهەمی کارەکەی بە گوێرەی توانای نووسەرە نەك بە پێی حەزو ویستەکەی و ئەگەر خوێنەری ئەم دێڕانە بە خوێندنەوەی ئەم بابەتە مێژووییە ئاوڕێك لە مێژوو و رەوتی ئاڵوگۆڕەکان بداتەوەو شارەزاییەك سەبارەت بە گەورەو نێودارانی ئەوقۆناغە مێژووییە دەستەبەر بکا، لە خۆشیان سەر لەتاقی ئاسمان دەداو رێزو سوپاس و پێزانینی خۆی ئاراستەی ئەو خوێنەرە وردبینانە دەکا کە بە چاوی رەخنەوە لەویەرهەمە بڕوانن و هەڵسەنگاندن و رەخنەکانیان لە رێگای ناوەندی بڵاوکردنەوەوە رووبەڕووی نووسەر بکەنەوە، سەرکەوتن و بەختیاری هەمووان لە خوای گەورە دەخوازێ.

ئومێد بەهرامی نیا

تاران پووشپەڕی ١٣٨٥ ی ك.خ

## بەر لە توێژینەوە

تا ئەو جێیەی نووسەر لەپێناوی توێژینەوەکەی دا خەریکی گەڕان و پشکنینی کون و کەلەبەرەکانی مێژوو بووە، دەرکەوت کە تا ئێستا هیچ توێژینەوەیەکی سەربەخۆ لەم بوارەدا ئەنجام نەدراوە. بەڵام دەکرێ سەبارەت بە چەند بەشێك لە بڕگە جیاوازەکانی ئەو بوارە ئاماژە بەو چەند خاڵەی خوارە وە بکەین:

**١- خوێندنەوە و توێژینەوەی رۆژهەڵاتناسان**

دیارە یەکەمین توێژینەوە کە لە مەڕ کوردانەوە ئەنجام دراوە، وتارێکە لە ژێر ناوی (زنجیرەی مەڕوانییەکان لە میافارقین لەسەدەی دەیەم و یازدەهەمی زایینی دا) کە "هـ.ف ئامدرۆز"[١٠] لە ساڵی ١٩٠٢ی زایینی لەگۆڤاری (ئەنجومەنی سەڵتەنەتی ئاسیایی) دا بڵاوی کردۆتەوە، کە بە داخەوە هەوڵەکانی نووسەر بۆ دەستەبەرکردنی ئەو وتارە بە ئاکام نەگەیشت.

لەنێو ئەو رۆژهەڵاتناسانەدا کە خۆیان لە قەرەی ئەو باس و توێژینەوە داوە، "ڤیلادیمیر مینۆرسکی"[11] دیارترین کەس و سەرتۆپی هەمووانە. بەشی مێژووی سەرەتای هەگبەی زانیارییەکانی ئیسلام (دائرە المعارف ئیسلام) (کوردەکان، کوردستان) کە "مینۆرسکی" نووسیویەتی، گرینگترینی ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە تا ئێستا سەبارەت بە گەلی کورد ئەنجام دراون. نووسەر بە پشت بەستن بە سەرچاوە رە سەن و متمانە پێکراوەکانی هەر قۆناغێك، کورتەمێژوویەکی بەکەڵکی کوردەکانی تا سەردەمی قۆناغی مێژوی خۆیان ئامادە کردووە. ئەم وتارە سەرچاوەیەکی سەرەکییە بۆ ئەو کەسانەی کە دوای

---

[10] amedroz. H.F. “Marwanid dynasty at Mayyafariqin in the tenth and eleventh centuries A.D” jras, 1902

[11] Minorsky. V, “Kurds, Kurdistan” EI2 (Encyclopedia of Islam), New Edition, E..I. Brell, V V, pp.447-464

ئەوخەریکی توێژینەوە بوون سەبارەت بە کوردەکان. "هەموو" لە کتێبەکەی خۆی دا(چەند لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بەمێژووی قەفقاز).[١٢]
وێڕای توێژینەوە لە مەڕ بنەماڵە دەسەڵاتخوازەکانی وەك شەددادیەکان[١٣] و ڕەوادییەکان[١٤] و...، ڕوونکردنەوەیەکی سەبارەت بەو کوردە ژێردە ستانەی کە بە تایبەتی لە سەردەمی دەوڵەتی ئەییوبییەکان دا ناویان درەوشایەوە، پێشکەش کردووە. ئەم هەنگاوە بە هۆی ئەوە کە شکاندنی سنووری نەریتی باوی ئەو بوارە بوو و گۆشەنیگایەکی خستبۆسەر کوردە حکومەت نەویستەکان، گرینگیی تایبەتی خۆی هەیەو چەند هەڵەیەکی وەك ئەوە کە

---

12 وەرگێڕانی بۆ فارسی محسن خادم, تاران: بنیاد دائرەالمعارف بزگ اسلامی, ١٣٧٥ کۆچیی هەتاویی.

13 زنجیرەیەکی تری کوردەکانە کە لە سەردەمی دەیلەمییەکان لە باکووری ڕۆژئاوای ئێران سەریان هەڵدا . بە مەبەستی مانەوەیان لە چوارچێوەی سنووری جوگرافیای سیاسی نێوان دەیلەمییەکان لە ئازەربایجان لە لایەکەوەو گورجستانی یە مەسیحییەکان لە لایەکی ترەوە, ناوەکانیان بکەنە دەیلەمیی و گورجیی و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوە کە هێندیك توێژەری وەك "مارکۆئارت" گومانیان لە کوردبوونیان هەبێ. گەنجە پێتەختی تیرەی ڕەسەنی شەددادییەکان بوو و لە ساڵی ٤٨٥ ك.م دا کاتێك "فەزلوون"ی سێهەمی شەددادیی ناچاربوو لە بەردەم سەلجووقییەکان بەچۆکدابێت, دەسبەجێ تیەرەیەکی تری ئەو کوردانە لە ساڵی ٤٦٥ ك. م دا دەسەڵاتیان پێدرا کە وێڕای چەندین کەوتن و هەستانەوە, تا نیوەی دووهەمی سەدەی شەشەم درێژەیان هەبوو.) ((سلسلەهای اسلامی جدید))

14 ( بە هۆی ئەوە کە ناوی ئەو بنەماڵە لە گەڵ بنەماڵەیەکی عەرەب هاوناوە, زۆربەی توێژەران بە هەڵەداچوون و ئەم بنەماڵە کورد یان بە عەرەب زانیوە, لە کاتێکدا —هەروەك ئەحمەد کەسرەویی باسی کر د و ئەو هەڵەی ڕاست کردەوە- خاڵی جیاوازی نێوان ئەو دوو بنەماڵە لەوەدایە کە "ڕەوادییە" کوردەکان پیتی (واو) لە ناوەکەیاندا شەددەی لە سەر نیەو بەڵام شەددە لە سەر پیتی (واو) لە ناوی ڕەوادییە عەرەبەکان هەیە —هەروەك ناوە عەرەبییەکانی تریش —لە سەر کێشی (فعّال) و واوەکەیان بە شەددەوە دەخوێندرێتەوە. ئەم کوردە ڕەوادییانە خێڵێکی گەورەی کورد بوون کە لە شنۆ و دەوروبەری دەژیان.) ((ناشرکتاب: کسروی))

"**ابو الهيجاء السمين**" ی وەك فەرمانڕەوای میسری سەروو ناساندووە، زیان بە گرینگیی و بایەخی ئەم کارە ناگەیەنێ.

پێنج ساڵ دوای بڵاوبوونەوەی وتارەکەی "مینۆرسکی" هەر لەو (دائرە المعارفە)دا، "کارول هیلینبراند"[15] وتارێکی لە ژێر سەردێڕی (مەڕوانییەکان) نووسی و جارێکی تریش ناو و دەنگی ئەو بنەماڵە کوردەی لە لێکۆڵینەوە مێژوویییەکان دا زەق کردەوە. ناوبراو لەو وتارەدا لە سەر بنەمای وتەکانی ئیبنوجەوزی لە ٥٩٧ ی کۆچی مانگی دا بە پێی قسەکانی ئیبنوئەسیر لە ٦٣٠ کۆچی مانگی دا، باس لەوە دەکات کە "سەعید بن نەسروددەولە" فەرمانڕەوای ئامەد لە ساڵی ٤٤٥ی کۆچی مانگی دا، کۆچی دوایی کردووە، لە کاتێکدا بە پێی قسەکانی ئیبنوئەزرەق کەمێژوونووسێکی خەڵکی دیاربەکرە، دوای ساڵی ٥٧٧ ك.م، سەعید بن نەسروددەولە ساڵەکانی دوای ئەو مێژووەش هەر لە ژیان دابووەو دوای چەندین ململانێ و گێرەوکێشە لەگەڵ نیزامەددین نەسری برای، سەرەنجام بە دەستی ئەو برایەی کوژرا.

**٢- توێژینەوەو خوێندنەوەی کوردەکان**

کۆنترین و گرینگترین کتێب کە لەلایەن کوردەکانەوە سەبارەت بەمێژووی کورد نووسراوە، کتێبی شەرەفنامەی میر شەرەفخان بدلیسی[16] یە کە لە ساڵی ١٠٠٥ ك.م نووسینەکەی تەواو بووە.ئەم کتێبە یەکێك لە سەرچاوە گرینگ و سەرەکییەکانی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەیە کە خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد بوون و تا ئێستاش گرینگیی و بایەخی خۆی هەر هەیەو چەندین جارو بە چەندین زمانی ئورووپایی تەرجەمە کراوە. دانەر لەو کتێبەدا هەوڵی داوە چاوێك

---

[15] Hillenbrand, carole, "Marwanids", EI2, New Edition, E.J. brll, 1991, V. VT, pp. 626-627

[16] بە هەوڵ و گرینگیی پێدانی ڤیلادیمیر ویلیامینۆف, تاران: اساطیر , ١٣٧٢ ك.ه.

بە مێژووی کوردەکان دابخشێنێ و کورتەیەك لە مێژووی ئەوان تا سەردەمی خۆی بە خوێنەر بناسێنێ و بە گوێرەی پێویستی لێکۆڵینەوەکە بە کورتی و بە شێوەیەکی سوودبەخش باسی هەر قۆناغێك لە مێژووی کوردەکان و زنجیرەی ئەو کوردانەی کە بنیاتنەری ئەو قۆناغە بوون، بکات. هەوڵ و ماندووبوون و کارە پڕبایەخەکەی شەرەفخان لە لایەن کوردەکانیترەوە پێشوازیی لێنەکراو دوای تێپەڕینی سێ سەدە ئەوجار موحەممەدئەمین زەکی بەگ لەو بوارەدا کەوتە خۆ و چەند هەوڵێکی دا. ئەو نووسەرە لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (**خلاصة تاريخ الكرد والكردستان من اقدم العصور التارخية حتي الان**)[17] تێکۆشاوە راڤەو روونکردنەوەیەکی گشتگیرو بەکەڵکتر لە مەڕ مێژووی کوردەکان تا سەردەمی خۆی پێشکەش بکات. کتێبەکەی تری ئەو نووسەرە کە لە ژێر ناوی (**تاريخ الدول والامارات الكردية فى العهدالاسلامى**)[18] دا چاپ و بڵاو کراوەتەوە هەرچەند بازنەی باسەکانی بەرتەسکترە لە کتێبەکەی دیکەی، بە هۆی ئەوە کە زۆرتر پشتی بە کوردەکان بەستووەو بەدواداچوونی رەوتی مێژووی ئەوانی لە مەودای قۆناغە جیاوازەکانی ئیسلام دا مەبەست بووە، لە روانگەی نووسەرەوە گرینگییەکی زیاتری هەیە. شیاوی باسە کە ئەم دوو بەرهەمە سەرەتا بە زمانی کوردی نووسراون و نووسەری ئەم دێڕانە هەوڵی زۆری دا بە مەبەستی دەستەبەرکردنی ئەو کتێبانەو خوێندنەوەو بەدواداچوونی بەرهەمی توێژەرە کوردەکانی کوردستانی عێراق، گەشتێك بۆ کوردستان بکات کە بە داخەوە بە هۆی باری نالەباری سیاسی ئەو وڵاتەو نەبوونی هاوکاریی و پاڵپشتیی بەرپرسانی زانکۆی تاران، نەیتوانی گەشتەکەی بکات.

---

17 عربە محمد علی عەونی, میسر:مطبعةالسعادة, ١٩٣٩ زاییني

18 عربە محمد علی عەونی, بی جا: ١٣٦٢ کۆچیی مانگیی

کتێبێکی تر کە لەم بوارەدا شیاوی ئاماژە بۆکردنە، کتێبی (**کرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او**) واتە(کوردو پێوەندییە رەگەزیی و مێژووییەکانی) نووسینی غولام رەزا رەشید یاسمی[١٩] مامۆستای کۆچکردووی زانکۆی تارانە. دانەر وێڕای توێژینەوە سەبارت بەرەگەزی کوردو هەڵسەنگاندن و بەراوردی بیروڕا جیاوازەکان لە پێوەندی لەگەڵ ئەم باسەدا، کورتەمێژوویەکی ئەو گەلەشی باس کردووەو وەك دیارە لە زۆربەی باسەکەی دا پەنای بردۆتە بەر بەرهەمەکانی "مینۆرسکی" و خاڵێکی نوێی بە قەڵەمی خۆی لەوبارەوە باس نەکردووە. کتێبەکانی (**تاریخ مشاهیر کرد**)[٢٠] نووسینی بابا مەردووخی رووحانی و (**زانایانی کورد لە خزمەت دین و زانست دا**)[٢١] نووسینی عبدالکریم مدرس هەرچەند زۆرتر باسی ژیاننامەی ئەو گەورەپیاوانە دەکا کە لە چەند سەرچاوەیەکی وەك (**وفیات الاعیان، طبقات الشافعیة و... دا باس کراون**، بە هۆی خستنەڕووی پێشینەی ژیانی بنەماڵەکان و زانا بەنێوبانگەکان لە باسەکەدا، لەو نووسینانەش کەڵك وەرگیرا.

**٣- خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لە لایەن عەرەبەکانەوە**

بە هۆی ئەوە کە ئەم نووسینە بابەتی عەرەبەکان نییە، مێژووی نەتەوەکانی تر بە تایبەتی مێژووی کورد بە لای ئەوانەوە گرینگییەکی ئەوتۆی نییەو بەو جیهانبینییە تایبەتەی کە خۆیان هەیانە زۆرتر حەز بەوە دەکەن کە دەسکەوتی نەتەوەکانی تریش بە شارستانییەتی عەرەبەوە بلکێنن! دوکتور سەعید عبدالفتاح عاشوور لە پێشەکی بەرگی چوارەمی کتێبەکەی (**مفرج**

[19] وەرگێڕانی بۆ فارسی, احمد حواری نسب, تاران:اطلاعات, ١٣٦٤ك.ه.

[20] تاران: سروش, ١٣٧١ ك,ه.

[21] تاران: مجمع ناشر کتاب, بی تا

**الكروب في اخبار بني ايوب**) دا کە بە دەسکاریی و پیداچوونەوەی قوتابییەکەی حەسەنەین محمد رفیع چاپ و بڵاو کراوەتەوە، بەردەوام باسی زیندووکردنەوەی شارستانییەتی عەرەب و پێویستیی هەوڵدان لەو بوارەدا قسە دەکاو بچووکترین ئاماژە بە کوردبوونی ئەو ئەییوبیی یانە ناکا کە بابەتی سەرەکی کتێبەکەن! دکتۆر بەدە وی عەبدوللەتیف عیوەز هەڵەچنی کتێبی (**تاريخ الفارقي**) لەو پێشەکییەدا کە بۆ ئەو کتێبەی نووسیوە، بە بێ ئاماژەکردن بە کوردبوونی دەوڵەتی بەنی مەڕوان- کە تەنانەت خۆیشی بەشێك لە کتێبەکەی بە هۆی باسی ئەوان بە (**الدولە المروانيية**) ناودێر کردووە،- پەسن و دەستخۆشیی نووسەری ئەو کتێبە دەکات بە هۆی ئەوە کە بەرهەمێکی زانستیی نەمری پێشکەشی کتێبخانەی عەرەبی و شارستانییەتی مرۆڤ کردووە! هەڵبەت ئەم قسەیە ئەوە ناگەیەنێ کە ماندوو بوونی ئەوانە لەو هەوڵانەدا کە بەکەڵکی خۆیان دێ، لە بەر چاو نەگیرێ و نووسەر بە بێ هەستکردن بە هیچ چەشنە هەڵچوونێکی دەروونی-کە لە نێو بیرو زەینی مێژوونووسان دا سەر هەڵدەدا-، هەوڵ و تێکۆشانیان لە راستەوپاستە کردنی ئەو کتێبانەدا بە بایەخەوە دەنرخێنێ وبە چاوی رێزەوە سەیری دەکات. چونکە ئەگەر ئەو قەڵەمە بە برشتانە نەبوونایەو ئەو چەشنە هۆکارو پاڵنەرانە لە پشت کاری خاوەنەکانیان نەدەبوو و لەوەندە دەسکەوتە مێژووییەش کە خۆمانی پێوە هەڵدەکێشین، بێبەش دەبووین.

"سوهەیل تەقووش" مێژوونووسی سوریایی لە کتێبەکەی (**دەوڵەتی ئەییوبییەکان**)[٢٢] داباسی ناوی هێندێك لە فەرماندەو گەورەپیاوانی سەلاحەددین دەکاو ئاماژە بە چالاکییەکانیان دەکا بە بێ ئەوەی دان بە

[22] وەرگێڕانی عبدالله ناصر تاهیری, قوم: پژوهشکدە حوزە و دانشگاە, ١٣٨٠ ك.هـ

کوردبوونیان دابنێ. هەڵەی زەق و نەشیاوی ناوبراو لەوەدا دەردەکەوێ کە کاتێك باسی بە وەزارەت گەیشتنی سەلاحەددین ئەییوبی دەکا، چەند فەرماندەیەکی وەك "سەیفەددین مەشتووب هەکاری" و "قوتبەددین یەنال هەزەبانی" بە تورك لە قەڵەم دەدا.

دکتۆر محمد فەتحی شاعیر لە کتێبی (**الاکراد فی عهد عمادالدین زنگی**)[٢٣] دا بە درێژیی باسی سەرکوتکردنی کوردەکان لە لایەن زەنگییەکەمەوە دەکا. گرینگترین کەموکورتی ئەو کتێبە لەوەدایە کە بە پێچەوانەی ناوی کتێبەکە، تەنیا ئاماژە بە بەشێك لە مێژووی کوردەکان لەو برگە مێژووییەدا دەکا کە هەر باسی سەرکوتی ئەوانە بە دەستی زەنگییەکەم و باسی رۆڵی کاریگەرو بەرچاوی "بەهائەددین شارەزووریی" لە بەدەسەڵات گەیاندنی زەنگی و پلەوپێگەی ئەو پیاوەو ئەندامانی تری ئەو بنەماڵە لە حکومەتەکەی دا ناکا.

**لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەکان**

نۆژەنکردنەوەی مێژووی کوردەکانی هەرێمی جەزیرە، پێویستی بە گەڕانەوە هەیە بۆ مێژووی گشتی گەلی کوردو مێژووی ئەو خانەدان و بنەماڵانەی کە بە زنجیرە، فەرمانڕەوای ئەو هەرێمە بوون. ئاشکرایە کە روانگەی گشتگیری مێژووی گشتیی گەلی کوردو سۆزداریی زۆرو گرینگییدانی لە رادەبەدەری مێژوونووسانی سەر بە بنەماڵە ناودارەکان، بە بنەماڵەو رەچەڵەکی خۆیان، زۆربەی مێژووی سیاسی و فەرهەنگیی و بە شەهامەتەوە دەتوانین بڵێین تێکڕای مێژووی کۆمەڵایەتیی ئەو بنەماڵە کوردانەی خستۆتە قوژبنی فەرامۆشییەوەو نووسین و لێکۆڵینەوەی لەو بوارەدا لەگەڵ گەلە گرفتێك رووبەڕوو کردووە.

---

[23] مصر المکتبات الکبری, بی تا .

سەرەڕای گرینگیی هەڵکەوتەی جوگرافیی هەرێمی جەزیرەو هەڵکشان و داکشانەکانی لەو بڕگە مێژووییەدا کە مەبەستی باسەکەیە، بە داخەوە جویَ لە تاقە نووسینێك، هیچ مێژوویەکی تری ناوچەیی سەبارەت بەو هەرێمە نەنووسراوە. گومانی تێدا نییە ئەگەر نووسراوی مێژوویی لەو چەشنە زۆرو زەوەند بان، زانیاریی ئێمە لە مەڕ ئەو ناوچەو دانیشتووەکانی زیاترو چڕو پڕتر دەبوو لەوەی کە ئێستا هەیە. بە سەرنجدانی ئەو چەند خاڵەی باس کرا، لە خوارەوە چەند سەرچاوەیەك دەناسێنین و بەراوردیان دەکەین و هەڵیاندەسەنگێنین کە ئەم نووسینە زۆرتر پشتی بەوان بەستووە:

١– **تاريخ الفارقي**،[24] نووسینی ئیبنو ئەزرەق فاروقی(٥١٠ تا دوای٥٧٧ ك.م) زۆرترین بەشی ئەو کتێبە تەرخان کراوە بۆ باسی دەوڵەتی کوردی بەنی مەڕوان کە نزیکەی سەدەیەك جڵەوی دەسەڵاتی دەڤەری دیاربەکری بە دەستەوە بوو. نووسەر شان بە شانی ئەو باسە، کۆمەڵە زانیارییەکی پڕبایەخی سەبارەت بە باری جوگرافیی هەرێمی دیاربەکر بە تایبەتی میافارقینی پێتەختی بەنی مەڕوان ی خستۆتە بەر دەست.[25] ئەم چەند هۆکارەی خوارەوە گرینگییەکی زیاتریان بە کتێبەکە بەخشیوە:

١– ڕۆڵ و ئەرکی ئیبنوئەزرەق لە زۆربەی ناوە ندە حکومەتییەکان دا– هەروەك باپیری– بایەخ و متمانەیەکی چەندقاتی بە نووسینەکانی بەخشیوە. چونکە لە پلەی کاربەدەستێکی دەوڵەت دا زیاتر ئاگاداری هەواڵ و ڕووداوەکان بووەو چۆنییەتی ڕوودانی ئەو ڕووداوانەی باش زنیوە.

---

[24] بە هەوڵی بدوی عبداللطيف عوض, قاهرة, الهيئة العامّة لشؤن المطابع الاميرية, ٦٣٧ ك.م.

[25] بۆ نموونە نك: لاپەڕەکانی, ٨٦, ١٠٧, ١٠٨, ١٠٤, و لاپەڕەکانی تر.

٢– راپۆرت و لێکۆڵینەوەکانی ناوبراو بە هۆی ئەوە کە بە حەزو ویستی خۆی بووەو لە بەر خاتری هیچ دەسەڵاتدارێك نەنووسراوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو کتێبانەی کە لە پێناوی ئەو مەبەستەدا نووسراون، بایەخ و گرینگیی زیاتریان هەیەو زۆرتر بڕواو متمانەیان پێدکرێ.

هەرچەندە نووسەر هەوڵی داوە لە چوارچێوەی خشتەیەکی کاتیی دا رووداوەکان بە ریز باس بکات، بەڵام هێندێك جار تووشی خلیسکان و لادان دەبێ. لە گێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ٤٥٠ ك.م دا باسی پەنابردنی بنەماڵەی خەلیفە دەکا بۆ میافارقین لە کاتی بەدەستەوەگرتنی جڵەوی دەسەڵات لە بەغدا[٢٦] لە لایەن ئەرسەلان بەساسیری. بەڵام چەند لاپەڕێك دوای ئەو باسە دەگەڕێتەوە دواوەو باسی هێرشی بێ ئاکامی فەرماندەکانی توغرول بەگ دەکات بۆ سەرهەرێمی دیاربەکر لە ساڵی ٤٣٤ ك.م دا.[٢٧]

ئیبنوئەزرەق هێندێك جار لە بازنەی گێڕانەوەی رووداوەکانی دەچێتە دەرو سەبارەت بەو کەسانەی دەستیان لە رووداوەکانداهەیە هەڵسەنگاندن و بەراورد دەکاو قسە لە نرخاندنی کارەکانیان دەکا. لە گەرمەی گەمارۆی گەورەی میافارقین لە لایەن لافاوی لەشکری مەلیکشای سەلجووقی و رەتکردنەوەی پێشنیاری ئاشتیی سوڵتان لە لایەن ناسروددەولەی مەروانی کە بە هۆی پەیامنێرەکەی ئەبووسالم فەرمانڕەوای ئەو شارە نامەی ئاشتی بۆ ناردبوو، سوێند بە گیانی خۆی دەخوا کە ئاکامی سپاردنی دەسەڵاتی راپەڕاندنی

---

[26] لاپەڕەکانی ١٥٣-١٥٤.

[27] ل , ١٦٠

کاروبارەکان بە دەستی کەسێکی وەك ئەبو سالم، جوێ لە تێکشکان و بشێویی ئاکامێکی دیکەی نابێ.[٢٨]

نووسەر وێڕای ئەوە کە زۆر وردبینانە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، هێندێك جار لە باسی ماوەی دەسەلاّت و فەرمانڕەوایی دەسەلاّتداران دا، تووشی هەڵە دە بێ. بۆ نموونە کاتێك باسی مردنی نیزامەددین نەسری مەڕوانیی دەکات، دەڵێ دەسەلاّتەکەی بۆ ماوەی دوازدە ساڵ و چەند مانگێك درێژەی هەبوو.[٢٩] لە کاتێکدا هەر بە گوێرەی نووسینی خۆی و مێژوونووسانی تر، ئەو فەرمانڕەوا مەڕوانییە لە ساڵی ٤٥٣ك.م دا بوو بە جێنشینی باوکی و لە ٤٧٢ ك.م دا، کۆچی دوایی کردو لێرەوە دەردەکەوێ کە بۆ ماوەی زیاتر لە نۆزدە ساڵ جڵەوی فەرمانڕەوایی بە دەستەوە بووە نەك دوازدە ساڵ!

٢- **الفتح القسّی فی فتح القدسی**،[٣٠] نووسینی عیماد کاتب ئیسفەهانی (کۆچکردووی ٥٩٧ ك.م)، ئەم کتێبە ڕووداوە مێژووییەکانی ماوەی شەش ساڵ، واتە لە ڕزگار کردنی قودسەوە لە ساڵی ٥٨٣ ك.م بە دەستی سەلاّحەددین ئەییوبیی تا کۆچی دوایی سەلاّحەددین لە ساڵی ٥٨٩ ك.م دەگرێتە خۆ و سەرچاوەیەکی پڕبایەخییەکێك لە گرینگترین قۆناغەکانی مێژووی سووریاو شەڕی خاچهەڵگرەکانە.[٣١] بە هۆی ئەوە کە نووسەر بۆخۆی لەو شەڕانەدا بەشداریی کردووەو بە چاوی سەر شایەتحاڵی ڕووداوەکان بووەو لە کتێبەکەی خۆیدا باسیان دەکا، زانیاریی فرە بایەخداری سەبارەت بە بەشداریی و ڕۆڵی

[28] ل, ٢١١.

[29] ل, ٢٠٠.

[30] بە کۆششی محمد محمود صبح, بی جا, بی تا.

[31] عالم زادە, ل, ٨٩.

کارای کوردەکان خستۆتە بەر دەست کە لە چەشنی خۆیدا کۆمەڵە زانیارییەکی بێوێنەن و لە **هیچ** نووسینێکی تری مێژوونووسانی ئەو سەردەمەدا ئاوا بە روونیی و راشکاویی باس نەکراون. ئەم بەرهەمە بەبایەخە یەکێك لە سەرەکیترین سەرچاوەکانی نووسەرە لە بەشی مێژووی شەڕی خاچهەڵگرەکانداو زانیارییە پڕبایەخەکانی لە مەڕ شەڕوانە کوردە بەنێوبانگەکانی وەك فەقێ زیائەددین عیسا[٣٢] و سەیفەددین مەشتووب **هە**کاریی[٣٣] و زانیارییە وردو راستەکانی سەبارەت بە بەشداریی کوردەکانی تریش، پایەی پتەوی ئەم بەشەیە.

٣– **الكامل في التاريخ**،[٣٤] نووسینی ئیبنوئەسیر جەزەری (٥٥٥–٦٣٠ ك.م)، دەتوانین بە شەهامەتەوە بڵێین گرینترین و سەرەکی ترین سەرچاوەی زانیارییەکانی ئەم نووسینەو ئەو کتێبە بووە. بە هۆی ئەوە کە دانەری ئەو کتێبە بۆخۆی کورد بووە و زۆربەی تەمەنی خۆی لە هەرێمی جەزیرە تێپەڕاندووە، گرینگیی تایبەتی بە مێژووی ئەو ناوچە داوە. ئەو بەشەی راپۆرت و زانیارییەکانی کە لە مەودای ژیانی خۆیدا روویداوەو بە تایبەتی ئەوانەی بە چاوی خۆی بینیویەتی، بایەخ و متمانە پێکراویی زۆریان هەیە. هەڵبەت ئەوە بەو واتایە نییە کە تێکڕای زانیارییەکانی بە راست بزانین و چەند هەڵەو کەموکوڕییەك لە قسەکانی دا هەیە، کە لە خوارەوە ئاماژە بە گرینگترینەکانیان دەکەین.

---

32 ل, ٣٥٥.

33 ل, ٤٥٦-٤٦٧

34 بە هەوڵی عمر عبدالسلام تدمری, بیروت: دارالکتب العربی, ١٤٢٢ ك.م

کاتێك باسی ئەو ڕووداوە مێژووییە دەکات کە هێندێك لە غۆزەکان هەوڵیان دەدا دەست بە سەر شاری موسڵ دابگرن لە ساڵی ٤٣٤ ك.م داو "قێرواش" فەرمانڕەوای ئەو شارە داوای یارمەتیی و پشتیوانیی لە کوردەکانی ناوچەو دەسەڵاتدارانی دەوروبەر کرد، باسی هاتنی "بوقا" و "ناسغەلی" دەکات کە سەرگەرمی گەمارۆی میافارقین بوون بە هاوکاری غۆزەکان.[٣٥] لە کاتێکدا بە پێی قسەی ئیبنوئەزرەق ئەو دوو کەسە لە کاتی گەمارۆی میافارقین دا بە هۆی سەرخۆشییەکتریان کوشت و سوپاکەشیان لە لایەن نەسروددەولەی مەڕوانی لێکهەڵوەشێنرا.[٣٦] لە شوێنێکی تردا باسی مەرگی سەعید بن نەسروددەولە فەرمانڕەوای شاری ئامەد دەکا لەساڵی ٤٥٥ ك.م دا،[٣٧] لە کاتێکدا ئیبنوئەزرەق – کە مێژوونووسێکی خەڵکی دیاربەکرەو بەشی زۆری کتێبەکەی بۆ ئەوان تەرخان کردووەو هەر ئەوەش بۆتە هۆی دڵنیایی لەو زانیارییانە کە سەبارەت بەو بنەماڵە باسی کردوون و بەڵگەکانی لە نووسینی ئیبنوئەسیر بە هێزترین– بە درێژیی باسی کارو چالاکییەکانی سەعید دەکا لە ساڵانی دوای ئەو مێژووە دا.[٣٨]

ئەو خاڵە کە (ئیبنوئەسیر ڕاستەوخۆ و یەکجێ باسی کورتەی ڕووداوێك دەکا، کەموکورتیی گێڕانەوەی ڕووداوەکان بە پێی خشتەی ساڵژمێرانە کە دەبێتە هۆی پچڕپچڕی باسەکە، دەگەیەنێتە نزمترین ئاست)،[٣٩] بە تەواویی و بە شێوەیەکی ڕەها سەبارەت بە ئیبنوئەسیر دروست نییەو هێندێك جار بە هۆی

---

35 ٧/ ٧٢٥.

36 تاريخ الفارقى, ١٦٠-١٦١.

37 ١٨٧/٨.

38 بۆ نموونە(نك: تاريخ الفارقى, ١٨٦-١٨٨).

39 عالم زادە ١٢٢.

گواستنەوەی بەشێك لە رووداوێك بۆ شوێنێکی ترو دەرفەتێکی دیکە، هەرخۆی درێژە بەو کەموکورتی یانە دەدات! بۆ نموونە باسی تێکشکانی عیمادەددین زەنگییەکەم دەکا لە بەرامبەر هێرشی خەلیفەی عەبباسی لە ساڵی ٥٢٦ ك.م دا،[٤٠] بەڵام درێژەی ئەو رووداوە گرینگە کە بریتییە لە هاناهێنانی ناوبراو بۆ لای نەجمەددین ئەییوبیی کورد لە ساڵی ٥٦٤ ك.م داو لە کاتی باسی مردنی ئەسەدەددین شێرکۆو توێژینەوە سەبارەت بە هاتنی ئەییوبییەکان بۆ سەر گۆڕەپانی کایەی سیاسی، تەواو دەکات.[٤١] لە هێندێك جێی ئەو کتێبەدا بە هۆی هەڵەکانییەوە زیاتر سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ.، لە شوێنێك دا باسی گرتنی قەڵای جەلاب دەکا بە دەستی زەنگی و دروست کردنی قەڵای عیمادییە لە شوێنی ئەو قەڵایەو[٤٢] چەند لاپەڕە دوای ئەو باسە بەبێ ئاماژەکردن بە قسەکانی پێشووی خۆی، زانارییەکانی پووچەڵ دەکاتەوەو باسی دروستکردنی قەڵای جەلاب لە شوێنی قەڵای ئاشێب دەکا.[٤٣] لەکاتی راڤەو باس کردنی ململانێی نێوان زەنگیی و کوردەکانی دەوروبەری موسڵ، ئاماژە بە ریوایەتێکی تر دەکا لە زمان شارەزایانی کورد هەر سەبارەت بەو رووداوە.[٤٤]

بە هەڵگیرسان و تەشەنەسەندنی شەڕی خاچهەڵگرەکان، زۆرترین گرینگیی بەو لایەنەی مێژوو دەدا، دیارە چەند کەموکوڕییەك لەزانیارییەکانی ناوبراو لە مەڕ ئەو شەڕانە هەیە کە دەبێ بە کەڵك وەرگرتن لە نووسینی کەسانێکی وەك عیماد کاتب، هەوڵ بدرێ ئەو کەموکوڕی یانە نەمێنن. لە باسی کوژرانی ئەمیر

---

40 ٩/٣٧.

41 ٩/ ٣٤٢-٣٤٣.

42 ٩/٥٣.

43 ٩/١٢٤.

44 ٩/٥٣-٥٤.

ئیبراهیم کوڕی حەسەنی میهرانی لە کاتی گەمارۆی عەسقەلان لە ساڵی ٥٨٣ ک.م دا، لە جیاتی ناوبردنی ئەو کەسە تەنیا دەنووسییەکێك لە ئەمیرە میهرانییەکان شەهید بوو و[٤٥] لە درێژەی ئەو باسەدا لە جیاتی ناوی ئەمیر جەمالەددین زەرزاریی، باسی پێشڕەویی و جووڵەییەکێك لە فەرماندەکانی سوپا دەکا بەرەو بیت المقدس.[٤٦] لە رەوتی رووداوی پێشڕە ویی مەغۆلەکان بەرەو رۆژهەڵات لە دوای کوژرانی جەلالەددین خوارەزمشا، باسی بەربەرەکانی خەڵکی ناوچەی قورەیشییە دەکا لە بەرامبەر هێرشی هێرشبەران دا،[٤٧] هیچ ئاماژەیەك بە کوردبوونی خەڵکی ئەو ناوچە ناکا. وا دیارە بە هۆی شکستی دیمیات لە ژێر کاریگەریی پەیمانشکێنیی "ئیبنومەشتووب هەکاریی" و شۆرش دژی مەلیك کامیلی ئەییووبیی لە ساڵی ٦١٦ ک.م داو ئەوەندە بەو رووداوە دڵخۆش نییەو لە مەودای گێڕانەوەی رووداوی ململانێی و گێرەو کێشەکانی دواتری ناوبراو و دەستگیرکرانی لە لایەن بەدرەددین لوئلو و خەیانەتەکەی بە ئیبنومەشتووب ناکاو تۆن و ئاوازی قسەکانی سەبارەت بە لوئلو زۆر لایەنگرانە دیارە.[٤٨]

٤- **التاریخ الباهرفی الدولەالاتابکیە**،[٤٩] نووسینێکی تری ئیبنوئەسیر جەزەرییە. ناوبراو لەو کتێبەدا بە ئاوازو تۆنێکی لایەنگرانەوە درێژە بە باس و راڤەو توێژینەوەکانی دەدات سەبارەت بەبنەماڵەی زەنگی کە پێشتر لە کتێبی الکامل دا باسی کردبوون. هەڵبەت هێندێك جیاوازیی و ناهەماهەنگیی لە نێوان ئەو دوو

45 ١٠/٣٣.
46 ١٠/٣٤.
47 ١٠/٤٤٨.
48 ١٠/٣٢١.
49 بە هەوڵ و ماندووبوونی ئەحمەد تولەیمات, قاهیرە: دار مکتبةالحدیث, ١٣٨٢ک.م.

کتێبەدا هەیە لە خوارەوە باسی ئەوبەشەیان دەکەین کەپێوەندی بە بابەتی نووسینەکەی ئێمەوە هەیە:

لە شوێنی خۆی دا باسی تێکنەکردنەوەی قسەکانی ناوبراومان کرد سەبارەت بە عیمادییە، ئەو لەم کتێبەدا زیاتر درێژەی بەو قسە دژبەیەك ویەکتربڕانە داوەو جوێ لە ئاماژەکردن بەوە کە لەساڵی ٥٣٧ ك.م دا دە ستی بەسەر داگیراوە، ئەم جارە دەنووسێ لە شوێنی قەڵا کۆنەکەی شەعبانی دروست کراوە.[٥٠] لە کاتێك دا لە کتێبی الکامل دا ئاماژە دەکا کە شارەزوور لە ساڵی ٥٣٤ك.م دا دوای گەمارۆی دیمەشق بەردەست کراوە.[٥١] لێرەدا وا باس دەکا کە شارەزوور بەر لە گەمارۆی دیمەشق تەسلیم بووە.[٥٢]

٥– **مفرج الکروب فی اخبار بنی ایوب**،[٥٣] نووسینی جەمالەددین موحەممەد بن واصل (کۆچکردووی ٦٩٧ ك.م)، ئەو کتێبەش یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەو بە تایبەتی لە باسی ڕەوتی ڕووداوی شەڕی خاچهەڵگرەکان دا سوودی زۆری لێ وەرگیراوە. کتێبەکە بە شێوەی ریزبەندیی ساڵژمێر ئامادە کراوە. یەکێك لە تایبەتمەندییەگرینگەکانی ئەوەیە کە لەکاتی باسکردنی هەر ڕووداوێك دا ئەگەر پێویستی کردبێ بە مەبەستی زیاتر تیشك خستنەسەر ڕووداو و بابەتەکە، کورتەمێژووی ڕەوتی ڕووداوەکانی بەر لەو بابەتە دەخاتە پێش چاوی خوێنەرو لەم ڕێگایەوە هەوڵ دەدا پاڵپشتیی پێوەندی پتەوی بابەتەکە بە هەموو بەشەکانییەوە بکات. نووسەر لە

---

50 ل, ٦٤.

51 ٩/١٠٧.

52 لاپەڕەکانی, ٥٧ -٥٨.

53 بەرگەکانی یەکەم تا سێهەم بەرهەمی هەوڵی جمال الدین شیال ە و بەرگی چوارەم بە هەوڵی حەسەنەین محمد ڕەفیع هاتۆتە بەرهەم, مصر:مطبعة فؤادالاول, ١٩٥٣ زاییینیی.

گێڕانەوەی رووداوەکانی بەر لە سەردەمی خۆی زۆرتر پشت بە قسەو زانیاری مێژوونووسانی وەك عیماد کاتب ئیسفەهانی (کۆچکردووی ٥٩٧ك.م) و قازیی بەهائەددینی ئیبنوشەدداد (کۆچکردووی ٦٣٢ ك.م)، دەبە ستێ. بۆ نموونە بەدڕاوێژیی و بەرنامەو بەراوردە بێسوودەکانی زیائەددین ئیبنوئەسیر وەزیری مەلیك ئەییوبیی، دەقاودەق لە عیماد کاتب وەردەگرێ[٥٤] و دەیگوازێتەوە ناو نووسینەکەی خۆی و رووداوی مردنی فەقێ زیائەددین عیسا هەکاریش لە ساڵی ٥٨٥ك.م دا لە گێڕانەوەکەی ئیبنو شەددادەوە وەردەگرێ.[٥٥]

وا دیارە نووسەر– وەك مێژوونووسانی دیکەی ئەو چاخەو بە تایبەت ئیبنو ئەسیر– دڵی زۆر بە ئیبنومەشتووبی هەکاریی خۆش نەبووە. چونکە پەیمانشکێنیی و هەوڵی ئیبنو مەشتووب بۆ کودە تاکردن دژی مەلیك کامیل، بە رەفتارێکی خیانەتکارانە دەزانێ[٥٦] وبەڵام لە هەمان کات دا کردەوەی بەدقەولیی و بێووەفایی بەدرەددین لوئلو لە دەست بەسەرکردنی مەلیك دا کە رەفتارێکییەکسانە لەگەڵ کردەوەکەی ئیبنومەشتووب دا، بە خیانەت هەژمار ناکاو زۆر بە ساکاریی لە حاند ستەملێکراویی ئیبنومەشتووب چاوپۆشیی دەکاو[٥٧] بە ئەو خیانەتەدا باز دەدا. نووسەر رەخنە لە بەدڕەفتاریی و ناعەداڵەتیی جەلالەددین خوارەزمشا دەگرێ و پێی وایە کە کوژرانی ناوبراو لە ساڵی ٦٢٨ ك.م دا بە دەستی کوردەکان، ئاکام و دژکردەوەی رەفتارەکانییەتی.[٥٨]

---

54 ٣/ ٦٣-٦٤.

55 ٩٧/١.

56 ٧٠/٤.

57 ٧٢/٤.

58 ٢٩٦/٤.

یەکێك لە هەڵەکانی نووسەر لە کاتی گێڕانەوەی ڕووداوی هێرشی سەلاحەددین بۆ موسڵ، ئەوەیە کەباسی کۆڕی ڕاسپێراوی عیزەددین مەسعوود فەرمانڕەوای شاربۆ ئاشتیی دەکا دوای دەست بەسەراگرتنی میافارقین و لە کاتی سێهەمین گەمارۆدا.[٥٩] لە کاتێك دا کە ئەو ڕاسپاردە ئاشتیخوازانە بە پێی قسەی ئیبنوئەسیر هاوسەردەمی ڕووداوەکە، لە کاتی گەمارۆی دووهەم و بەر لە هێرشی سەلاحەددین بۆ میافارقین بووە.[٦٠]

**٦- الحوادث الجامعه والتجارب النافعه فی المائه السابعه:**[٦١] نووسینی کەمالەددین ئیبنو فووەتی، ئەو کتێبەش ڕووداوەکانی بە ڕیزبەندیی ساڵانە گەڵاڵە کراون و نووسەر لە بەشی مێژووی هێرشی مەغۆلەکان بۆ دەڤەری جەزیرە کەڵکی زۆری لێوەرگرتووە. بە هۆی ئەوە کە نووسەر هاوسەردەمی ئەو ڕووداوەیە ڕاپۆرت و زانیاریی فرە بایەخداری لە مەڕ هێرشی مەغۆلەکان بۆ هەرێمی جەزیرەو پێشڤەچوونی سوپاکەیان بەرەو دارالخلافەی بەغدای خستۆتە بەردەست و خودی نووسەریش لە کاتی تێکشکانی شار لە ساڵی ٦٥٦ ك.م دا لە لایەن هێرشبەرانەوە بە دیل دەگیرێ و سەرەنجام بە خواست و نێوبژیوانیی خواجە نەسرەددین تووسیی ئازاد دەکرێت. نووسەر باسی بەردەست کردنی شاری هەولێر دەکات بە دەستی سوپای خەلیفە لە دوای مردنی موزەففەرەددین کەوکەبووریی فەرمانڕەوای ئەو شارە لە ساڵی ٦٣٠ ك.م داو بە درێژیی ئەو باسە ڕوون دەکاتەوە.[٦٢] ڕاپۆرت و زانیارییە مێژووییەکانی

---

[59] ٢/ ١٧٠-١٧١.

[60] ١٠/٥.

[61] بیروت دارلفکر, ١٤٠٧ ك.م.

[62] لاپەڕەکانی ٤٤-٤٧.

کەمالەددین سەبارەت بە هێرشی مەغۆلەکان بۆ جەزیرەو راڤەو روونکردنەوە هەمەلایەنەکەی لە مەڕ تێکشکانی هەولێر لە بەرامبەر ئەو مەغۆلانەدا لە ساڵی ٦٣٤ ک.م داو خۆقایم کردنی خەڵکی ئەوشارە لەقەڵای شارەکەیدا[٦٣] هەروەها درێژەی باسی سەرکوتکردنی کوردە یەزیدییەکان لە لایەن بەدرەددین لولو لە ساڵی ٦٥٢ ک.م دا،[٦٤] بەرهەم و نووسین و دەسکەوتەکانی نووسەری ئەم دێڕانەی لە رادەبەدەر دەوڵەمەند کردووە.

[63] ل , ٥٤.
[64] ل , ١٣٣.

# بەشی یەکەم

## میژووی کوردەکانی هەریمی جەزیرە ٤٤٧- ٦٥٦ ك

**بەندی یەکەم: پەرتەوازە یی حەشیمەتی کوردەکانی جەزیرە**

**بەندی دووهەم: کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی سەلجووقییەکاندا ( ٤٤٧-٥٢١ ك )**

**بەندی سێهەم: کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی ئەتابەکانی زەنگی ( ٥٢١ -٥٨١ ك )**

**بەندی چوارەم: کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی ئەییوبییەکان دا ( ٥٨١ -٦١٤ ك)**

**بەندی پینجەم: کوردەکانی جەزیرەو رووبەڕووبوونەوەی خوارەزمشاهیی و مەغۆلەکان ( ٦١٤ -٦٥١ ك )**

### بەندی یەکەم: پەرتەوازە یی حەشیمەتی کوردەکانی جەزیرە

گومانی تێدا نییە کە یەکەمین و گرینگترین هەنگاو لە مێژووی کوردەکانی جەزیرە لەو قۆناغەدا کە مەبەستمانە، بە بێ لەبەرچاوگرتنی رۆڵی چارەنووس سازی باری جوگراف لە سەر ئاڵوگۆڕە مێژووییەکان و دیاریکردن و روونکردنەوەی هەڵکەوتەیی جوگرافیای دەڤەرەکەیان، ناشێ بچیتە گۆڕەپانی ئەو بوارە.

جوگرافیزانە موسڵمانەکان ناوچەی باکووری نێوان دووړووبارەکە (بين النهرين)[٦٥] کە بریتییە لە تێکڕای خاکی نێوان هەردوو رووباری دەجلەو فورات، بە (جەزیرە) ناودێریان کردووە.[٦٦] تەنیا مەقدیسی لە ساڵی٣٧٥ ك.م دا بە

[65] Mesopotamia

[66] نووسەرەکەی نەناسراوە, حدودالعالم, ٤١١,ابن شداد,عزالدين,٣/٤ .

سەرزەوی (ئەقوور) ناوی بردووەوە کە هۆی ئەم ناولێنانەی روون نییە.[٦٧] سنووری ئەم ناوچەیە هەر وەك لە نەخشەی بەر دەستتان دەردەکەویٚ لە باکوورو باکووری رۆژهەڵاتەوە بە ئەرمەنستان و گورجستانەوە لکاوەو لە باشوورەوە بە عیراقی عەرەب و لە رۆژئاواوە بە شام و لە رۆژهەڵاتەوە بە ئازەربایجان و ئەررانەوە نووساوە. هەڵکەوتنی ئەو دەڤەرە لە سەر چوارریٚیانی پێوەندی نێوان ئێران و عێراق و ئاناتۆلیی و سووریە و هاتووچۆ و رەتبوونی گەل و نەتەوە جۆراوجۆرەکان بەو هەرێمەداو بوونی دوو رووباری گرینگی دەجلەوفورات، هەر لە کۆنەوە گرینگییەکی تایبەتیان بەو ناوچەیە بەخشیوەو ناوچەکەی کردۆتە ناوەندی ململانیٚ و قەیران و ئاژاوە کە ئەو رووداوانە تا ئێستاش و لەم سەردەمەش دا درێژە یان هەیە.

باری کەشی سروشتی ناوچەکە بە گشتییەکسانە. بەڵام بە هۆی باری سیاسی و جیاوازیی دانیشتووانی هەر ناوچەیەك، بە سەر سیٚ ناوچەدا دابەش دەکرێت.[٦٨] ئەو دانیشتووانەش بریتین لە سیٚ تیرەی عەرەبی عەدنانیی (بەکرو رەبیعەو موزەر)

[67] احسن التقاسیم, ١/ ١٩٠-١٩١.

[68] شەمیسانی, مدینە سنجار....,١٤.



لسترنج ۹۰ برگرفته از: لسترنج، ٥

استانهای شمال غربی و جزیره و آذربایجان

کە لە سەردەمی ساسانییەکانەوە لەو دەڤەرە نیشتەجێ بوون وئەو بەشەی جەزیرە کە هی ئەوانە دابەش دەبێ بۆ سێ ناوچەی: واری بەکر لە باکوور، واری موزەر لە رۆژئاواو زێدی رەبیعە لە رۆژهەلات. دیارە جیا لەو سێ تیرە عەرەبە چەند نەتەوەیەکی تری وەك ئارامیی و کورد و ئەرمەنییەکانیش لە دێرزەمانەوە لە هەرێمی جەزیرەدا نیشتەجێ بوون.[٦٩]

بە هۆی ئەوە کە کوردەکان بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەن و لە دوو ناوچەی دیاربەکرو دیاری رەبیعەدا نیشتەجێ بوون، بە درێژیی باسی پەرتەوازەیی ئەو کوردانە دەکەین لەو دوو ناوچەدا. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییە کە ناوی زۆربەی ئەو شوێن و ناوچانە لە درێژایی ئاڵوگۆڕەکانی مێژوودا گۆڕانیان بە سەرداهاتووەو تەنانەت هێندێکیان هەر بوونیان نییە، لە خوارەوە ئاماژە بەو ناوچانە دەکەین کە لەم شیتەڵکارییەدا دەخرێنە بەر باس:

**١-١-١- واری رەبیعە**

ئەوپەڕی رۆژهەڵاتی ناوچەی جەزیرەیەو زەویەکانی رۆژهەڵاتی رووبارەکانی خابووری گەورەو هێرماس، رۆژاوای دەجلە تا دەگاتە نوسەیبین و پانتاییەکانی رۆژهەلاتی دەجلە دەگرێتەوە.[٧٠] ئیبنوخوردادبێ لە ٢٥٠ ك.م دا وێڕای ژماردنی شارەکانی ئەو هەرێمە، نووسەیبین وەك ناوەندی هەرێمەکە هەژمار دەکا.[٧١] شارە کوردنشینەکانی واری رەبیعە کە لەم توێژینەوەدا باسیان دەکرێ بریتین لە:

---

[69] عبارە, ٤٠.

[70] لسترنج, ٩٤.

[71] المسالك والممالك, ٧١.

**١-١-١-١- موسلٚ:** بە گوێرەی قسەی مەقدیسی ناوەندی ناوچەی رەبیعەیە.[٧٢] ئەو شارە لە سەر لێواری رۆژاوای رووباری دەجلەیەو هۆی ناولێنانەکەشی ئەوەیە کە لە رێژگەی بە یەکگەیشتنەوەی هەموو لقەکانی رووباری دەجلە هەڵکەوتووە.[٧٣] بە پێی قسەی خوردادبیٚ لە سەردەمی ساسانییەکان دا شاری (بوزاردشیر) لە شوێنی موسڵی ئێستا بووە.[٧٤] موسلٚ لە سەردەمی ئیستەخریی (لە ٣٤٠ ك.م) دا شارێکی گەورەو پڕ لە خانووی دروستکراو لە بەردو گەچ بووە. بە وتەی ئیبنوحەوقەل (لە ٣٤٠ ك.م) دا ئەو شارە ئاوەدان و پڕ لە خەڵك و جموجۆلٚ بووەو شوێنی نیشتەجێبوونی فەرمانڕەوای جەزیرە و ناوەندەکانی دەسەڵاتی ناوبراو بووەو میوانخانەو حەمام و گۆڕەپانی گەورەی هەبووەو عەرەبەکان و هۆزو تیرە کوردەکانی وەك هەزەبانیی و حومەیدیی و لاریی لە دۆلٚ و پێدەشتەکانی دا گەرمێن و کوێستانیان کردووە. نەینەوا یەکێك لە گوندەکانی دەورو بەری موسلٚ بووە کە لە رۆژهەڵاتی دەجلە بووەو پێغەمبەر یونس لەو شوێنە بۆ لای گەلەکەی رەوانە کراوەو لە سەردەمی ئیبنو حەوقەل دا شوێنەوارەکەی دۆزراوەتەوەو دیوارەکەی هەرمابوو. یەکشەممە بازاڕ (سوق الاحد) یەکێك لە شارەکانی بووە کە لە چەند کاتی دیاریکراودا کاڵاو کەل و پەلی تێدا ئاڵوگۆڕ کراوە وکوردەکان لەو بازاڕەدا خەریکی بازرگانیی بوون. ناوچەیەکی تری ئەو شارە (کەفەرعەززی) بووە کە کوردەکان لە دەوروبەری ژیاون.[٧٥]

---

[72] احسن التقاسیم, ١١٢/١.
[73] یاقوت, ٢٥٨/٥.
[74] المسالك والممالك, ١٦.
[75] صورةالارض, ١٩٤-١٩٦.

مەقدیسی لە ٣٧٥ ك.م دا لە باسی جوانییەکانی دا سەبارەت بە باڵەخانەو گەرماو و ماڵ و بازاڕو باغ و بێستانەکانی دەدوێ و ئەو شارە بە خاوێنترین شاری دەڤەری رەبیعە هەژمار دەکاو لە درێژەی باسەکەی دا دەڵێ کە نەخشەی شارەکە چەشنی جاجم و پشتەماڵی ئەعیانەکان وهاووێنەی بەسرەیەو دانەوێڵەو هەنگوین و خەڵووز و پەنیرو ترش و ئاسن و بەردەقانیی و شتی سوێرکراو... رەوانەی دەرەوە دەکرا.[٧٦]

هەروەها ئیدریسی لە ٥٤٨ ك.م دا وێڕای باس کردنی ئەو تایبەتمەندی یانەی کە جوگرافی زانەکانی تریش باسیان کردوون، ئاماژە بە شاری سوق الاحد و بازرگانی کوردەکان لەو شارەدا دەکات.[٧٧] ئیبنوجوبەیر کە لە ساڵی ٥٨٠ ك.م دا بە موسڵ دا تێپەڕیوە، وێڕای ئاماژە بە کۆنیی و گەورەیی و بە هێزیی شارەکە، دەڵێ کە لە ناو شوورەی چواردەورەی ئەو شارەدا چەند تاقەیەك دروست کراون کە کراون بە سەنگەری بەربەرەکانیی و پارێزگاریی و تەنیا لە ناو خودی شوورەی شارەوە رێگای چوونە ناو ئەو تاقانە هەیە. ناوبراو پاشان باسی رووخۆشیی و رەوشت بەرزیی خەڵکی شارەکە دەکا.[٧٨]

دەسەڵات و گەورەیی موسڵ تا سەردەمی یاقوت لە ساڵی ٦٢٣ ك.م دا هەروا سەقامگیرو لە جێی خۆی بوو. ناوبراو وێڕای ئاماژەکردن بە گەورەیی شوورەی شاری موسڵ، ئەو شوورەیە بە دەروازەی عێراق و کلیلی خوراسان هەژمار دەکاو بە هۆی هەڵکەوتنی ئەو شارە لە سەر رێگای پێوەندیی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، هاوشان لە گەڵ نیشابوورو دیمەشق وەك سێهەمین گەورەشاری جیهان

[76] احسن التقاسیم, ١/ ١٩٤-٢٠٣.

[77] نزهەالمشتاق, ٢/ ٦٥٩

[78] سفرنامە ابن جبیر, ٢٨٦-٢٨٨ .

ناوی دە با.[٧٩] هێرشی بەربڵاوی مەغۆلەکان بۆ سەر هەرێمی جەزیرە، گەشەو ئاوەدانیی موسڵی لە برەو خست و کۆتایی پێ هێنا. ئەبولفیدا لە ساڵی ٧٢١ ك.م دا گوتوویەتی دوو لەسەر سێی شارەکە ئاوەدانەو شوورەی شارەکە لە شوورەی دیمەشق بەرینترە.[٨٠]

لە رۆژهەڵاتی ئەو شارەو لە سەر بەرزایی کێوەکانی قەڵای عەقری حومەیدییەی کوردەکان دروست کراوە.[٨١] قەڵای قایم و پتەوی عیمادیە لە سەر لووتکەی کێوێکی بەرز هەڵکەوتووە کە لە بەر دەستی کوردەکان دابووەو عیمادەددین زەنگییەکەم لە ساڵی ٥٣٧ ك.م دا، دوای داگیرکردنی ئەو قەڵایە سەرلەنوێ دروستی کردەوەو لەو رۆژە بەدواوە بە ناوی عیمادەددینەوە ناوبانگی دەرکرد.[٨٢] لەلای رۆژهەڵاتی قەڵاکەوە تیرەیەکی کوردەکان بە نێوی هەکاریی خاوەن پێگەو سەنگەرو[٨٣] قەڵا بوون و لە رووداوەکانی ئەو قۆناغە مێژووییەدا کەمەبەستی توێژینەوەکەی ئێمەیەوبە تایبەت لەشەڕی خاچهەڵگرەکان دا رۆڵی بەرچاویان هەبوو کە لە شوێنی خۆی دا بە درێژیی باسی دەکەین.

١- ١- ١- ٢- **نوسەیبین:** هەرهەمان شاری "نەسیبیس"ی[٨٤] رۆمییەکانەو جوگرافی نووسە یۆنانییەکان بەو شارەیان دەگوت "سوکورنووس"یان "مەکدۆنیس"ولە تورکیای تازە شدا ئەو شارەگرینگیی خۆی هەر پاراستووەو یەکێکە لە شارە کوردنشینەکانی ئەو وڵاتە.

---

79 معجم البلدان, ٥/ ٢٥٨ -٢٥٩.

80 تقويم البلدا ن, ٣٢١.

81 ابن ئەسیر, الكامل, ٧١/٨, ياقوت, ٤/ ١٥٤,ابوالفدا ,٣٠٣.

82 ياقوت ٤/ ١٦٨-١٦٩, ابوالفدا ٣٠٥, قەلەقەشقەندیی, ٤/٣٢٥.

83 ئیبنوخەلەكان ٣/ ٣٤٥, ابوالفدا ٣٠٤

84 Nisibis

بە پێی قسەی ئیبنوخوردادبێ لەدووریی پێنج فەرسەخیی (دارا) هەڵکەوتووە.شارێکی گەورەیە هەڵکەوتوو لە سەر دەشتێکی بەرین و پڕە لە دووپشکی ژاراوی بکوژو ئاوی ئەوشارە لەشیوو دۆڵەکانی کێوی بالووسا-کە سازگارترین و خۆشترین شوێنی ئەو دەڤەرەیە- دەڕژێتەخوارەوە. ئیبنوحەوقەل ئەو شارەی لە ریزی باشترین وپڕبەرهەمترین و سازگارترین شارەکانی جەزیرە، هێناوەتە ژمار کە بە میوەی زۆرو کاڵاو کەل وپەلی هەرزان نێوبانگی هەبووە. [٨٥] مەقدیسی سەبارەت بەو وارە گوتوویەتی لە موسڵ بچووکترە بەڵام خۆش و دڵگیرترەو گەرماوی جوان و کۆشك و باڵەخانەی گەورەو رازاوەو خەڵکێکی گۆشتن و جوان و رووخۆش و کراوەی هەیە و قەڵایەکی لێیە کە لە بەردو قسڵ دروست کراوەو مەرەکەب و میوەی وشك کراو و گۆزەو شابەڕوو لەوشارەوە هەناردەی دەرەوە دەکرێن و یەکێك لە شتە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەو سەرچاوەیە کە ئاوی قسڵاوی لێ دێتە دەرو لە دروستکردنی خانوو و گەرماوەکان دا کەڵکی لێ وەردەگرن. [٨٦]

ئیدریسیش دوو سەدە دوای مەقدیسی لە ژێر تیشکی زانیاری جوگرافی زانە رۆژهەڵاتییەکان دا باسی شوورەی شارەکە، بازاڕە بە برەوەکانی کە پڕن لە هەموو چەشنە پیشەسازو هونەرمەندێك وجل وبەرگی باش و جوانی ئەو شارە دەکا. [٨٧] هەر لەو سەدەیەدا ئیبنو جوبەیر بە دەربڕینێکی روون و رەوان باسی جوانییەکانی شار دەکا: وەك دەشتە سەوزو بەرینەکەی، دارستانە سروشتییە چڕو پڕەکانی و سێبەری ئاسوودەبەخشی ئەو دارانە کە بە ئاوی رووبارێك پاراو

---

[85] صورة الارض, ١٩١.

[86] احسن القاسيم, ١٩٦/١, ٢٠٤-٢٠٥.

[87] نزهة المشتاق, ٦٦١/٢-٦٦٢.

دەکرێن کە وەك بازنەیەك لە شارەکە هاڵاوە. زیان و زەرەری دەستی کوردەکانی نیشتەجێی بەرزاییەکانی ئەو دەورو بەرە کە لە ساڵی ٥٨٠ ك.م دا لە سەر رێگای نوسەیبین– دارا هەڵیانکوتایە سەر کاروانەکەیان و فەرمانڕەوای ئەو شارەش نەیتوانی بەیدەستیان بکات،[٨٨] هیچ کاریگەریی تێنەکردووەو نەیتوانیوە کەمێك لە شیرینی قسەکانی کەم بکاتەوە!

بە پێی قسەی ئەبولفیدا کە لە سەدەی هەشتەم دا دەڵێ ئەو شارە لە باکووری شەنگار هەڵکەوتووەو بە گوڵە سپییەکانی نێوبانگی دەرکردووەو گوڵی سووری تێدا ناڕوێ و کێوی ئەو شارە هەر ئەو جوودییەیە کە کەشتی نووح لە سەر ئەو کێوە لەنگەری گرت.[٨٩] لە **نزهةالقلوب** دا باس کراوە کە ئاوی شارەکە لە رووباری هێرباس دابین دەبێ و بەرزاییەکانی شار پڕن لە ترێ و میوەی زۆرو جۆراجۆر.[٩٠] گۆیا زۆربەی ئەو شارە لە سەردەمی تێپەڕینی ئیبنوبەتووتە بە وێدا لە نیوەی دووهەمی سەدەی هەشتەم دا، وێرانە بووە و بەڵام لە هەمان کاتدا بەجۆرە گوڵاوێك ناوبانگی دەرکردووەو خەڵکێکی بە دین و دەستپاکی لێبووە.[٩١]

١-١-١- ٣- **هەولێر**[٩٢]: ئەو شارە هەر بریتییە لە ئەربیلای کۆن وهەولێری ئێستای کوردەکان کە رابردووی دەگەڕەێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوورییەکان و

---

[88] (لە سەفەرنامەی ئیبنوجوبەیردا نووسراوە: هەر ئەو دڵگیریی و دێرینەیی و جوانییەی دیمەنی شارەکە، هەستی جوانیی پەسندی ئەبونەواسی بەم جۆرە هێناوەتە جۆش:

طابت نصيبين لي يوما فطبت لها　　　ياليت حظي من الدنيا نصيبين

[89] تقويم البلدان, ٣١٧.

[90] موستەوفی, ١٠٦.

[91] رحلة ابن بطوطة, ٢٣٧.

[92] Arebi

واتای ناوەکەی (ئەربائیللۆ) چوارخودایەو لە شوێنێکی دەشتایی و بەرین لە نێوان دوو رووباری زێی گەورەو زێی بچووک دا هەڵکەوتووەو قەڵایەکی قایمی لە سەر تەپۆلکەیەکی خۆڵین و بەرزو گەورە هەبووە.[٩٣] ئەو شارە هەر لە دێرزەمانەوە کوردنشین بووەو ئێستاش پێتەختی حکوومەتی کوردستانی عێراقە. لەو کوردانەی نیشتەجێی ئەو شارەن دەشێ ئاماژە بە تیرەیەك بکەین بە نێوی هەزەبانیی.[٩٤]

هۆزێکی دیکەی کورد بە نێوی حەکەمی دانیشتووی ئەو شارە بوون کە لە شەڕی خاچهەڵگرەکان بەتایبەت هاوڕێ لەگەڵ سوپای سەلاحەددین گیانبازیی و قارەمانەتی زۆریان لە خۆیان نیشان داو فەرماندەکەیان ئەبولهەیجائوسسەمین لە دژوارترین کاتی گەمارۆی عەککا لەلایەن فەرەنگییەکانەوە لە ساڵی ٥٨٦ ک.م دا رەوانەی ئەو شارە کرا بۆ پشتیوانیی کردن لە تەقیەددین عومەر برازای سەلاحەددین.[٩٥]

یاقووت کە جوگرافزانێکی هاوسەردەمی ئیبنوئەسیرە بەم جۆرە باسی ئەوشارە دەکا:

(شارێکی گەورەیە کە زۆرتر رووخساری لە شێوەی گوند دەچێ نەك شار. قەڵایەکی گەورەو قایمی هەیە لەگەڵ خەندەکێکی قووڵ کە شوورەی شارەکە لە ناوەڕاستەوە کەرتی دەکاو وەك قەڵای حەڵەبە بەڵام گەورەترەو ماڵ و بازاڕی لێیەو مزگەوتێکی تێدایە. دانیشتووەکانی کوردی بەعەرەب کراون و

[93] لسترنج, ١٠٠, سامر ٩٠

[94] ابن اثير, الكامل, ٨/ ٧١.

[95] همو, الكامل, ١٠/٧١.

تێکڕای وەرزێڕو گوندنشینەکانی دەوروبەری کوردن".[٩٦] ئەو شارە لە سەدەی حەوتەم دا چەندین جار کەوتە بەر پەلامارو هێرشی بەرینی مەغۆلەکان و یەکێك لەو تاك و تەراشوێنانە بوو کە بەرگریی لە خۆی کرد، بەڵام سەرەنجام کەوتە ژێر دەستیان وبە هۆی ئەو کارەساتەوە زیانی گەورەی پێگەیشت. هەڵبەت خۆی لە ژێر پەردەی رەشی تازیەدا پێ رانەگیراو ئەو هێرشە قورس و بەزەبرانە نەیانتوانی رەوتی گەشەی شار لە برەو بخەن. چونکە ماوەیەك دوای داگیرکرانی، حەمدووڵڵا موستەوفی باسی گەورەیی شارو قەڵا مەزنەکەی و بەروبوومی دانەوێڵەو لۆکەی باش و ٢٢٠٠٠ دینار مووچەی دەوڵەت دەکا.[٩٧]

١-١-١- ٤- **شەنگار**[٩٨] : ئەوشارە لە باشووری نووسەیبین و دەشتی شەنگاردا هەڵکەوتووە. ئاوی شارەکە لە رووباری سێرسار کە لە چیای بارما(حەمرین) هەڵدەقوڵێ، دابین دەبێ. بە گوێرەی قسەی ئیستەخریی تەنیا ئەو شارە خورما بەرهەم دێنێ.[٩٩] ئیبنوحەوقەل لەگەڵ پەسندکردن و بەراست زانینی قسەکانی ناوبراو ئاماژە بە سەرچاوەو ئاوی زۆرو رەوانی ئەو شارە دەکاو دەڵێ دیوارێکی بەردین چواردەوری شاری داوەو لە دەست هێرش و وەزەندیی دوژمنی هیرشبەر دەیانپارێزێ و لەباسی بەروبوومی میوەی شارەکەدا دەڵێ: جوێ لە میوە هاوینییەکان، چەند بەروبوومێکی تری وەك سماق و زەیتوون و... دێنێتە بەر.[١٠٠] هەروەها مەقدیسی بە سەرنج و گرینگی پێدانەوە باسی کەوشدروو و بەروبوومی شارەکە دەکاو ناوی ئەو بەرهەمانە دێنێ:

---

96 معجم البلدان ١/١٦٧.

97 نزهةالقلوب,١٠٢-١٠٣.

98 sindjar

99 المسالك والممالك, ٧٧.

100 صورةالارض, ١٩٩.

ناوکی بادام، قامیش، سماق، نارنج، پالْنگ و... کە لەو شارەدا ڕەنێویان دێنن،[١٠١] سولْتان سەنجەر لەو شارەدا چاوی بە ژیان هەلْێناوەو تێکڕای مێژوونووس و جوگرافی زانەکان لە سەر ئەوە یەکدەنگن کە ناوی سولْتان لە ناوی شارەکە وەرگیراوە.[١٠٢]

لە سەرچاوە ئیسلامییەکان داهاتووە کە کەشتی نووح لە کاتی لافاوەکەدا لە سەر کێوی شەنگار لە زەوی دراو پاشان درێژەی بە ڕۆیشتن داو سەرەنجام لەسەرکێوی جوودی کە لە ڕۆژهەلاْتی دەجلەیە، لەنگەری گرت[١٠٣] هۆزی زەرزاری کە هۆزێکی کورد بوون لەو شارە دە ژیان و لە سالْی ٥٧٨ ک.م دا کاتێك سەلاْحەددین ئەییوبی گەمارۆی ئەو شارەی دابوو، یەکێك لە فەرماندە کوردە زەرزارییەکان لە ڕێگایەکی نهێنییەوە سەلاْحەددینی بردە ناو شارو بوو بە هۆی بەچۆکداهاتن و تێکشکانی شارەکە.[١٠٤]

وەك یاقووت باس دەکا، مەودای نێوان شەنگارو موسلْ و نوسەیبین سێ ڕۆژە ڕێیەو شارێکی خاوێن و ئاوەدانە.[١٠٥] قەزوینی لە ٦٧٤ک.م دا باسی شارەکە دەکاو ئاماژە بە کەش و هەوای خاوێنی شارو بالْەخانە بەرزەکان و گەرماوە خاوێنەکانی کە ژێرەکەیان کاشی و بانەکەیان شووشەی ڕەنگاورەنگ

---

[101] احسن التقاسیم, ١م١٩٦ -١٩٧.

[102] ئیبنو جەوزیی, ١٢١/٨, ئیبنوئەسیر, الکامل, ٢٩٦/٨, ئیبنو خەلەکان, ٤٢٨/٢. سەرەڕای ئەوە کە زۆربەی مێژوونووسان ئاماژەیان بەو خالْە کردووە, عباس ئیقبال ئاشتیانی دەلْێ ئەوقسەیەهەلْبەستراوەو دەلْێ سەنجەر(شەنگار) ووشەیەکی تورکی یەو بە واتای رم هاوێژە. (نك: وزارت در عهد سلاطین بزرگ سلجوقی, ١٩٢.

[103] لسترنج, ١٠٦.

[104] ئیبنوئەسیر, الکامل, ٤٦٦/٩. شەمیسانی, مدینة سنجار, ١٣٥.

[105] معجم البلدان,٢٨٩/٣.

بووە، دەکا.[١٠٦] عیزەددین ئیبنوشەدداد لە ٦٨٤ ك.م دا وێڕای ژماردنی قوتابخانە و خانەقا جۆراوجۆرەکانی شەنگار، لە زمان کەلبییەوە باسی ناولێنانی شارەکە دەکا و دەڵی: شەنگار، هەیت و ئامەد، ناوی کوڕەکانی بەلەندی بن مالیکن کە نیشتەجێی ئەو ناوچانە بوون و ناوەکانیان بە سەر ئەو شوێنانەدا بڕاوە.[١٠٧]

ئیبنوبەتووتە دەڵێ: لە رووی زۆرو فرەیی ئاو و باغەکانییەوە وەك شاری دیمەشقە و خەڵکی کوردی ئەو شارە مرۆڤگەلێکی بوێرو دڵاواو بەخشندەن.[١٠٨]

ئەم شارە دەکەوێتە سنووری ناوچەی کوردنشینی کوردستانی عێراق و کوردە یەزیدییەکان لەوێ نیشتەجێن و لە زمانی ئاخاوتنی خۆیان دا بەو شارە دەڵێن "شەنگال" یان "شەنگار".

١-١-١- ٥- ***جەزیرەی ئیبنوعومەر***: ئەو شارە بە نێوی حەسەنی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب لە تیرەی بەنی تەغلیب کە بنیاتنەری شارەکە بووە، ناسراوەو نێوبانگی دەرکردووەو بە هۆی ئەوە کە رووباری دەجلە دەوری داوە، پێی دەگوترێ جەزیرە.[١٠٩] بە وتەی ئیبنو حەوقەل جەزیرە شارێکی بچووك بەڵام پڕ بەرو بەهرەیەو سێ فەرسەخ لە موسڵەوە دوورە کە شوێنی بارداگرتنی ئەرمەنستان و وڵاتی رۆم بووەو کەشتییەکان کاڵاو کەلوپەلی وەك هەنگوین و رۆن و پەنیرو گوێز، بادام و...بار دەکردو بەرەو شوێنی مەبەست دەکەوتنە رێ.[١١٠]

---

106 اثارالبلاد واخبارالعباد, ٤٦٢.

107 الاعلاق الخطيرة, ٣/١٥٤-١٥٧

108 رحلة ابن بطوطة ٢٣٧, شه ميسانى , مدينة سنجار...,٢٤٧.

109 ئيبنوخەلەكان, ٤/١٣٤, لسترنج,١٠١.

110 صورةالارض, ٢٠٢-٢٠٣.

جەزیرەی ئیبنو عومەر نیشتمانی دێرینی کوردەکان بوو وتیرەیەکی کوردی بەناوی بوختی لە رۆژئاوای ئەو جەزیرە دەژیان. ئەو کوردانە جڵەوی فەرمانڕەوایی قەڵاکانی ئەروەخ، بەرخووو کینکۆریان بەدەستەوە بوو و بە هۆی کوژرانی ئەمیر مووسەك بن موجەللی کوڕی فەرماندەکەیان بە دەستی ئەبوحەربی مەروانیی لە ساڵی ٤٤٧ ک.م دا، لەگەڵ ئەو بنەماڵە کوردە تووشی شەڕوتێکهەڵچوون بوون و خەڵکێکی زۆر لە هەردوو لا کوژران.[111]

نووسەری کتێبی **الاعلاق الخطيرة** وێڕای پێناسەیەکی هەمەلایەنەی جەزیرە، باسی ئەوە دەکا کە شارێکی تازەیەو لە سەردەمی مەئموون خەلیفەی عەبباسیی دا بە دەستی ئیبنوعومەری تەغلیبی دروست کراوەو بە ناوی بنیاتنەرەکەیەوە نێودێر کراوە. ناوبراو باسی ئەو چەند شتانە دەکا لە شارەکەدا: دوو مزگەوتی گەورە، هەشت مزگەوتی تر، چواردە مەدرەسەی تایبەت بە فیقهی شافیعیی، هەشت خانەقا، نەخۆشخانەیەك و چواردە حەمام.[112] جێی سەرسامییە سەدەیەك دواتر حەمدوولڵا موستەوفیی بە پێچەوانەی هەموویان دەڵێ کە ئەو شارە لە لایەن ئەردەشیری بابەکانەوە دروست کراوە![113] گۆیا لە سەدەی هەشتەم دا کاتێك ئیبنوبەتووتە بەوێدا تێپەڕیوە، شارەکە گەشەو برەوی جارانی نەماوەو زۆربەی بۆتە وێرانەو لە هەمان کاتدا وادیارە لووتکەی بەرزو بەرچاوی کێوی جوودی لە دەروازەی شارو ئەو سستیی ولاوازییە دڵهەژێن و تاقەت پرووکێنە، نەیانتوانیوە سەرنجی چاوە تیژو وردبینەکانی ئەو گەڕۆکە جیهانبینە لە حاند چاکیی وپاکیی و دڵاوایی و

---

[111] درێژەی ئەم باسە: لە بەشی سێهەمی ئەم توێژینەوەدایە.

[112] عیزەددین ئیبنوشەدداد ٣/٢١٣–٢١٥.

[113] نزهةالقلوب, ١٠٣.

میواندۆستی[١١٤] خەڵکی شار چەواشە بکەن. شاری بچووکی " تەنزە " لە باکووری جەزیرەی ئیبنوعومەر هەڵکەوتووە کە بە قسەی ئیبنو خەلەکان سەر بە دەڤەری دیاربەکرە[١١٥] وناوچەی قورەیشییە دراوسێی شارەکەیە. لە لای باشووری شارەکەوە تیرەیەکی تری کورد دەژیان کە ئەوانیش هەر ناویان قورەیشییەو کاتێك بەشێك لەمەغۆلەکان لە ساڵی ٦٢٨ ك.م دا دوای کوژرانی جەلالەددین خوارەزمشا بۆ یەکەمین جار لە فورات پەڕینەوە، لە بەرامبەر بەربەرەکانی توندی ئەو کوردانە دا بەچۆك داهاتن و ناچار بوون پاشەکشە بکەن.[١١٦]

بەشنەویی تیرەیەکی تری کوردەکان بوو کە جڵەوی فەرمانڕەوایی قەڵایەکی قایم و پتەویان بە ناوی "فەنەك" بە دەستەوە بوو و لە سەر بنەمای قسەیەکی یاقووت ماوەی سێسەد ساڵ بوو لەو شوێنە حکوومەتیان دەکردو نێوبانگی جوامێریی و میواندۆستیی و پشتیوانیی لێقەوماو وپەنابەران لە لایەن ئەو کوردانەوە، لە هەموو جێیەك دەنگی دابۆوە.[١١٧] ئەم شارە ئێستا یەکێك لە شارە گرینگەکانی ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی تورکییەیە.

### ١–١–٢– دیاربەکر

ئەو هەرێمە بچووکترین هەرێم و لەوپەڕی ناوچەی هەرێمی جەزیرەیەو هەموو شارەکانی کەوتوونە باکووری رووباری دەجلەوە.[١١٨] شاری ئامەد ناوەندو گەورەشاری ناوچەکەیەو میافارقین، ئەرزەن و ماردین، گرینگترین شارەکانی

---

114 رحلة ابن بطوطة, ٢٣٦.

115 وفيات الاعيان, ٦/ ٢١٠.

116 ابن واصل, ٤/ ٦٢٦-٦٢٨.

117 ياقوت, ٤/ ٣١٥-٣١٦.

118 لسترنج,١١٦.

ئەو دەڤەرەن.[١١٩] زۆربەی شارەکانی ئەو ناوچەیە لە سەر بەرزاییەکان دروست کرابوون و چەشنی سەدەکانی ناوەڕاست قەڵای بەرزو گەورەیان تێدا بنیات نرابوون بۆ ئەوەی شارەکە لە بەرامبەر هێرشی نەیاران دا بپارێزن. ئێستا ئەم ناوچەیە بە بەشێك لە وڵاتی تورکییە دێتە ژمار. گرینترین شارە کوردنشینەکانی ناوچەکە بریتین لە:

١-١- ٢ - ١- **ئامەد:** ناوەندی دیاربەکرو هەر هەمان "ئامیدا"ی[١٢٠] رۆمییەو دواتر ناوی دیاربەکر ئەویشی گرتەوەو گومانی تێدا نییە کە دیاربەکری ئێستا هەر ئەو ئامەدەیەو بە هۆی دیوارەکانی کە لە بەردی رەش دروست کراون، قەرەئامەد (ئامەدی رەش)[١٢١] بۆتە یەکێك لە ناوەکانی. ئیبنوخوردادبێ ئەو شارە بە بەشێك لە دیاری رەبیعە هەژمار دەکا.[١٢٢] ئەو شارە لە سەر بەرزایی کێوێك لە رۆژئاوای دەجلە بنیات نراوەو سێبەری بە سەر رووبارەکەدا دەکشێ و دیوارێکی رەش چواردەوری شارەکەی داوە کە لە پتەویی و بەردەوامیی و جۆری ئەو بەردانەی دیوارەکەی پێ دروست کراوە، دیوارێکی دەگمەن و بێ وێنەیە.[١٢٣]

مەقدیسیی وێڕای ئاماژە بەو راستییە کە شارێکی سەرسوڕهێنەرە، دەڵێ باڵەخانەو خانووەکانی وێنەی بیناسازییەکانی ئەنتاکییەیەو دوای ئەوە کە باسی پێنج دەروازەی شاردەکا کە یەکێکیان تەرخان کراوە بۆ کاتی شەڕ،

---

119 عیزەددین ئیبنوشەدداد, ٦/٣.

120 Amida

121 لسترنج.١١٦.

122 المسالك والممالك,١٥٠.

123 ئیبنوحەوقەل , ٢٠١-٢٠٢.

درێژە بەباسی شارەکە دەداو دەڵێ: لە جیهانی ئیسلام دا **هیچ** شارێکی بەو چەشنە قایم و **هیچ** سنوورو کەوشەنێکی ئاوا پۆڵاییینم نەدیوە.[١٢٤]

بە قسەی ناسرخوسرەو کە لە ساڵی ٤٣٨ ك.م دا بە مەبەستی سەفەری حەج بەو شارەدا تێپەڕیوە، (شارەکە لە سەر بناغەی تەختەبەردێکییەکپارچە بنیات نراوەو شار بە دیوارێك دەورە دراوە کە لە بەردی رەش دروست کراوەو ئەو بەردە رە شانە بە **هۆی** گڵ و گەچ زۆر بە توندییەکتریان گرتووە و پێکەوە چەسپیون).[١٢٥] نووسەری **الاعلاق الخطيرة** پێی وایە **هۆی** ناودێرکردنی شارەکە بە ناوی ئامەد، دەگەڕێتەوە بۆ ناوی دامەزرێنەرو بنیاتنەری شارەکە ئامەدی کوڕی بەلەندی و لە درێژەی باسەکەی دا دەڵێ دیواری شوورەی شار ئەوەندە پانە کە چوار سوار دەتوانن پێکەوە بە ریز غارغارێنی لە سەر بکەن.[١٢٦]

**هەروەها** ئەبولفیدا وێڕای پشت راستکردنەوەی ووتەی جوگرافیزانەکانی پێش خۆی، دەلێ شارەکە شوورەیەکی **هەیە** لە بەردی رەش دروست کراوەو ئاسن کاری تێناکاو ئاگر زیانی لێنادا.[١٢٧] ئەو شارە نیشتمانی کەونارای کوردەکانەو تا ساڵی٤٧٩ ك.م بەشێك بوو لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی کوردی بەنی مەڕوان کە لە ٣٨٠ –٤٧٩ ك.م، جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو. **هەرچەندە** بە **هۆی** رووخانی ئەو دەولەتە لەو ساڵەدا بەرە بەرە تورکەکان خۆیان تێخزاند، بەڵام بە درێژایی مێژوو بەرگی کوردبوونی خۆی پاراستووەو **هەروەك** لە دێڕەکانی پێشووتری ئەم نووسینەدا ئاماژەمان بۆ کرد، شاری دیاربەکری ئەمڕۆی

---

[124] احسن التقاسيم, ١٩٧/١.
[125] سەفەرنامە, ٧٣-٧٤.
[126] عیزەددین ئیبنو شەدداد,٣/ ٢٥٤-٢٥٥.
[127] تقويم البلدان, ٣٢٣.

کوردستانی تورکییە باری مێژوویی ئەو شارەی لە سەر شانی خۆی داناوەو ناوەند و پێتەختی هەرێمی کوردنشینی تورکییەی نوێیە.

**١-١-٢-٢- میافارقین:** لە وشەی (mayfarkath) میفەرکەت ی ئارامیی، یان Moufargin)ی ئەرمەنیی وەرگیراوە.[١٢٨]

ئیبنوخوردادبێ دەڵێ: پێنج فەرسەخ لە ئامەدو حەوت فەرسەخ لە ئەرزەنەوە دوورە.[١٢٩] بە پێی وتەکانی ئیبنوحەوقەل لە مەڕ پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی شارەکە، لە سەردەمی ناوبراودا حەشیمەتی شار جەماوە رێکی کەم بووەو خەڵکەکەی خەریکی کشتوکاڵ و وەرزێڕیی بوون و کرێکاریی تێدا نەبوو.[١٣٠]

مەقدیسیی بەم جۆرە باسی شارەکە دەکا کە شارێکی باش و قایم بووە و سەرزەوییەکەی لە زستان دا پیس و قوڕاویی بووەو دەڵێ: خەڵکی زانا لەو شارەدا کەمە.[١٣١]

ناسرخوسرەو لە پەسنی ئەو شارەدا دەڵێ: شوورەیەکی گەورەی هەیە کە لە بەردی سپی دروست کراوەو مزگەوتێکی گەورەی تایبەتی نوێژی جومعەی تێدایە کە کاتێکی زۆر پێویستە بۆ باس و پەسنی ئەومزگەوتە، و لە سەردەمی ناوبراودا فەرمانڕەوایەکی کوردی هەبوو بەنێوی ئەبونەسرئەحمەد کە یەکێك لەفەرمانڕەوا کوردەمەڕوانییەکان بوو و بەپێی قسەی ناسرخوسرەو ئەو فەرمانڕەوایە لە چوارفەرسەخیی میافارقین شاری نەسرییەی دروست کردووە،[١٣٢] سەرەڕای هەموو ئەو باس و زانیارییانەی لە مەڕ ئەو شارەوە باس

[128] لسترنج, ١١.

[129] المسالك والممالك, ٧٢.

[130] صورةالارض, ٢٠١.

[131] احسن التقاسيم,١/١٩٧.

[132] ل, ٨٦.

کران، بە دڵنیاییەوە دەشێ بڵێین تەواوترین زانیاریی سەبارەت بە میافارقین لە کتێبی **تاريخ الفارقي** بەرهەمی بایەخداری ئیبنو ئەزرەق (لە دوای ٥٧٧ ك.م) کە بۆخۆی خەڵکی ئەو شارەیە، دەستەبەر دەکرێ. وەك ئەو نووسەرە بۆمان باس دەکا شارەکە شوورەیەکی گرینگ و گەورەی هەبووە کە تێکڕای فەرمانڕەواکان گرینگییان پێداوەو چەند دەروازەیەکی هەبووە کە لە مەودای نێوان دەروازەکان دا چەند تاوە رێکی پارێزگاریی و بەرگریی دروست کرابوون.

ئەبولفیدا لە سەدەی هەشتەم دا سەبارەت بەو شارە دەنووسێ کە لە شاری حومات بچووکترەو لە باکووری شارەکە چیایەك هەیەو ڕووبارێك لە ئاوی حەنبووس کە سەرچاوەیەکە لە باکوری ڕۆژئاوای شار هەڵدەقوڵێ و لە ماڵەکانی شار تێدەپەڕێ.[133] ئەو شارە ئێستا ناوی " سلیوان "ەو ئەو ناوە لە ناوی تیرەیەکی کوردەکان کە بە سلیوانیی ناسراون، وەرگیراوە، ئەو ناوە لە بنەڕەت دا سولەیمانییە بووە. چونکە کوردەکانی ئەو ناوچەیە بە سلێمان دەڵێن: سلیوان یان سلیڤان.[134]

**١-١-٢-٣- ماردین:** ئەو شارە لە نێوان ڕەئسولعەین و نووسەیبین دایەو قەڵای جەنگیی ماردین کە قەڵایەکی گەورەو تایبەتی شەڕە لە باکووری ئەوانە. لە سەدەی چوارەم دا ئەو قەڵایە ناوی " باز "بوو کە لە سەر بەرزایی لووتکەی چیایەك دروست کرابوو و گوندێکی گەورە لە باشووری ئەو قەڵایە بوو.[135] بە ووتەی ئیستەخریی لە نزیکی نوسەیبین و لە پێدەشتەوە تا سەر لووتکەی کێوەکە، بەرزاییەکەی دوو فەرسەخەو لە سەر بەرزاییەکەش قەڵایەکی قایم و

---

133 تقويم البلدان, ٣١٣

134 ئەمین زەکی بەگ: تاريخ الدول والامارت الكردية في العهدالاسلامى, ٢٧٣.

135 لسرنج, ١٠٣

پتەو هەیەو ماری مەترسیداری کوشندەی لێیەو هەروەها گەوهەری بلوورینی تێدایە.[١٣٦] ئیبنوحەوقەل وێڕای دووبارەکردنەوەی وتەکانی ئیستەخریی، زیاتر درێژە بە باسەکە دەداو دەڵێ: قەڵای حەمدانی کوڕی حەسەن کە ناوی قەڵای "بازی ئەشهەب"ە لە سەر لووتکەی کێوەکەیە.[١٣٧] لە سەردەمی یاقووت لە ساڵی ٦٣٢ ك.م دا شاری ماردین رووبەرێکی فراوانی هەبوو و چەندین بازاڕو قوتابخانەو خانەقاو میوانخانەی تێدا دروست کرابوو و خانووی ماڵەکانی شار لە شێوەی پەیژە لە پشت یەکتر بە ریز درست کرابوون. بە جۆرێك هەر ماڵێك بە سەرماڵەکەی تری دا دەڕوانی و عەمباراوێکی هەبوو کە بەئاوی باران پڕ دەبۆوە.[١٣٨] ئەو شارە ئێستا یەکێك لە شارە جوانەکانی کوردستانی تورکییەیە.

ئەم شارە زێدی کەونارای کوردەکان بووەو کوردە مەڕوانییەکان نزیکەی سەدەیەك فەرمانڕەوایەتیی ئەو شارە یان کردووە. سەرەڕای پەککەوتنی دەسەڵاتی ئەو زنجیرە مەڕوانییە بە دستی ئیبنوجوهەیر سەرداری مەلیکشا، کوردەکانی ئەو ناوچەیە لەبرەو نەکەوتن و هەروەك پێشوو مۆرەیەکی گرینگی گۆڕەپانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ناوچەکە بوون و لە دژی ئەو میرە کە بەرکیاروق کردبووی بە دەسەڵاتداری ماردین، راپەڕین و تێکڕای ناوچەکەیان شڵەژاند.[١٣٩] جیا لەو شارو ناوچانە کە باس کران، جوگراف نووسەکان باسی ناوچەیەکی تریان کردووە کە دەکەوێتە نێوان چیاکانی ئەرمەنستان و ئازە

---

136 المسالك والممالك, ٧٦.

137 صورةالارض, ١٩٤.

138 معجم البلدان, ٤٦/٥.

139 ئیبنوئەسیر , الكامل, ٥١٠/٨, شەمیسانی, مدينه ماردين...., ١٣٣.

ربایجان و دیاربەکرو موسڵ کە ناوچەی زۆزان بووەو وێڕای ئەرمەنییەکان چەندین تیرەو هۆزی کوردیش [١٤٠] لەو ناوچەیە ژیاون و ئەردۆمۆشت لە دامێنی چیای جوودی کە دوو ناوی تریشی هەبووە(زەعفەران وکەواشی)، یەکێك لە بە ناوبانگترین قەڵاکانی ئەو ناوچەیە بووە. [١٤١]

جوانترین کۆتایی بۆ ئەم بەشە چەند نەخشەیەکە کە لە لایەن جوگرافیزانە موسڵمانەکان ئامادە کراوە. دەشێ ئەم نەخشانە بۆ شارەزابوون لەو ئاڵوگۆڕانەی بە درێژایی مێژوو بە سەر نەخشەی جەزیرە دا هاتوون، کەڵکیان هەبێ و هەروەها بۆ دیاریکردنی شوێنی شارە جۆراوجۆرەکانی ناوچەکە سوودیان هەیە. ئاخرین و نوێترین نەخشە کە لە سەر بنەمای دیاریکردنی سەر زەوی و دەڤەری نێوان دوو رووباری دەجلەو فورات گەڵاڵە کراوە، نەك لە ژێر تیشکی قەڵەمڕەوی جوگرافیایی جەزیرە، لە لایەن گرووپی جوگرافیای ناوەندی دائرەالمعارف ی ئیسلامیی، بۆ جەزیرە ئامادە کراوە. ئەو گرووپە هەر لە سەر ئەو بنەمایە کە باس کرا، ناوچەکانی سەر بە موسڵیان لە قەڵەمڕەوی جوگرافیی جەزیرە بردۆتە دەرە وە کە ئەو ناوچانە بەشێکی دانەبڕاو بوون لە هەرێمی جەزیرە. لە سەر بنەمای ئەو خاڵانە کە لەم باسەدا روون کرانەوە، نووسەر کەموکورتییەکانی نەخشەکەی چاك کردووەو لە سەر بنەمای بەڵگە مێژووییەکان چاکسازیی لە نەخشەکەدا کردووەو وەك نەخشەی پێشنیارکراو بۆ هەرێمی جەزیرە، خستوویەتیە بەر دیدی هەمووان، بۆ ئەوەی بکەوێتە ژێر تیشکی لێوردبوونەوە.

[140] بەغدادی, مراصدالاطلاع علي اسامي الامكنة والبقاع, ٦٧٦/٢.
[141] همو,١١٨٤/٣.

خارطة رقم ٢٨

صورة الجزيرة

للجيهاني (من جغرافيي القرن الرابع الهجري، القرن العاشر الميلادي)

سوسه ، نقشه ی شماره ی ٢٨ منطقه‌ی جزیره از دیدگاه جیهانی




سوسه نقشه ی شماره ی ١٤ منطقه‌ی جزیره از دیدگاه بلخی



سوسه نقشه ی شماره ی ٣٤ منطقەی جزیره از دیدگاه ابن سعید مغربی

**بەندی دووهەم: کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی سەلجووقییەکاندا ٤٤٧–٥٢١ کۆچیی**

لە نیوەییەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچیی دا تۆ هۆزی غۆزەکان لە رۆژهەڵاتی ئێران، سەریان هەڵدا کە هەرچەندە هێزو دەسەڵاتەکانی ئەو کاتە لە سەرەتاوە هەستیان بە رادەی گرینگیی و مەترسیی هێزی ئەو هۆزانە نەکردبوو، بەرە بەرە بەرەو بەرزایی دەسەڵات سەردەکەوتن و زنجیرەیەکیان هۆنییەوە کە ناویان وەك مەلەوانی ئەو بوارە لە گرینگترین ئەنتیکەخانەی ئەنتاکییەدا تۆمار کرا.

کوڕانی "سەلجووق"ی کوڕی دوقاق دوای تێکشکاندنی دەسەڵاتی غەزنەوییەکان، و پاش پتەو کردنی پایەی دەسەڵاتی خۆیان، بەرەو رۆژئاوا ملیان ناو چنگوڕکیان لە چنگی ئیمپراتۆری گەورەی رۆم گیر کرد. تورکمەنە عیراقییەکان[١٤٢] چەند ساڵێك بەر لە پێشڕەوی کوڕانی سەلجووق وەك ئەوە کە بیانەوێ پێشەوبڕیان بدەنەوە، پێشیان کەوتبوونەوەو ماوەیەك ئاژاوەیان لە ناوچەکانی رۆژئاوا خستبوو و لە گێژاویی قەیراندا قەتیسیان کردبوو. هەر لەگەڵ پێشڕەویی نەوەکانی سەلجووق بەرەو رۆژئاوا ئەو تورکمەنانە لە بەریان هەڵاتن و لە جاران زیاتر سەرەڕێژەیان کردە ناو ئێران و جەزیرەو عێراق و بە سیڕەی سمی ئەسپەکانیان و زرینگ و هوڕی شمشێرەکانیان خەڵکی ناوچەکەیان غافڵگیر کرد. گەیشتنی توغرول بۆ ناو دارالخلافەی بەغدا لە ساڵی

---

[142] ئەو تورکمەنانە پەیڕەوی ئەرسەلان ئیسرائیل بوون کە مامی توغرول بوو و دوای دەستگیرکرانی لە لایەن مەحمود غەزنەویی لە ساڵی ٤١٨ ك, دا, پەرتەوازە بوون و بە هۆی ئەوە کە گرووپێکی ئەو تورکمەنانە رۆیشتنە ناو رۆژاوای ئێران کە لە سەرەتاکانی مێژووی قۆناغی ئیسلامی دا پێی دەگوترا عیراقی عەجەم, بە ((تورکمەنە عیراقییەکان)) ناوبانگیان بڵاو بۆوە. (نك: باسورث , ((ایران شرقی...)), تاریخ ایران, پژوهش کمبریج, ٥/ ٤٧)

٤٤٧ ك.م داو رازیبوون و پەسندکردنی دەسەڵاتەکەی لەلایەن خەلیفەی عەبباسیی القادربالله کە سەرچاوەی رەوایی دان بە فەرمانڕەوایانی سوننی بوو، بە سەرەتاو دەسپێکی ئیمپراتۆری گەورەی سەلجووقیی هەژمار دەکرێ و بە هۆی ئەوە کە سەلجووقییەکان لەو پێناوەدا ململانێ و کەڵەوەکێشیی زۆریان لەگەڵ دەسەڵاتە دیارەکانی ناوچەی جەزیرە دا کردبوو کە بابەتی سەرەکی توێژینەوەکەی ئێمەیەو دەوڵەتی کوردی بەنی مەڕوان —کە بەدەسەڵات ترین وبەهێزترین ی ئەو بنەماڵانە بوون جڵەوی فەرمانڕەوایی بەشێکی جەزیرەیان لە بەر دەستدا بوو— دواتر هەر لە لایەن ئەو سەلجووقییانەوە شکستی پێ هاتبوو، ناچارین کەمێك بگەڕێینەوە دواوەو توغرول و لەشکرەکەی بۆ بەغدابییەکان لێگەڕێین و گوڵدانی توێژینەوەکەمان بە چەپکێ گوڵی گوڵستانی مێژووی هێژای ئەو بنەماڵە بە هێزە تا سەردەمی دەستڕاگەیشتنی سەلجووقییەکان بە سەر بەغدا دا بڕازێنینەوە.

**١- ٢- ١- مێژووی مەڕوانییەکان لە سەرەتاوە تا کاتی دەسەڵاتی سەلجووقییەکانبەسەربەغدادا**

"ئەبووعبدالله حەسەن کوڕی دۆستەکی حاربەختی" ناسراو بە "باز" فەرماندەی کوردە حەمیدییەکان بوو و لەساڵی ٣٧٦ ك دا کاتێك موسڵ کەوتە بن دەستی سوڵتان "بووەیهیی"، عضدالدولەی دەیلەمیی، پاڵی وەنابراو داو رەگەڵی کەوت. دوای ماوەیەك کاتێك هەستی بەوە کرد کە "عەزودودەولە" لە هێزو دە سەڵاتەکەی دەترسێ ، رایکردو دوای مردنی "عەزودودەولە" لە ساڵی٣٧٢ ك.م دا شارەکانی ئەررەجیش و میافارقین و ئامێدیی خستە ژێر

چمك و چۆكی خۆیەوەو خۆی كردە پاشای ناوچەكە.[١٤٣] ساڵێك دواتر موسڵ یشی خستە ژێر ركێفی خۆی و خۆی بۆ هێرش بردنە سەر بەغدا تەیار كرد و دوای ئەوە كە توانی چەند جارێك لەشكری "صمصام الدولة" تێكبشكێنێ، دەسەڵاتداری بەغدا سوڵتان "بوەیهی" ناچار بوو لە ساڵی ٣٧٤ ك.م دا دەستی ئاشتی بۆ درێژ بكات.[١٤٤] بە هۆی ئەوە كە دیسان هێزو دەسەڵاتی هەر لە گەشەو هەڵچوون دابوو، الطائع خەلیفەی عەبباسیی سوپایەكی بە گژداكردو براكەی لە بەرامبەر ئەو سوپایەدا بەچۆكداهات و كوژرا.[١٤٥] سەرەنجام "باز" یش لە كاتی شەڕی حەمدانییەكاندا[١٤٦] لە ئەسپەكەی كەوتە خوارەوەو بە دەستی سەربازێكی عەرەب كوژراو ئەبووعەلی كە خوارزای بوو سوپا تێكشكاوەكەی كۆ كردەوەو گەڕایەوە ناو سنووری قەڵەمڕەوی"باز".[١٤٧]

143 ئیبنو ئەزرەق, ٥١-٥٢, ئیبنوئەسیر الكامل, ٧/ ٤٠٢-٤٠٣. Hillenbrand "Marwanids" EI2. V VT < p626

144 ئیبنو ئەسیر,الكامل, ٧/ ٤٠٥. ابن عبری, ٢٤١. صائغ ١/ ١٢٧.

145 ابن قلانسی,٥٤, ابن ازرق, ٥٦-٥٧. ئیبنوئەسیر الكامل, ٤٢٠/٧.

146 حەمدانییەكان لە تیرەی عەرەبی بەنی تەغلیب بوون و حەمدانی كوڕی حەمدوون دامەزرێنەری دەوڵەتەكەیان بووەو كوڕەكانی سنووری قەڵەمڕەوی حەمدانییەكاینان فراوانتر كرد. ململانێ لە گەڵ "ئالی بوویە" دەسەڵاتی حەمدانییەكانی لاواز كردو سەرەنجام عەرەبە بەنی عوقەیلییەكان موسڵی پێتەختی دەسەڵاتەكەیان لە دست دەرهێنان. بەڵام لە هەمان كات دا چەند لقێكی لاوەكانیان لە شام هەر مانەوە.) ((سلسلەهای اسلامی جدید و هەروەها كتێبی "دولت حمدانیان")) (مەڕوانی كوڕی لەكەكەك ی حاربەختیی: ئاشەوانێك بوو هاوكات لە گەڵ پیشەكەی دا, كوێخایەتیی گوندەكەی خۆیانی دەكرد كە ناو گوندەكە "كرماس" بوو و لە نێوان "ئەسعرد و مەعدن دابوو و خوشكی "باز"ی كردە هاوسەری خۆی و ئەو زنجیرەی كە ئەبوعەلی كوڕی بنیاتی نا, لە ناوی ئەو مەڕوانەوە بە زنجیرەی ((مەڕوانیان )) ناودێر كرا. ((ئیبنو ئەزرەق ٥٩-٦٠))

147 درێژەی باسەكەلە: ابن ازرق,٥٧-٥٨. ابن اتیر الكامل ٧/٤٣٤-٤٣٥, صائغ, ١/١٢٩-١٣٠.

**ئەبووعەلی حەسەن کوڕی مەڕوان (٣٨٠-٣٨٧ ك):**

ئەبووعەلی هەرکە گەڕایەوە قەڵەمڕەوی باز هاوسەرەکەی"باز" ی کردە هاوسەری خۆی و دەستی بە سەر هەموو موڵك وماڵ و داراییەکەی داگرت و لە مەودای دوو شەڕی خوێناویی دا توانی قاتڵەکانی خاڵی تێکبشکێنێ.[148] لە ساڵی ٣٨٢ ك دا پاشای رۆمی ناچار کرد بۆ ماوەی دە ساڵ شەڕ رابگرێ و[149] هەر بە سەقامگیربوونی بارودۆخی قەڵەمڕەوی ژێر دەسەڵاتی خۆی، هەوڵیدا پێوەندیی لە گەڵ هاوسێکانی پەرە پێ بدا. هەر بەو مەبەستە لە ٣٨٧ ك دا، چەند کەسێکی ناردە خوازبێنیی ست الناس ی کچی میر سەعدوددەولەی حەمدانی و هەر کە وەڵامی رەزامەندیی وەرگرتەوەو کچەکەیان پێدا، خەریکی خۆریکخستن و سازدانی ئاهەنگی زەماوەند بوو.

میر ئەبوو عەلی حەسەن چەند کەسێکی لە بنەماڵەکی خۆی رەوانەی حەڵەب کرد بە مەبەستی گواستنەوەی کیژە میران و بۆخۆشی بۆ وەرێخستنی ئاهەنگی بووکێ بەرەو ئامێد رۆیشت. بەڵام لەوێ خافڵ لە (کێشەکانی عیشق)! کەوتە داوی پیلانی لە ناکاوی "عەبدولبیر"ی شێخی ئامێدو "ئەبوتاهیری کوڕی دەمەنە" یەکێك لە گەورە دەسەڵاتدارانی شارو گیانی لەو پیلانەدابوو بە قوربانیی و بنەماڵەکەی کەژاوەی بووکی بێبەختیان بادایەوەو بەرەو ماڵی باوانیان گێڕایەوەو خاکی ئەرزەنیان هەڵدایەوەو زاوای بێ مراد بۆ هەمیشە لەوێدا سەری نایەوە.[150]

---

[148] ابن ازرق, ٦٠, بۆ درێژەی ئەم باسە بروانە( نك:ئینوئەسیر,الکامل ٧/ ٤٣٥

[149] ابن ازرق, ٦١, ابن عبری, ٢٤٩.

[150] بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: ابن ازرق, ٧٢-٧٧.

**"ئەبووسەعید مەنسوور" مومەههیدوددە ولە ٣٨٧– ٤٠٢ ك.م:** ناوبراو لە کاتی کوژرانی ئەبووعەلی برای دا، مەزنی میافارقین بوو و دوای کوژرانی بوو بە جێنشینی و خێرا پەیمانی لە خەڵك وەرگرت. وارشی شاری میافارقین ی نۆژەنکردەوەو ناوی خۆی لە سەر تۆمار کرد. ئەو "ست الناس"ەی کرد بە هاوسەری خۆی کە براکەی لە پێناویدا گیانی دا، و کەسێکی بە ناوی شرِوە کردە رازگرو دەرگاوانی بارەگای دەوڵەتەکەی. هاوکات لەگەڵ میرایەتیی خۆی ئیبنودەمەنە بوو بە فەرمانڕەوای ئامێد.[١٥١] حکوومەتەکەی "مومەههیدوددەولە" دەولەتێکی تەمەن کورت بوو و لە ساڵی ٤٠٢ ك.م دا بە دنەدانی خزمەتکارێکی شرِوە بە ناوی "ئیبنوفەلیوس"، دوای ئێوارەخوانیك کە لە قەڵای هەتتاخ بنکەی فەرمانڕەوایی شرِوە لە نزیکی دیاربەکر ئامادەکرابوو، مومەههیدوددەولە بە دەستی شرِوەو خزمەتکارەکەی کوژراو شرِوە دوای رووداوەکە لە تاریکەشەودا خۆی گەیاندە میافارقین و دەستی بە سەر شاردا گرت.[١٥٢]

**نەسروددەولە ئەبونەسر ئەحمەد کوڕی مەڕوان (٤٠٢– ٤٥٣ ك.م):** "نەسروددەولە" گەورەترین و بەنێوبانگترین فەرمانڕەوای مەڕوانییە. مومەههیدوددەولە لە سەردەمی خۆی دا بە هۆی خەونێکەوە هەستی بە مەترسیی هێزو دەسەڵاتی براکەی کردو دووری خستەوە بۆ ئەسعرد و بەم جۆرە ئەبوونەسر لە تەواوی ماوەی حکوومەتی مومەههیدوددەولە دا، براکەی

151 همو, ٨٠-٨٢.

152 ابناثیر, الکامل, ٤٢٧/٧, عزالدین ابن شداد ٣٣٦/٣-٣٣٩, بۆ درێژەی باسەکە بڕوانە(نك: ابن ازرق, ٨٧-٩١.

خۆی نەبینی.[١٥٣] لە لایەکی تریشەوە شڕوە بە پتەوکردنی پایەکانی دەسەڵاتی خۆی، تێکڕای قەڵەمڕەوی مومەهیدوددەولەی خستە ژێر رکێفی خۆی. بێجگە لە ئەرزەن کە هەر لە سەردەمی ئەبووعەلی حەسەن (٣٨٠تا٣٨٧) لە ژێر دەسەڵاتی خواجە ئەبولقاسم دا بوو کە پیاوێکی زیت و زۆرزان و وردبین بوو.

شڕوە دوای رێکخستنی کاروبارەکان، کۆمەڵەسەربازێکی کارامەی رەوانەی پێوشوێنی ئەبوونەسر کرد. بەڵام خواجە دەستپێشخەری کردو ئەبوونەسری بۆ ئەرزەن بانگهێشت کردو دەستی پەیمان و وەفاداریی خستە مست وهەردووکیان بەهاوبەشیی و هاوشانییەکتر هێرشیان کردە سەر میافارقین و شڕوەیان بە تەواویی شڕو شپڕێو و شکستخواردوو کرد[١٥٤] سەرەنجام بە هۆی سەرهەڵدان و شۆرشی فارقیەکان، توانیان دەست بە سەر شار دابگرن و ئەبوونەسر، خواجە ئەبولقاسمی کرد بە وەزیرو دوای ماوەیەك دەستی گەیشتە شروەو لە قەڵای هەتتاخ هەر لە شوێنی کوژرانی براکەی، بکوژەکەی بە تاوانی سزای خۆی گەیاندو کوڕی "دەمەنە"ش هەروەك سەردەمی مومەهیدوددەولە، دانی بە دەسەڵاتەکەی داهێناو وەك فەرمانڕەوای ئامێد لە سەر کورسی دەسەڵات مایەوە.[١٥٥]

نوێنەرانی القادربالڵەی عەبباسی کە بریتی بوون لە: بهاء الدولە بوەیهی، الحاکم فاتیمی، هەروەها پاشای رۆم لە ساڵی ٤٠٣ ك.م دا بۆ بەشداریکردنی ئاهەنگی بە ناو ودەنگی جێژنی قوربان لە بارەگاکەی بوونە میوان و خەلیفەی

---

[153] ابن ازرق ٩١.

[154] همو, ٩٣-٩٥, عزالدین ابن شداد, ٣٤١/٣-٣٤٣. ابوالفدا ١٣٣/٢-١٣٤.

[155] ابن ازرق , ٩٦-١٠٢. هەروەها نك: عزالدین ابن شداد, ٣/ ٣٤٨.

عەبباسی نازناوی "نەسروددەولە"ی پێبەخشی و خەلیفەی فاتمیش نازناوی "عیزوددەولە"ی پێدا.[١٥٦]

ئەبونەسر بە هۆی بە دەستەوەگرتنی جڵەوی دەسەڵاتی ئامێد لە ساڵی ٤١٥ ی کۆچیی دا، نێوبانگی زیاتر دەنگی دایەوەو بوو بە فەرمانڕەوای بێ ئەملاوئەولای دیاربەکر. ئەبوعەبدوڵڵا بن سەلەمەی مالیکیی کردە قازی شارو ناوبراو هەرمانگەو کاری قەزاوەتییەکێك لەو دوو شارەی رادەپەڕاند".[١٥٧]

نەسروددەولە لە ساڵی ٤١٦ ك.م دا روهای خستە بن دەستی خۆی[١٥٨] ساڵێك دواتر لە ٤١٧ ك.م دا سوپای بەرەو نووسەیبین وەڕێخست و دوای تێپەڕینی ساڵێك ئەو شارەشی گرت[١٥٩] پاشان کاتێك کوڕانی عوقەیل کە فەرمانڕەوای شاری موسڵ بوون و سەرەڕای هەوڵ و هەرایەکی زۆر نەیانتوانی شارەکەیان لە دەست دەربێننەوە، لە کاتی چوونی بەدرانی کوڕی موقەللیدی عوقەیلی بۆ بارەگای نەسروددەولە، لە میافارقین لەساڵی٤٢١ك دا،جڵەوی دەسەڵاتی شارەکەی دایەوە دەستی.[١٦٠] دوابەدوای دەستدرێژیی ئەرمەنییەکان بۆ سەر سنووری وڵاتی موسڵمانان لە ساڵی ٤٢٣ ك.م دا، لەشکرێکی بۆ رووبەڕووبوونەوەیان رەوانەی ئەرمەنستان کردو تووشی شکستێکی سەرشۆڕانەی کردن.[١٦١] لە ساڵی ٤٢٦ ك.م دا هەڕەشەی لە ئیمپڕاتۆری رۆم کرد چونکە پەیمانی ئاشتی پێشێل کردبوو و خۆی بۆ هێرشبردنە سەر ئەو

---

156 بۆ زانینی درێژەی ئەو ئاهەنگە شکۆدارە(نك: ابن ازرق, ١٠٨-١١٠.

157 درێژەی بابەتەکە لە: (نك:همو ١٢٤-١٢٨.

158 ئیبنوئەسیر الکامل,٧/٧٣٠.

159 همو,٧٠٥/٥. عزالدین ابن شداد, ٣/ ١٣٠.

160 ئیبنوئەسیر, الکامل٧/ ٧٣٠.

161 همو, ٧٥٥/٧.

وڵاتە تەیار کرد کە بە هۆی پاساوهێنانەوەو داوای لێبوردن و ڕێوشوێنە ئەمنییەکانی ئیمپڕاتۆر، نەسرودەوله خاو بۆوەو وازی لە بڕیارەکەی هێنا.[١٦٢] ساڵێك دواتر ویستی هێرش بکاتە سەر سەناسینە.[١٦٣] چونکە هەڵیانکوتابۆ سەر کاروانی حاجییەکان لە دەوروبەری خەلات. بەڵام بە هۆی گرەنتیی و زەمانەتی پاشای سەناسینەو گێڕانەوەی دارایی کاروانچییەکان و ئازاد کردنی دیلەکان و لە بەر چڕوچەتوونی چیاکانی قەڵەمڕەوی دوژمن، ناچار بوو مل بۆ ویستی ئاشتیخوازانەی پاشای سەناسینە بدات.[١٦٤] لەشکرە تەیارو راسپێراوەکەی لە ئاخرین ڕۆژەکانی ئەو ساڵەدا شاری خۆڕاگرو قایمی سووە یدایان لە ژێر چنگی ڕۆمییەکان دەرێناو دوای گەمارۆی رووها ئەو شارەی بەردەست کردو سەری بڕاوی سەدوشەست کوژراوی ڕۆمی ڕەوانەی بارەگای نەسرودەوله کرد لە میافارقین.[١٦٥] بەم جۆرەو بەو تاکتیکە جۆراوجۆرانە توانی درێژە بە پرۆژەو سیاسەتی بنەڕەتیی خۆی بدات کە بریتی بوو لە دابینکردنی هێمنایەتیی و ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی لە چوارچێوەی سنووری قەڵەمڕەوەکەی دا و بە کردەوە بەرنامەو پلانەکانی پیادە بکات و بە تەمێ کردنی ئەرمەنیی و ڕۆمییەکان ئاسایش و هێمنایەتییەکی تەواو بە سەر سنوورەکان دا سێبەری کرد.

لە ساڵی ٤٣٠ ك.م دا بە فەرمانی فەرمانڕەوای حەرران و روها "ئیبنو وەسسابی نومەیریی"، ناوی فاتمییەکانی لە خوتبەدا قەدەغە کردو فەرمانی دا کە

---

[162] همو ٧/ ٧٧٠.

[163] (سەناسینە گرووپێکی ئەرمەنییەکان بوون کە فەرمانڕەوایی چەند قەڵایەکی قایمیان بە دەستەوە بوو لە سنوورەکانی خەلات و لە گەل فەرمانڕەوای خەلات لە حاڵەتی ئاشتیی دابوون. ((الکامل)), ٧٧٧/٧.

[164] ئیبنو ئەسیر الکامل, ٧٧٧/٧.

[165] همو, ٧/ ٧٧٦.

خوتبە بە ناوی عەبباسییەکانەوە بخوێندرێتەوە.[١٦٦] هەر لەو ساڵەدا یەکێك لە گەورەپیاوانی موسڵ بە ناوی موحەممەد کوڕی جەهیربە هۆی ئەوە کە لەو شارەدا لەتەنگانەدا بووو هانای بردە بەر بارەگای نەسرووددەولەو پاش ماوەیەك نازناوی "کافی الدولە"ی پێبەخشی و کردی بە وەزیری خۆی.[١٦٧]

غۆزە عێراقییەکان[١٦٨] کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ ئاژاوەیان خستبۆ ناوچەکانی ئازەربایجان و رۆژئاوای ئێران، لە کاتی سەرکەوتنی چارەنووسسازی سەلجووقییەکان بەسەر سوڵتان مەحموودی غەزنەویی لە شەڕی "دەندانەقان"داو هاوکات لە گەڵ پێشڤەچوونی سوپای سەلجووقییەکان بەرەو لای رۆژئاوا، بەرەبەرە لە پێشیان هەڵاتن و رژانە ناو خاکی عێراقەوە.

لە ساڵی ٤٣٢ ك.م دا هێندێك لەو غۆزانە لە ژێر فەرماندەیی مەنسووری کوڕی "غوزاوغەلی"، روویان کردە جەزیرەی ئیبنوعومەر. ئەبوحەرب سولەیمان کوڕی نەسر کە بە نوێنەرایەتی باوکی بە سەر شارەکە رادەگەیشت، پیلانێکی بۆ دارشتن و پێشنیاری بە مەنسووری فەرماندە کرد کە زستان لە جەزیرە بمێنێتەوەو لە وەرزی بەهاردا هێرش بەرنە سەر شام و ئەویش بەو پێشنیارە رازی بوو و کەوتە داو و خۆی و گەورە سەردارانی تری غۆز لە میوانداریيەك دا دەستگیر کران و پاشماوەی غۆزەکانیتریش لە جەزیرەدا پەرتەوازە بوون و دوای تاڵانکردنی شەنگارو نووسەیبین، جارێکی تر بەرەو جەزیرەی ئیبنوعومەر ملیان لێ نایەوە. نەسرووددەولە کە نەیدەویست گیانی سەربازەکانی لە شەڕی ئەوان دا بە فیڕۆ بدا، دەرگای وتووێژی بۆ کردنەوەو لە بەرامبەر کشانەوە یان

---

[166] همو, ٧/ ٧٩١.

[167] ئیبنوخەلەکان, ٥/١٢٧ -١٢٨. بۆ درێژەی باسەکە بڕوانە: ابن ازرق, ١٤٧ -١٥١.

[168] نك: بڕوانە سەرەتای ئەم بەشە.

لەو ناوچەدا پەیمانی ئاشتیی لە گەڵ بەستن و مەنسووری فەرمانڕەوای بۆ ئازاد کردن. بەڵام غۆزەکان خیانەتیان کرد و دەستیان کردەوە بە تالان و بڕۆ لە ناوچەکەدا.[١٦٩]

توغرول بەگ لە ساڵیٚ ٤٣٤ ك دا ناوچەی دیاربەکری کردە دیاریی بۆ "بوقا"و " ناسغەلی " و سوپایەکی بە سەرکردایەتیی ئەو دوو سەردارەی خۆی، ڕەوانەی ناوچەکە کرد. ئەوان هێند دەخۆڕادیو بوون و بە ڕادەیەك متمانەیان بە سەرکەوتنی خۆیان هەبوو کە ئامادە نەبوون بە پێشنیاری نەسرودەولە ڕازیی بن و لە بەرامبەر ٥٠٠٠٠ دیناردا، پاشەکشە لە ناوچەکە بکەن.[١٧٠]

بەڵام شەوێك بە مەستیی بەربوونە گیانییەکترو یەکتریان کوشت! نەسرودەولە هەر بە بیستنی هەواڵی مەرگیان بە دڵ و گیان هەڵیکوتایە سەر سوپاکەیان و زۆر بە توندیی تێکی شکاندو یەکەمین سەرهەڵدان و دەرکەوتنی تورکەکانی لە ناوچەی دیاربەکر گێڕایەوە دواوە.[١٧١] بەڵام گوشاری لە ڕادەبەدەری سەربازانی توغرول لە ساڵی ٤٤١ ك دا، نەسرودەولەی ناچار کرد کە لە شاری دیاربەکر خوتبە بە ناوی ئەو سوڵتانە سەلجووقییە بخوێندرێتەوە.[١٧٢]

نێوبانگی جوامێریی و مێرخاسیی و تواناو دەسەڵاتی نەسرودەولە بە ڕادەیەك دەنگی دابۆوە کە هەر لەو ساڵەدا لە سەر داوای قوستەنتینی دەیەم

---

[169] ابن اثیر الکامل, ٧٢٢/٧. ئەمین زەکی بەگ:خلاصة تاریخ الکرد....,١٤٨.

[170] (سیاسەتی ئەو بەو جۆرە بوو کە دارایی دەکردە قوربانیی لە پێناو دەسەڵاتەکەی دا نەك دەسەڵاتەکەی فیدای دارایی بکات و ئەگەریش بە هێزی سەربازیی نەیتوانیبا بەرەوڕووی نەیارەکانی ببێتەوە یان بەرژەوەندیی لە بواری سەربازیی دانەبا, هەوڵی دەدا بە هێزی دارایی مەترسییەکان لە خۆی دوور بخاتەوە!) نك:ابن جوزی, ٧٠/١٦.

[171] ابن ازرق ١٦٠-١٦١. قس: ئیبنوئەسیر,الکامل, ٧/ ٧٢٥.

[172] باسورث ((ایران شرقی...)), تاریخ ایران پژوهش کمبریج, ٥١/٥.

ئیمپراتۆری بیزانس سەبارەت بە ئازاد کردنی لیپارت شازادەی گورجیی، نێوبژیوانیی کردو سوڵتانی سەلجووقیش لە بەر ڕێزو پایەی نەسرودەولە بێدڵیی نەکردو بێ سێ ودوو لێکردن و بە بێ هیچ چەشنە مەرجێك، شازادەی بەدیلگیراوی ئازاد کردو قوستەنتینیش لە بەرامبەر ئەو چاکەو پیاوەتییەدا،گەلێك دیاری باییداری کردە دیاری بۆخۆی وتوغرول و ئەو مزگەوتەی مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك دروستی کردبوو، نۆژەنی کردەوەو چرای تێدا هەڵگیرساند.[١٧٣]

لە ساڵی ٤٤٦ ك.م دا بە تێپەڕینی توغروول بە قەڵەمڕەوی نەسرودەولەدا بە مەبەستی هێرشکردن بۆ ڕۆمییەکان، سوپایەکی گەورەو گرانی هاوڕێ لەگەڵ گەلێك پیتاك و دیاری خستە ژێر دستییەوە.[١٧٤] لە کاتی تێپەڕبوونی توغروول بەو دەڤەرەدا ئەبوحەرب سلیمان کوڕی نەسرودەولە فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبنوغومەر لە ململانێ و تێگگیرانی ئەو قەیرانەدا کوردە بەشنەویەکانیشی بەرەو گۆڕەپانی ململانێ پەلکێش کرد. بەڵام گڕی ئاگری قەیرانەکە بلێسەدارتر بوو و فەرمانڕەوای بەشنەویەکان بە دەستی ئەبوحەرب کوژراو سەرەنجام لە تۆلەی ئەو کارەدا بە دەستی کوڕی فەرمانڕەواکە کوژراو لە پێناوی تۆڵەسەندنەوەی ئەو برایەی دا نەسرودەولە کوڕەکەی تری کە ناوی نەسربوو، ڕەوانەی ناوچەکە کرد. ناوبراو دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر توانی ئەو کوردە بەختیی و بەشنەوی یانەی شان بە شانی سوپای قورەیشی کوڕی بەدران میری عوقەیلیی موسڵ هێرشیان بۆ سەر جەزیرە هێنابوو، تێکبشکێنێ

[173] ئیبنوئەسیر الکامل, ١٨٥/٨, ئەمین زەکی بەگ: تاریخ الدول, ١١٨-١١٩. باسورث , سلسله اسلامی جدید, ١٨٢.
[174] ابن اثیرالکامل ,١١٦/٨.

و کۆتایی بە قەیرانەکە بێنێ. بەڵام نەیتوانی دڵی کوردەکانی ناوچەکە بە خۆی خۆش کا.[١٧٥]

**١-٢-٢- کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی توغرول دا (٤٤٥-٤٤٧ ك)**

توغرول بەگ دوای تەمبێ کردنی رۆمیەکان لە ساڵی ٤٤٧ ك.م دا گەڕایەوە بۆ (رەی) و لەوێ حەزی بەردەستکردنی دارالخلافەی بەغدا لە ناخیدا سەری هەڵداو لە رەمەزانی ئەو ساڵەدا گەیشتە بەغداو دەستی بەسەرداگرت.[١٧٦]

هەر کە سوڵتان سەلجووقی جڵەوی شارەکەی بەدەستەوە گرت، ئەرسەلان بەساسیری کە بە رواڵەت پاڵپشتیی المستنصر خەلیفەی فاتمیی دەکرد، شۆرشی هەڵگیرساندو بەشێك لە کوردو عەرەبەکان رەگەڵی کەوتن و[١٧٧] سەرەنجام توانی لە ساڵی ٤٤٨ ك.م دا قورەیشی کوڕی بەدران میری عوقەیلیی و "قوتلەمیش" ی ئامۆزای توغرول لە نزیکی شەنگار، بە توندیی تێکبشکێنێ و لەوێوە بەرەو رەحەبە وە ڕێکەوت. شەنگاریەکانیش هەڵیانکوتایە سەر سوپای "قوتلەمیش" و ژمارەیەکی بەرچاویان لێ کوشتن.[١٧٨]

هەر لەو رۆژانەدا سێبەری شوومی سێزدە مانگەی دەسەڵاتی توغرول بە سەر سوپای بەغداوە تەنگی بە خەڵکی ئەو شارە هەڵچنیبوو. القائم بالله خەلیفەی بەغدا بە تیرێك دوو نیشانەی پێکاو سوڵتانی سەلجووقیی بۆ سەرکوتکردنی بەساسیریی بەڕێ کردو هەر بە رۆیشتنی ئەوان دارالخلافە گەڕایەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆی. توغرول دوای داگیرکردنی کوەیت ودامرکاندنی گڕی ئاگری

---

175 ئیبنوئەسیر الکامل, ٨/١٢٣-١٢٤.

176 ئیبنوئەسیر الکامل, ٨/١٢٥.

177 سبط ابن جوزي,٤ .

178 ئیبنوئەسیر, الکامل,٨/١٤٠. سبط ابن جوزی, ١١-١٢, ئە مین, ١٣٠.

شۆرشی عەرەبە دەشتەکییەکان لە دەوروبەری نووسەیبین، رووی کردە قەڵەمڕەوی نەسروددەولەی مەڕوانیی و چواردەوری جەزیرەی ئیبنوعومەری ئابلۆوقەدا. هاوکات لەگەڵ گەمارۆکەدا، کۆمەڵێك لە سەربازەکانی هێرشیان کردە سەر دێرێك لە نزیك شارەکە و ژمارەیەکی بەرچاویان لەو راهیبانە سەر بڕی کە لە ژێر سێبەری دەسەڵاتی ئازادو دادگەرانەی نەسروددەولەدا، بە سەربەستیی و بەبێ هیچ لەمپەرو قەدەغەو قۆرغێك دروشم و رێنماییە دینییەکانی خۆیان بە کردەوە پیادە دەکرد. دوای تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر بە سەر گەمارۆدا، ئیبنومەڕوان بە هۆی ئەوە کە توانای رووبەڕووبوونەوەی توغرولی نەبوو و لە خۆی رانەدەدی دەرۆستی بێ، وێڕای گێڕانەوەی داستانی شەڕەکانی دژی ئەرمەنی و رۆمییەکان لە پێناوی پاراستنی قەوارەو کیانی موسڵمانەکان، داوای ئاشتیی لە توغرول کرد و ئەویش قبووڵی کرد و هاوکات لەگەڵ پەسندکردنی خواستی ئاشتیخوازانەی ئیبنومەڕوان، چەندین دیاری گەورەو باییداری وەك ئەڵماسە بە نرخەکانی چیای یاقووت کە بە پارەیەکی زۆر لە ئالی بۆیەی کڕیبوون، لە لایەن ئیبنومەڕوانەوە رەوانەی بارەگای توغرول کران.[١٧٩] بەم جۆرەو بە هۆی زۆرزانیی و وردبینی نەسروددەولە سەرەڕای دەسەڵاتی توغرول بە سەر زۆربەی جەزیرەدا، ناوچەی دیاربەکر لە دەستی هێرشی تێکدەرانەی تورکەکان، بە سەلامەتیی دەرچوو.[١٨٠]

نەسروددەولە هەر لەو ساڵەدا لە سەر پێشنیاری کافی الدولە ی کوڕی جەهیر کە وەزیری خۆی بوو، قازیی ئەبوومەنسوور "شازان"ی تووسی لە دەسەڵاتی

---

[179] ئیبنوئەسیر, الكامل,٨/١٤٢-١٤٣. سبط ابن جوزی, ٥. صفدي,٨/١٧٧. ئەمین زەکی بەگ, تاريخ الدول..., ٥, ١٠٥

[180] نك: همو, ١٠٧, Hillenbrand, “Marwanids” EI2 ,V VI, p, 62

قەزاوەتی میافارقین وەلاناو ئەبولقاسم بن بەغەلی ئامێدیی لە شوێنی ئەو دانا.[١٨١]

لە کاتی پێشڕە ویی توغرول لەوساڵەدا، "قوتلەمیش" ی ئامۆزای هەلی هەڵکەتووی قۆستەوەو بە درێژیی باسی هێرشی شەنگاریەکانی کرد بۆ سەر سوپاکەی لە ساڵی پێشووتر داو سکاڵای حاڵی بێحاڵی سوپاکەی کرد لە بەرامبەر ئەو هێرشەداو سەرەنجام توانی توغرول رازی بکات بۆ پەلاماردانی شارەکە. لەشکری توغرول شەنگاری دایە بەر زەبری شمشێرو لاشەی شاری شەلاڵی خوێن کرد و سوڵتان شاری موسڵی دا بە زڕبراکەی برایم یەنال و لە ساڵی ٤٤٩ ك دا دیسان گەڕایەوە بۆ بەغدا.[١٨٢]

لە ژێر کاریگەریی ئەو هێرشە سەربازی یانەدا، ئاژاوە هەموو ناوچەکەی گرتەوەو گرانیی چنگی لە قوڕگی ژیانی ئەو دەڤەرە گیر کرد، بە جۆرێك کە نەبوونیی و قاتیی سەرانسەری جەزیرەی تەنییەوەو جەردەو چەتەکان بە کاری چەتەیی و دزیی و فزییەکانیان، بارودۆخەکەیان ئاڵۆزتر کرد. بە هۆی کەمیی خۆراك خەڵك گۆشتی مردارەوەبوویان خواردو ئەوەش بوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی پەتایەکی کوشندە لە ناوچەکەدا کە مەککەو لای چیاکانیشی گرتەوەو تەنانەت گەیشتە خوراسان و خەڵکێکی زۆر بە تایبەتیی لە ناوچەی جەزیرە گیانیان لە دەست دا.[١٨٣]

ئیبراهیم یەنال کە بە نوێنەرایەتی توغرول بە سەر موسڵ رادەگەیشت، دوای چەند مانگ شۆرشێکی وەڕێخست و بەرەو ویلایەتی جیبال وەڕێ کەوت و

---

[181] ابن ازرق, ١٧٥.

[182] ابن قلانسی,١٤٥. ئیبنوئەسیر,الکامل,١٤٤/٨. هەروەها نك:ابن وردی,٥٣٩/١.

[183] ابن جوزی, ٥/١٦.

هەرچەندە توغرول هەر لە رێگەدا پەشیمانی کردەوە بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو و هەر لە گەڵ دەرچوونی لە موسڵ، بەساسیریی کەلکی لەو دەرفەتە وەرگرت و لە ساڵی ٤٥٠ ك دا دەستی بە سەر موسڵ داگرت و گرووپێك لەو سەربازانەی کە دە یانەویست بەرەنگاری ببنەوە، لە ناو قەڵای شارەکەدا گەمارۆی دان و دوای تێپەڕینی چوار مانگ بە سەر ئەو ئابلۆوقەدا برسیەتیی برستی لێ بڕین و ناچار بوون گۆشتی ئەسپەکانیان دەخوارد. ابولهیجا فەرمانڕەوای شاری هەولێر نێوبژیوانیی کردو بەڵێنیی لە بەساسیریی وەرگرت کە گیانی سەربازە گەمارۆدراوەکان بپارێزێ و بە چۆلکردنی قەڵاکە، بەساسیریی بە تەواویی وێرانی کردو کەوتە ژێر رکێفی خۆی.[١٨٤] ناوبراو دوای دەست بەسەراگرتنی قەڵاکە، خوتبەی بە ناوی المستنصری فاتیمیی دەخوێندەوەو پاش ماوەیەك بەیعەتی بە نوێنەرەکەی دا لە شاری موسڵ.[١٨٥]

هەر لە سەروبەندی ئەو ئاڵ و گۆڕانەدا، توغرول بە مەبەستی سەرکوتی بەساسیریی سوپای بەرەو موسڵ بەڕێ کرد. بەڵام کە گەیشتە شار هیچ رکابەرێکی لە بەرامبەر خۆی دا نەبینی و خەڵکی موسڵیش لە ترسی گیانی خۆیان شارەکەیان چۆل کردبوو و خۆیان لە چیاکانی دە وروبەری موسڵ حەشار دابوو. سوڵتان بە مەبەستی راوەدوونانی بەساسیریی بەرەو نووسەیبین رۆیشت، بەڵام سەرلەنوێ یاخیبوونەوەی ئیبراهیم یەنال و گرینگیی کۆتایی هێنان بە گێچەڵەکانی ناوبراو، ناچاری کرد بەرەو هەمەدان لادات.[١٨٦]

[184] ابن اثير الكامل, ١٥٢/٨.

[185] سبط ابن جوزي,٦.

[186] ابن اثير الكامل, ١٥٢/٨. سبط ابن جوزى, ٣١.

پێشتر باسی ئەوە کرا کە ئەو هێرشانە چ بەڵایەکی بە سەر ناوچەکە هێنا. ئەوجارە کارەساتە سرووشتیەکانیش بوونە سەرباری دەردان و ئەو ئاوەدانییە کەمەش کە لە ژێر پێی ئەسپ و سوپاکان رزگاری ببوو، وێرانیان کرد. بە گوێرەی زانیارییەکانی ئیبنوو جەوزیی (لە ٥٩٧ ك) دا بە هۆی مووولەرزەیەکی مەترسیدارەوە خەڵکێکی زۆر لە ناوچوون کە ئەو مووولەرزە هەر لە بەغداوە تا هەمەدانی گرتەوە بێجگە لەو کارەساتەش بارینی تەرزەیەك کە کڵۆ تەرزەکانی بە ئەندازەی هێلکە مریشکێك دەبوون، بەشێکی دیکەی کوردەکانی ئەو ناوچەی لەناو برد.[١٨٧]

سەرگەرمیی و خافڵبوونی هێزەکانی توغرول بە سەرکوتکردنی برا یاخیبووەکەی، جارێکی تریش ئەو هەلەی بۆ بەساسیریی رەخساندەوە کە بە سوپایەکی پێکهاتوو لە کوردو عەرەب و دەیلەمیەکانەوە لە ساڵی ٤٥٠ك دا بگەڕێتەوە سەر بەغداو بیخاتەوە ژێر چمك و چۆکی خۆیەوە.[١٨٨] هەر کە بەغدا کەوتە دەستی بەساسیریی، خەلیفە القائم بالله لە دارالخلافە رای کردو هاوسەرەکەی و کوڕەکەی ابوالعباس محمد-کە دەکاتە باوکی المقتدی بالله ی جێنشینی القائم- بە هۆی ئەوە کە چەندین داستان و چیرۆکیان لە مەڕ شان و شکۆ و گەورەیی بارەگای نەسرودەولەو هێمنایەتیی و خۆشگوزەرانیی قەڵەمڕەوەکەی بیستبوو، هانایان بردە بەر بارەگاکەی لە میافارقین.[١٨٩] هەر بە نزیکبوونەوەی میوانەکان لە دەروازە ی شار، کوڕی مەڕوان خێرا رۆیشت بۆ

---

187 المنتظم, ١٦/٢٩-٣٠.

188 ابن عديم, ٣.

189 ابن ازرق, ١٥٥. هەروەها نك:(ابن اثير الكامل, ١٦٨/٨.

پێشوازییان و هاوڕێ لەگەڵ وەفدێك دا رەوانەی ئامێدی کردن و بە هەموو توانای خۆی تێکۆشا کە بە باشترین شێوە میواندارییان بکات.[١٩٠]

توغرول دوای رووبەڕاکردنی کاری برایم یەنال و لەناوبردن و کوشتنی ناوبراو، توانی لە ساڵی ٤٥١ ك دا ئاژاوەکەی بەساسیریی دامرکێنێ و هەر لەگەڵ زاڵبوونەوەی دووبارە بە سەر بارودۆخی دارلخلافەو ئاسایی بوونەوەی بارودۆخەکەدا، قاسیدێکی بە دوای کوڕی خەلیفەو هاوسەرەکەی دا ناردە بارەگای نەسرەوددەولەو ئەویش دوای پێدانی چەندین دیاریی شایان و بەنرخ، بە گەرمیی ماڵاوایی لێکردن و بەرەو بەغدا بەڕێی کردنەوە.[١٩١]

ئەو چەشنە میوانداریی و پێشوازییە تایبەتە لە هاوسەرو کوڕی خەلیفە، ناو و دەنگی مێرخاسیی و دڵاوایی و گەورەیی نەسرودددەولەی لە جاران زیاتر لەو دیارە دا بڵاو کردەوەو هەروەك قەدەر وای نووسیبێ کە دوا لاپەڕەی پەڕتووکی ژیانی ئەو پاشا دادگەرو دادپەروەرە بەو نێو ونێوبانگە خۆشە پڕ بکرێتەوە، ساڵێك دوای گەڕانەوەی ئەو میوانانە بۆ بەغدا لە مانگی شەووالی ساڵی ٤٥٣ ك دا، بۆ هەمیشە چاوی لەسەر یەك دانان و لە کۆشکەکەی خۆی دا نێژرا،[١٩٢] تا لە ساڵی ٤٥٦ ك دا ست الملك ی کچی لە مزگەوتی موحدەسەدا[١٩٣] بارەگایەکی بۆ چێ کرد و تەرمەکەی گواستەوە بۆ ئەو شوێنە.[١٩٤]

---

190 ابن ازرق, ١٥٨.

191 همو, ١٥٩.

192 همو,١٧٧. ابن جوزی, ١٦/٧٠. ئیسفەهانی, تاریخ دولت ال سلجوق,٢٥.
ئیبنوئەسیر,الکامل,٨/١٧٤.

193 نك: درێژەی ئەم باسە.

194 ابن ازرق, ١٧٩.

نەسروددەولە چوار ژنی هەبوو یەکەمیان ناوی "فەزلونییە" بوو کە کچی فەزڵی کوڕی مەنووچەهر فەرمانڕەوای ئەرران و ئەرمەنستانی باکوور بوو و لەو ژنە کوڕێکی بوو بە ناوی میر سەعید کە دوای باوکی بوو بە فەرمانڕەوای ئامێد. دووهەمیان ناوی "سەییدە" بوو کە کچی شەرەفوددەولەی عوقەیلیی فەرمانڕەوای موسڵ بوو، سێهەم "فەرەجییەی" کچی سەنحاریب ی پاشای سەناسینە بوو. ژنی چوارەمین کەنیزەیەکی میسریی بوو کە لە جوانیی و سەماکردن دا بێوێنە بوو.[195]

چل و چەند کوڕی لە دوای خۆی بەجێ هێشت. میرسەعیدو ئەبولقاسم نەسر کە لە دوای باوکیان دوابەدواییەکتر بوونە دەسەڵاتداری ئامێدومیافارقین، لە هەموویان ناسراوتر بوون. هەروەها سێ کچی هەبوو "ستتولمەلیك" گەورەترینیان بوو کە دواتر بارەگایەکی بۆ گۆڕی باوکی دروست کرد.[196]

باروبخی فەرهەنگیی و کۆمەڵایەتیی سەردەمی نەسروددەولە

نەسروددەولە ماوەی پەنجاوسێ ساڵ جڵەوی دەسەڵاتی حکوومەتی بە دەستەوە بوو و لەلای فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانی سەردەمی خۆی خاوەن پایەو پێگەیەکی بەرز بوو. وێڕای بەڕێوەبردنی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتـەکەی بە شێوەی شایان و بەگژداچوونەوەی هێرشی دەستدرێژکەران بە توانایەکی پاڵەوانانەوە، گرینگیی بە خۆشگوزەرانیی خۆی و کۆمەڵگاکەی دەدا. چەندین گۆرانیبێژو سەماکەری هەبوو کە هێندێکیانی بە پارەیەکی زۆر کڕیبوو. سێسەدوشەست کەنیزی هەبوو کە هەر شەوەی لە گەڵ یەکێکیان ڕۆژی دەکردەوەو لە هەمان کاتدا لە ئەنجام دانی ئەرکە دینییەکانی زۆر بەکار بوو و

---

[195] ابن ازرق، ١٢١-١٢٢.,١٦٩.

[196] همو، ١٧٩-١٨٠.

قەت بۆ جاریکیش نوێژی بەیانی نەفەوتاندووە. چێشتلێنەرو ئاشپەزەکانی بارەگای میریی بۆ فێربوونی هونەری چێشت لێنان رەوانەی میسر دەکران وپارەیەکی زۆری بۆ خەرج دەکردن. باری ژیان و گوزەرانی خەڵکی وڵاتەکەی ئەوەندە تێرو تەواو بووە کاتێك پرسیاریان لە یەکێك لە هاورێکانی کرد کە ماوەی حکوومەتی نەسروددەولە چەند ساڵ بوو؟، لە وەڵامدا گوتی: (ئەو ماوەیە سەدوشەش ساڵ بوو نەك پەنجاوسیٚ ساڵ. چونکە شەوەکانی ئەو ساڵانە لە رۆژەکانی خۆشتر بوو". [197] ئەو فەرمانڕەوایە دادپەروەرێکی بەرجەستەو پەیکەری دادپەروەریی بوو. لە تەواوی ماوەی دەسەڵاتەکەی دا زێفی لە کەس نەکردو چاوی تەماعی دەماڵی کەس نەبڕی و دەەستی بە سەر دارایی هیچ کەس دانەگرت جویٚ لە شێخ ئەبوویەکر بن جەری، ئەویش بە هۆی ئەوە بوو کە بە نهێنیی پێوەندیی بە پاشای سەناسینەوە کردبوو و چەك و چۆلێکی زۆری لە ماڵەکەی خۆیدا ئاشکرا کردبوو. [198] وێڕای ئەوە کە وەك میرێکی بە تواناو فەرمانڕەوایەکی زانا، ئەرکی بەڕێوەبردنی وڵاتی لە سەر ئەسکوردی خۆی دانا، خۆی لە چەند ئەرك و فەرمانێکی وردو بەجیٚ و شیاوی پەسن و پیاهەڵدان لانەداوەو گەلێك وردەکاریی ئەوتۆی ئەنجام داوە، کە لە مێژووی ژیانی گەورەپیاوانی دیکەدا بە کەمیی بینراوە. بۆ نموونە کاتێك زانی راوچیانی وڵات کەوتوونە گیانی پەلەوەرو باڵندە لێقەوماوەکان، کە بە زستان بۆ کەمێك دان بە هەڵەداوان، هاتوونە نێو گوندو ماڵان و لە بەر بێخۆراکی

---

[197] همو, ١٧٦ -١٧٧. ابن جوزی, ٧١/١٦. ئیبنوئەسیر, الکامل,٨/ ١٧٤ -١٧٥. ابن خلکان, ١/١٧٧ -١٧٨. صفدی,١٧٦/٨ .

[198] ابن ازرق, ١٦٨ .

هانایان هێناوە بۆیان، فەرمانی دا دان و خۆراك ببەن بۆیان، بیڕێژن لە چیاو دولاّن.[١٩٩]

زۆر گرینگیی بە کات دەداو خشتەو بەرنامەی دادە ناو هەر بەشەی بۆ کارێکی تەرخان دەکرد.[٢٠٠] بە زیرەکی و زانایی و پیتۆڵیی خۆی و تێگەیشتن لە باری هەستیاری سیاسیی دەڤەری دیاربەکر کە بە سەر شارێگەو هاتوچۆی عێراق دا زالّ بوو و بە سەر شام و ئاسیای بچووکی دادەڕوانی و بە گرتنەبەری سیاسەتێکی دروست و واقعبینانەو گونجاو، توانی بەوپەڕی هێزو دەسەلاّتەوە لە نێو جەرگەی دەسەلاّتە جۆراوجۆرەکانی وەك خولەفای عەبباسیی و فاتیمیی و ئیمپراتۆری بیزانس و چەند دەسەلاّتێکی لە چەشنی دەسەلاّتی عوقەیلییەکان، دەسەلاّت و شانازیی مەڕوانییەکان بگەینێتە چلّەپۆپەو هێمنایەتیی و ژیانێکی ئەوتۆ بۆ خەڵکی دیاربەکر دەستەبەر بکا، کە بوو بە وێردی سەر زمانی هەموو کەس.[٢٠١] لە سەردەمی ئەودا میافارقین بوو بە شارێکی شادو ئاوەدان. باج و مالّیاتی کەم کردەوەو لەو رێگایەوە باری ئابووری باشتر بوو و تێکڕای خەڵك بە بێ هیچ دوودڵیی و مەترسییەك راشکاوانە باسی سامان ودارای خۆیان دەکرد.[٢٠٢]

ژیانی فەرهەنگیی لە ژێرسایەی ئەو فەرمانڕەوایەداو لە قەڵەمڕەوی دەسەلاّتەکەیدا رووڵەگەشە بوو و بە خێرایی بەرەو پێشەوە هەنگاوی دەناو شاعیرو چازان و بیرمەندان لە بارەگاکەی دا بەڕێزو خاوەن پایە بوون، بە هۆی

---

[199] ابن جوزی, ١٦/ ٧٠-٧١. ابن اثیر, الکامل, ١٧٥/٨

[200] ابن ازرق, ١٧٠-١٧١. ابن خلکان, ١٧٨/١

[201] نك: باسورث, سلسلەهای اسلامی جدید, ١٨٢

[202] ئیبنوئەزرەق, ١٦٦ ,

نێوبانگی خۆش و دادپەروەریی و دلاوایی ئەو پاشا کوردەو لە ژێر سێبەری ئەو ئاسوودەیی و هێمنایەتیی و خۆشگوزەرانییەی بە سەر قەڵەمڕەوەکە دا زاڵ بوو، دیاربەکر بوو بە ناوەندی گەشەی فەرهەنگی ناوچەکەو لە هەموو ولاتە ئیسلامییەکانەوە شاعیرەکان روویان کردە بارەگای پاشاو چەندین هۆنراوە یان لە پەسنی پیاوەتیی پاشادا هۆنییەوە.[٢٠٣] یەکێك لەو گەورە زانایانەی چوونە بارەگای نەسروددەولە، شیخ الاسلام ابوعبدالله کازروونی بوو، کە رۆڵێکی سەرەکیی هەبوو لە پەرەپێدانی فیقهی شافیعیی لەو دیارە دا.[٢٠٤] لە ساڵی ٤٠٣ک دا بڕیاری دا کۆشکێك بۆخۆی دروست بکاو ویستی کۆشکە کۆنەکەی حەمدانییەکان نۆژەن بکاتەوە. بەلام بە راسپاردەی خواجە ابوالقاسم ی وەزیری خۆی، پەشیمان بۆووەو تاوەر (برج) ی مەلیکی سەرلەنوێ دروست کردەوە. چونکە پێگەو شوێنی سیاسیی گرینگی هەبوو و لە دیوارو سەربانەکەی دا زێڕی بۆ جوانکاری بەکارهێناو ئاوی لەو چیاو کەژانەوە بۆ هێنا کە بە سەر شاریان دادەڕوانی و بە ناو شاریش دا تێدەپەڕی و چەندین گەرماو و حەوزی تێدا دروست کرد کە چاوی هەموو بینەرێك لە ئاستیدا ئەبلەق دەبوون.[٢٠٥]

لەساڵی ٤١٤ ک دا، لە خەزێنەی سامانی تایبەتی خۆی بڕێك دارایی تەرخانکردو نەخۆشخانەیەکی تەیاربەهەموو پێداویستییەکانی ئەوکات دروستکردو چەندین زەوی و زاری کشتوکاڵی و مڵك و داراییەکی لە ڕادەبەدەری وەقفی

---

[203] ابن اثیر, الکامل, ٧/٤٣٨. بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە :(ابن ازرق, ١٤٣-١٤٤).

[204] ابن اثیر, الکامل, ٧/٤٣٨. زەکی بەگ, تاریخ الدول..., ١٢٢. هەروەها بڕوانە: Hillenbrand, "Marwanids" EI2, V. V

[205] ابن ازرق, ١٠٧-١٠٨. هەروەها (نك: عزالدین ابن شداد, ٣/٢٧٢-٢٧٣).

نەخۆشخانەکە کرد.[٢٠٦] لەساڵی ٤٢٣ ك دا مزگەوتی موحدەسەی بنیات ناو کۆشکێکی دروست کرد کە بەسەر دەجلەدا دەیڕوانی و دەرگایەکی برنجەی تێگرت[٢٠٧] کە بە تەی عزالدین ابن شداد (لە ٦٨٤)دا لە سەردەمی ئەودا، کرا بە مزگەوت.[٢٠٨] پرۆژەیەکی تر لە بواری ئاوەدانکردنەوەدا کە ئەو پاشایە ئەنجامی داو دەشێ بڵێین گرینگترین پرۆژە بوو لەو بوارەدا، دروستکردن و بنیاتنانی شاری نەسرییە بوو لە چوارفەرسەخیی میافارقین، لەو شارەدا کۆشکێکی گەورە هەر بەو ناوەو چەندین گەرماو و باغ و خانووی بەرز و تەرز و رێك و جوانی بۆ خزم و دۆست و یارانی دروست کرد.[٢٠٩] کە ناسر خوسرەویش لە میانەی گێڕانەوەی باسی گەشتەکەی بۆ حەج لە ساڵی ٤٣٨ك دا، باسی ئەو کۆشکە گەورە دەکات.[٢١٠] ئەو شارە سەیرانگەو جێی حەوانەوەو شادیی و خۆشیی خۆی و بنەماڵەکەی بوو و هەموو ساڵێك بە خۆی و خێزان و کەنیزو گۆرانیبێژەکانی وەرزی بەهاری لەوێ تێپەڕ دەکرد.[٢١١] لە سەر سنوورەکانی دراوسێی سەناسینە قەڵایەکی جەنگی بۆ بەرگریی دروست کرد کە وەك بەربەستێك بەری دەستدرێژیی نەیارانی گرت.[٢١٢]

**میر نیزامەدین نەسر(٤٥٣ تا ٤٧٢ ك) :** ئیبنو جوهەیر هەر دوابەدوای مردنی نەسرودەولە، دەسبەجێ رێورەسمی گواستنەوەی دەسەڵاتی بۆ نیزامەددین ی

---

206 ابن ازرق, ١٢٣.

207 هەر بڕوانە سەرچاوەکەی پێشوو.

208 الاعلاق الخطيرة, ٢٧٣/٣.

209 ابن ازرق , ١٤١.

210 سفرنامە , ٧٢-٧٣.

211 بۆ زانینی درێژەی باسی ئەو مانەوە لەو کۆشکە, بڕوانە: ابن ازرق,١٤٢ -١٤٣.

212 هەمو, ١٦٨.

کوڕی وەرێخست و لە تێکڕای چین و توێژەکان پەیمانی بۆ وەرگرت و هەموویان بەیعەتیان پێداو کوڕەکەی دیکەشی میر سەید لە ئامێد بوو بە جێنشینی.[٢١٣]

مەرگی نەسروددەولە لاپەڕەیەکی نوێی لە مێژووی مەڕوانییەکان دەست پێکردو سەرەتای لاوازبوون و کەمبوونەوەی هێزو دەسەڵاتیان بوو. برایەتیی و یەکگرتوویی نێوان دوو کوڕەکەی زۆری نەخایاندو لە ساڵی ٤٥٤ ك دا میر سەعید لە نیزامەددین ی برای هەڵگەڕایەوەو شۆرشی کردو هانای بردە بەر توغرول و بە پشتیوانیی لە میرسەعید لەشکری هێنایە سەر میافارقین و سەرەنجام بە نێوبژیوانیی ئیبنوجوهەیری وەزیری نیزامەددین، ئاشت بۆوە.[٢١٤]
لەو ساڵەدا کە القائم بالله عباسی وەزیرەکەی خۆی ئەبو مەنسوور کوڕی "دارەست" ی لەسەر کارەکەی لابرد، داوای لە میر نیزامەددین کرد کە وەزیرەکەی خۆی کافی الدوله ئیبنوجەهیر، بۆ پڕکردنەوەی ئەو پۆستەو بەڕێوەبردنی کارەکانی وەزیری دەرکراو، رەوانەی دارالخلافە بکات. ئەویش رازی بوو و هاوڕێ لە گەڵ چەندین دیاری بەنرخ ناردیە بەغداو هەر بە گەیشتن بۆ بەغدا، خەلیفە نازناوی " فخرالدوله " و " شرف الوزرا " ی پێبەخشی و کرا بە وەزیر.[٢١٥] میر نیزامەددینیش، ئەبولفەزل ئیبراهیم کوڕی عەبدولکەریم ی لە شوێنی کافی الدوله کرد بە وەزیر. مەڕوانییەکان هەمیشە شانازییان بە خۆوە دەکرد کە ئەبولقاسم مەغریبی وەزیری الحاکم خەلیفەی فاتیمی، بوو بە وەزیریان و وەزیرەکەی ئەوان ئیبنوجوهەیر بوو بە وەزیری خەلیفە.[٢١٦]

---

213 همو, ١٧٧-١٧٨.

214 همو, ١٨١.

215 ابن ازرق, ١٨١-١٨٢. قس: ئیبنوئەسیر, الكامل, ٨/١٧٩-١٨٠.

216 ابن ازرق , ١٨٢.

ماوەیەك دوای هاتنی ئیبنو جوهەیر بۆ بەغدا، لە ساڵی ٤٥٥ ك دا، توغرول بەگ ماڵاوایی لە ژیان کردو بۆ هەمیشە چاوی لەسەر یەك ناو، ئالب ئەرسەلانی برازای جێی گرتەوەو لە سەر تەختی پاشایەتیی پاڵی دایەوە.

**١–٢– ٣– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی ئالب ئەرسەلان (٤٤٥ تا ٤٦٥ ك) دا.**

وێڕای ئەوە کە دیرۆکنووسانی پسپۆڕو سەرناسی وەك ئیبنوجوهەیر (لە ٥٩٧ ك) داو ئیبنوئەسیر لە ٦٣٠ ك دا گوتویانە سەعیدی کوڕی نەسروددەولە فەرمانڕەوای ئامێد، لە ساڵی ٤٥٥ ك دا، کۆچی دوایی کردووە،[٢١٧] بەڵام بە پێی وتەکانی ئیبنوئەزرەق (دوای ٥٧٧ ك) ساڵانی دوای ئەو مێژووەش، رۆڵی سەرەکیی هەبووەو تا سەرەنجام لە ساڵی ٤٦٥ ك دا بە پیلانێکی براکەی بە کوشت دەچێ.[٢١٨]

لە ساڵی ٤٥٧ ك دا نیزامەددین نەسر سوپای هێنایە سەر حەڕڕان و سووەیداو ئەو دوو شارەی خستەسەر قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایەتیی خۆی.[٢١٩] ساڵێك دواتر دوای مردنی ئیبنوئەنباری وەزیر، نیزامەددین ئەبوو تاهیر سەلامەی کوڕی ئەنباری لە شوێنی باوکی کردە وەزیر، سەرەڕای ناڕەزایەتیی دەست و پێوەندو دەوروبەرەکەی، بە هۆی ئەوە کە ئەبووتاهیر تازەلاوێکی کەم ئەزموون بوو.[٢٢٠]

لە ساڵی ٤٦٠ك دا پێوەندی نێوان دوو برا میرسەعید و میرنیزامەددین، تەنگژەی تێکەوت و لێکترازاو میرسەعید هانای بردە بەر بارەگای ئالب ئەرسەلان ی

---

217 المنتظم, ١٦/٨٤. الكامل, ٨/١٨٧. هه روه ها (نك: (Hillenbrand, "Marwanids" EI2, V, V . p. 626

218 نك: بڕوانە درێژەی ئەم باسە .

219 ئەمین زەکی بەگ: تاریخ الدول..., ١٢٣ .

220 ابن ازرق, ١٨٥ .

سەلجووقیی.[٢٢١] دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی جموجۆڵی "رۆمانۆس دیوجانۆس" ئیمپراتۆری بێزانس لە ساڵی ٤٦٣ ك دا، سوڵتانی سەلجووقیی بەرەو بەرەی شەڕی ئیمپراتۆر وەڕێکەوت و میرسەعیدیش لە ریزی سوپاکەی دابوو. هەر کە گەیشتنە دەروازەکانی میافارقین لەشکر لەوێ دامەزراو خواجە نیزامولمولك ی تووسیی وەزیری نێوبەدەرەوەی ئالب ئەرسەلان، چوو بۆ میافارقین بۆ لای نیزامەددین وپێشنیاری پێکرد کە میر بەرەو سوپاکە بچێ بۆ پێشوازیی کردن لە سوڵتان و کاتێك زانی هاوسەرو خوشکەکانی لە مەڕئەو کارە هەست بە نیگەرانیی دەکەن، بەڵێنیی پێدان کە میرێك دەبات و سوڵتانێك دێنێتەوە بۆیان!

نیزامەددین چوو بۆ پێشوازیی و بڕی سەدهەزار دیناری وەك دیاری پێشکەشی سوڵتان کرد. بەڵام ئالب ئەرسەلان کاتێك زانی ئەو پارە لە خەڵك وەرگیراوەو کۆ کراوەتەوەو لە وەرگرتنی پاشگەز بۆوە.[٢٢٢] وادیارە خواجە نیزامولمولك و نیزامەددین فەرمانڕەوای مەڕوانیی لە میانەی ئەو پێشوازییەدا بە نهێنیی لە سەر دەستگیر کردنی میرسەعید رێککەوتبوون. چونکە خواجە سوڵتانی رەوانەی راو و شکار کرد بۆ ئەوەی ئەو کارە وەك پەیمانشکێنیی و بێ بەلێنیی سوڵتان لە قەڵەم نەدرێ و بۆخۆی میری پەناخوازی لە قەڵای هەتتاخ دا زیندانیی کردو کاتێك سوپا خۆی پێچایەوەو ئامادەی رۆیشتن بوو، بە پشت بەستن بەو بەڵگەیە کە تەنیا یەك سوڵتان(ئالب ئەرسەلان) فەرمانڕەوای ئەو قەڵەمڕەوەیە، نازناوی" سلطان الامرأ "ی دا بە میر نیزامەددین و ناردیەوە بۆ

---

[221] همو, ١٨٦,٢

[222] هەر هەمان سەرچاوەی پێشوو.

شارو بەم جۆرە ئەو بەڵێینەی بە بنەماڵەکەی دابوو، بە کردە وە جێبەجێی کرد.[٢٢٣]

بە سەرکەوتنی ئالب ئەرسەلان بە سەر "رۆمانۆس" لە شەڕی بە نێو بانگی مەلازگرد دا، ئەو ناوچەیەو هەرێمی ئەخلات، لە ژێر دەسەڵاتی کوڕانی مەڕوان هاتە دەر[٢٢٤] و تێکڕای حکوومەتە کوردییە نیمچە سەربەخۆکان، کەوتنە ژێر دسەڵاتی سوڵتان و تەنیا کوردانی شوانکارە (٤٢٠-٧٥٦ ک) سەربەخۆیی خۆیان پاراست.[٢٢٥]

میرسەعیدی مەڕوانی دوای ساڵێك زیندانی لەقەلای هەتتاخ دا، سکالای باری ناهەمواری خۆی گەیاندە لای براکەی. نیزامەددین نەسریش سۆزی برایانەی خرۆشاو ئازادی کردو دوای ماوەیەك دەسەڵاتی ئامێدی پیێ سپارد. بەڵام زۆری نەخایاند لەو کارەی پەشیمان بۆوە، بۆیە پیلانێکی دارشت و کەنیزێکی جوانی کڕی و بەناوی هاوسەرایەتیی و بەمەبەستی کوشتنی براکەی، ناردی بۆ ئامێد، میرسەعدی چارەرەش بێ ئاگا لەوپیلانە پەستە، لە دڵەوە شەیدای کەنیزەکە بووو و بە بادەی عیشق سەرخۆش بوو و چەند شەوێکیان پێکەوە تێپەڕ کرد. کەنیزی بە دڕەوشت، لە هەلی هەڵکەوتوو و لە ساتە وەختی شەپۆلی عەشقدا، میرسەعدی کوشت و بەکوژرانی ئەو لەساڵی ٤٦٥ك دا بانگهێشتی نیزامەددینی کرد بۆ ئامێد و ئەویش هەرکەگەیشتە شار بەلێنی خۆی بۆکەنیزەکە جیێ بە جیێ کرد.[٢٢٦] هەر لەو ساڵەدا سوڵتان ئالب ئەرسەلان لە کاتی گەشتێکی دا بۆ ماوەرا

---

[223] همو, ١٨٧ -١٨٨. هەروەها(نك: ئیسفەهانی, تاریخ دولت ال سلجوق, ٣٩. ئیبنوئەسیر,الکامل, ١٢٢/٨.

[224] ابن ازرق, ١٩.

[225] ئەمین زەکی بەگ, خلاصەتاریخ الکرد..., ١٤٨. رشیدیاسمی, ١٩٢.

[226] سبط ابن جوزي, ١٦٥. هە روە ها (نك: بدلیسی,٢٠.

النهر بە زەبری خەنجەری پاسەوانی قەڵایەکی ئەو ناوچە، کوژراو مەلیك شای کوڕی بوو بە جێنشینی.

**١-٢- ٤- کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی مەلیك شا(٤٦٥- ٤٨٥ك) دا.**

نیزامەددین نەسر ماوەیەك دوای هاتنەسەرکاری مەلیك شا، نوێنەری خۆی نارده بەغدا بۆ یارمەتیدانی پاشای رۆم، بە مەبەستی هاندانی خەلیفەو وەزیرەکەی تا هەوڵ بدەن سوڵتان رازی بکەن بۆ ئاشتیی لە گەڵ رۆمیەکان.[٢٢٧] وادیارە نیزامەددین نەسر دوای لە ناوبردنی دەسەڵاتی براکەی، حکومەت و دەسەڵاتێکی بێ کێشەی هەبوو. چونکە هیچ زانیارییەکی مێژووییمان نییە تا کاتی مردنی لە ساڵی ٤٧٢ ك دا.[٢٢٨] لە ماوەی دەسەڵاتی نیزامەددین دا، میافارقین لە رەوتی هەڵکشان و گەشەی خۆیدا خێراتر هەنگاوی دەناو فارقییەکان لە تێکڕای ئەو ماوەیەدا بە ئاسوودەیی و خۆشیی دەژیان.[٢٢٩] لە ساڵی ٤٦١ ك دا بە بڕە پارەیەکی زۆر بە سەرپەرستیی قازیی ئەبونەسر شازیی، قاتی چوارەمی تاوەری مەلیك ی دروست کردو دوای دانانی قازیی ئیبنوبەغەلی ئامێدیی وەك چاوەدێری ئەوقاف لە ساڵی ٤٦٨ ك دا، دوو تاوەری بچووکیشی بە سەرپەرستیی ناوبراو لە میافارقین دروست کرد.[٢٣٠] لە دواساڵەکانی دەسەڵاتی خۆیدا وارش و شوورەی ئامێد و میافارقین ی نۆژەن کردەوەو ناوی خۆی لەسەر هەڵکۆڵی و بە سەرپەرستیی ئیبنو ئەنبارییی وبە خەرجییەکی زۆر، پردێکی گەورەی لە سەر رووباری دەجلە دروست کرد.[٢٣١]

---

227 سبط ابن جوزي , ١٧٠.

228 ابن ازرق, ٢٠٠-٢٠١. ابن اثير, الكامل, ٢٧٤/٨.

229 ابن ازرق, ٢٠٢٠.

230 همو, ١٩٩-٢٠٠.

231 همو, ٢٠٠. عزالدين ابن شدا د,٢٥٧/٣.

بەڵام دەتگوت ئەو گەشەو ئاوەدانییە توانای دووریی میری نەبوو و بە مەرگی خۆی بارگەو بنەی لەو دەڤەرە پێچایەوە.

**میر ناسروددە ولە مەنسووری کوڕی نیزامەددین لە (٤٧٢-٤٨٩ ك):**

دوای مردنی نیزامەددین نەسری مەڕوانیی ئیبنو ئەنباری میراتگری دەسەڵاتەکەی، مەنسووری کوڕی نیزامەددینی کردە جێنشینی باوکی.[٢٣٢] مەنسووری مەڕوانیش دوای بەیعەت وەرگرتن لە خەڵك، تەرمی باوکی لە نێو تەمی خەمی فارقییەکان و لە پەنای بارەگای نەسروددەولەی باپیری لە مزگەوتی موحدەسەدا بەخاك سپارد.[٢٣٣] ئەبوتاهیر سەلامی ئیبنو ئەنباریی بەوپەڕی وردبینیی و هۆشیاریی خەریکی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی بوو و لە ژێر سێبەری سیاسەت و لەکارزانیی و زیت و چازانیی ئەودا، بارودۆخ لەبارو روو لە گەشە بوو. بەڵام هەر بەوجۆرە نەبوو و رەوتی کارەکان لە سەر ئەو خولگەیە هەڵنەسووڕا. پزیشکێك بە نێوی ئەبوسالم کە لە نێو عەترفرۆشان لە بازاڕی شاردا دووکانێکی هەبوو، بەردەوام هاتوچۆی بارەگای مەڕوانیی دەکردو لەو راوێژو دانیشتنانەدا ئەوەندە هەوڵی دا کە ناسروددەولە بەرامبەربەئیبنوئەنباری رەشبین و دڵپیس بکات کەسەرەنجام سەرکەوت ومەنسوور، ئیبنو ئەنباریی بەند کرد و ئەبوسالمی پزیشکی لە شوێنی ئەو دانا ![٢٣٤]

ئەو دیاری کردنە بێجێ و نەشیاوە جڵەوی تەواوی کاروبارەکانی خستە دەستی ئەبوسالم و هاو سەرەکەی و چاوچنۆکی و خۆپەرستی ئەو دوو کەسە بە

---

232 ابن ازرق, ٢٠١.

233 همو, ٢٠٢.

234 همو, ٢٠٦.

تەواوی باری ولاّتی لەبار برد. فخرالدوله ئیبنو جه هیر که سەردەمێك بۆ خۆی وەزیری بەنی مەڕوان بوو، بە بیستنی هەواڵی ئیبنو ئەنبازی و شلەژانی بار و دۆخی قەلەمڕەوی بەنی مەڕوان دوای دانانی ئەبوسالم، کەلّکی له کاریگەریی خۆی لەسەر نیزامولمولك وەرگرت و هەوڵی دامەلیك شا رازی بکا هێرش بە رێتە سەر ناوچەکە ولەساڵی ٤٧٦ك دا سوڵتانی سەلجوقی لەشکرێکی گەورەی بە سەرکردایەتی ناوبراو بەرەودیاربەکر، ڕەوانەکرد.[٢٣٥] بەنزیك بونەوەی ئیبنوجە هیر له کەوشەنەکانی دیاربەکر، میری سەرەڕۆی مەڕوانی لەجیاتی خۆتەیارکردن بۆبەرگریی، هەڵوێستێکی ساکارو سەرسوڕهێنەرانەی گرت و هەوڵی دا بە خێرایی چاکسازیی له کاروبارەکان دا بکاو ئەبوسالم دەربکاو جارێکی تر کارەکان بداتەوە دەست کەسێکی وەك ئیبنوئەنباری و سەرەنجام له سایەی ئەو هەڵوێستەدا بە یەکجاریی دۆڕاو ئەو کەمە دەسەلاّتەی که بە سەر ولاّت و سوپادا هەیبوو، له دەستی داو بۆ ئەبوسالمی بەجێ هێشت و بۆخۆی رایکرد بۆجەزیرەی ئیبنوعومەرو لەوێشەوە بە مەبەستی پەنابردن بۆ بارەگای سوڵتان مەلیك شا بەرەو ئیسفەهان کەوتە ڕێ.[٢٣٦]

ئەو هەڵوێستە یارمەتی باری دەروونی ئیبنوجەهیری کردو ورەی بەرز بۆوەو بەبێ درێغیی کردن وبەفیڕۆدانی کات، ئابلۆوقەی میافارقینی دا. سوپای شار پەرتەوازە بوو و فارقییەکان کەوتنە تەنگانەوە. بەلاّم هاتنی وەرزی زستان و سەرمای زۆری ناوچەکە دەرووی دەربازبوونی بۆ کردنەوەو تەزووی سەرما پاشەکشەی بە ئیبنوجەهیر کرد بۆ ئەسعرد.[٢٣٧]

---

[235] همو, ٢٠٧. ابن اثیر, الكامل, ٢٨٦/٨. سبط ابن جوزی, ٢٠٦.

[236] ابن ازرق, ٢٠٨-٢٠٩.

[237] همو, ٢٠٩.

دوای تێپەڕینی وەرزی زستان، مەلیك شا سوپایەکی بە سەرپەرستیی میر ئۆرتۆقی کوڕی ئەکسەب بۆ پشتیوانیی لە هێزی ئیبنوجەهیر، ناردە دیاربەکر.[٢٣٨] بە پێی وتەی ئیبنوئەسیر، مەنسوری مەڕوانیش دەستەوئەژنۆ دانەماو داوای یارمەتی و پشتیوانیی لە شەرەفوددەولەی عوقەیلیی کردو بەڵێنیی پێدا ئەگەر سەرکەوتن دەستەبەر بکەن، شاری ئامێدی بداتێ و پێکەوە بەرەو بەرەی شەڕ رۆیشتن.[٢٣٩] بەڵام ئەم قسانەی ئیبنوئەسیر پێچەوانەی وتەکانی ئیبنوئەزرەقە کە گوتوویەتی: رای کرد بۆ لای مەلیك شا! و بەو پێیەی کە ئیبنوئەسیر لە درێژەی باسەکانی سەبارەت بە ململانێ و شەڕەکان و تێکشکانی شەرەفوددەولەدا بە هیچ جۆرێك ناوی مەنسووری مەڕوانیی ناهێنێ، قسەکەی ئیبنوئەزرەق لە راستیی نزیکتر دەکاتەوەو دیارە لەو کاتەدا لە لای مەلیك شا بووە لە ئیسفەهان و هەر لەوێ یان لەرێگەدا پشتیوانیی شەرەفوددەولەی وەدەست هێناوەو ناردوویەتیی بۆ یارمەتیی و پاڵپشتیی هێزەکانی خۆی. دیارە قسەکانی دواتری ئیبنو ئەزرەقیش جەخت لەسەر راست و دروستی ئەم زانیاریە دەکەنەوە کە مەنسور لە ئیسهەفان بووە. چونکەدەڵێ: مەنسورلە گەڵ سوڵتان مەلیك شا دوای بەچۆك داهاتن و شکستی ئامێد، سەبارەت بە بارودۆخی شارەکە پێکەوە وت و وێژیان کردووە.[٢٤٠] لەساڵی ٤٧٧ دا کاتێك هێزەکانی شرف الدولە گەیشتنە دەڤەری ئامێد ، ئیبنوجەهیر ئارەزوی ئاشتیی هەبوو. بەڵام تورکەکانی ژێر فەرماندە یی ئورتۆق، هێرشیان کردەسەرهێزەکانی و زۆربەتوندی توشی تێکشکانیان کردن. شەرەفوددەولە

238 الکامل, ٨. ٢٩٠ .

239 هەر هەمان سەرچاوەی پێشوو.

240 نك: هەر درێژەی ئەم باسە.

**هەڵاتەوە بۆ ئامێدو کەوتە داوی گەمارۆی ئۆرتۆق. بەڵام بە بەخشینی بڕە پارەیەك بە ئۆرتۆق خۆی دەرباز کردو رۆیشت بۆ رەققەو ئیبنوجەهیریش بەرەو میافارقین کەوتە ڕێ.[٢٤١]**

**هەر کە شەرەفوددەولە شکستی هێنا، مەلیك شا کەڵکی لەو دەرفەتە وەرگرت و لەساڵی ٤٧٧ ك دا، سوپایەکی بە سەرپەرستی و فەرماندە یی عەمیدوددەولەی کوڕی فەخروددەولەو ئیبنوجەهیر، بەرەو موسڵ وەڕێخست کە قەسیموددەولە "ئەقسەنقوور"باپیری ئەتابەکانی زەنگیی لە ریزی ئەو سوپایەدابوو وقەسیموددەولە داوای لە خەڵك کردکە شارەکەبەدستەوە بدەن وئەوانییش رازی بوون ودەروازەکانی شاریان بۆکردنەوە. دوای ئەوسەرکەوتنە سوڵتان بۆخۆی بەرەوئەو ناوچەیە کەوتە ڕێ. بەڵام یاخیبوون وهەڵگەڕانەوەی براکەی (تەکیش) لە خوراسان، گەشتەکەی بەنیوەچڵیی هێشتەوە.[٢٤٢]**

**ئیبنوجەهیر کە بۆخۆی چوبوو بۆ میافارقین، لە ساڵی ٤٧٨ ك دا، کوڕەکەی نارد بۆ گەمارۆدانی ئامێد. کاتێك چاوی بە شوورەی پتەوی شار کەوت، لە کردنەوەو دەرووتێخستنی هیوابڕاوبوو وبڕیاری دا شارەکە گەمارۆ بداو لەم رێگایەوە ئامێدییەکان بەچۆکدابێنێ. هەر بەو مەبەستە وێڕای ئابڵووقەدانی شار باغ و دارستانەکانیشی تێك و پێك داو سەرەنجام هێندێك خەڵکی کاڵفام و ئاسایی، شارەکەیان بە کوڕی ئیبنوجەهیر سپارد.[٢٤٣]**

**فەخروددەولەش کە چواردەوری میافارقین ی ئابڵووقە دابوو، ئاوی لە سەر خەڵکی شار گرتەوە. سوڵتان لەو کاتەدا کە میرمەنسووری مەڕوانیی لە لای**

---

[241] ئیبنوئەسیر, الکامل,٨/ ٢٩٠-٢٩١. ابن خلدون, ٥٧٧/٣.

[242] ئیبنوئەسیر, الکامل, ٨/ ٢٩١-٢٩٢.

[243] همو, ٢٩٩/٨. ابن خلکان, ١٢٨/٥. ابن خلدون ٥٧٨/٣. صائغ , ١٥١/١.

خۆی بوو، پێشنیاری پێکرد بە نیوەی قەڵەمڕەوەکەی رازی بێ. لەو هەڵلاوهەنگامە توندو تووشەداو لە بەرەبەری بڕیارو هەڵوێست گرتنی مەنسووردا، قاسیدی ئەبوسالم لە شەودا گەیشتە جێ و بە ناوی ئەبوسالمەوە میری مەڕوانیی لەوە دڵنیا کرد، کە شار توانای دە ساڵ بەربەرەکانیی و خۆڕاگریی هەیە. هەر بۆیە میر مەنسوور پێشنیارەکەی سوڵتانی رەتکردەوەو بە نیوەی قەڵەمڕەوەکەی رازی نەبوو. مەلیك شا کاتێك بارودۆخەکەی بەو چەشنە بینی، " سەعدوددەولەی گەوهەر ئایین" کە دارۆغەی بەغدا بوو بە سوپایەکەوە بەرەو میافارقین ، رەوانە کرد. بە گەیشتنی دارۆغە تیرە ندازە کارامەو لێهاتووەکانی توانیان بورجێکی شارەکە بخەنە ژێر رکێفی خۆیان و سەرەنجام لە ساڵی ٤٧٨ ك دا، شاریان ناچار بە خۆبەدەستەوەدان کرد.[٢٤٤]

فەخروددەولە هەر کە شارەکەی خستە ژێر چمك و چۆکی خۆیەوە،دەستی بە سەر سەرجەم سامان ودارایی بەنی مەڕوان داگرت و ئەبوسالمیشی بەند کرد و دواتر سوپایەکی بەرەو جەزیرەی ئیبنوعومەر بەڕێ کرد. بە پێی قسەی ئیئبنو ئەسیر کۆمەڵێك لەگەورەپیاوانی شار، رێگەیان بە هاتنەژوورەوەی سوپا دا بۆ ناو شارو لە تێکڕای سەردەمی ئیبنوئەسیردا ئەو کەسانە بە هۆی ئەو کارە یان بەردەوام سزا دەدران.[٢٤٥]

بەم جۆرە وێڕای ئەوە کە مەڕوانییەکان هیچ ئازارێکیان بە سەلجووقیەکان نەگەیاند، بوونە قوربانی چاوچنۆکیی و حەزەکانی ئیبنووجەهیر. ئیئبنوئەزرەق دەڵێ لە ئەبولحەسەن عەلی باپیری گوێ بیست بووە کە بۆخۆی لە خزمەت ئیئبنوجەهیر دابووە، هەر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی نەسرودەولە ڕا ئەو

---

[244] ابن ازرق, ٢١٠-٢١١. ئیبنوئەسیر ,الکامل,٨/٢٩٩-٣٠٠., سبط ابن جوزی, ٢٠٦.

[245] الکامل٨/٣٠٠.

خەیاڵەی لە زەین دابووەو بە ئاواتی ئەو رۆژە بووەو سەرەنجام لاوازیی دەسەڵات و دەوڵەتی بەنی مەڕوان لە سەردەمی مەنسووردا، ئاواتەکەی ئیبنوجەهیری هێنایە دی.[٢٤٦]

دوای زاڵبوونی ئیبنوجەهیر بە سەر تێکڕای قەڵەمڕەوی مەڕوانییەکان لە ساڵی ٤٧٩ ك دا، سوڵتان مەلیك شا گوندی "حەربی" لە باکووری بەغدا بە مەنسوور بەخشی و ناوبراو تا کاتی مردنی سوڵتان لە ساڵی ٤٨٥ ك دا، لە وێ مایەوە. ئیبنوجەهیر دستی کرد بە رێك وپێك کردنی کاروبارو ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی شارو سڕینەوەی شوێنەوارەکانی شەڕ. چەندین نوێنەرو بەرێوەبەری بۆ سەرانسەری دیاربەکر دیاری کرد[٢٤٧] و سامان و دارایی دەست بەسەرداگیراوی مەڕوانییەکانی گواستەوە بۆ قەڵای حەسەن کێف و لەوێوە بە کوڕەکەی دا لە رێگەی دەریاوە بۆ بەغدای نارد. خەڵکی بەغدا بە بینینی زێڕوگەوهەری مەڕوانییەکان سەرسام بوون.[٢٤٨]

سوڵتان مەلیك شا کە ترس و خەمی مەڕوانییەکانی لە دڵا نەمابوو و لەو بارەوە خاترجەم ببوو، لە ساڵی ٤٧٩ ك دا، موسڵی داگیر کردو بە زانایەکی دەسپاك و خۆپارێزی سپارد کە ناوی عەمیدولمولك بوو[٢٤٩] و لە کۆتایی ئەو ساڵەش دا فەخرودەولەی لە سەر کورسی حکومەتی دیاربەکر لابردو عەمیدی کوڕی عەلی بەڵخی وەك نوێنەری خۆی بۆ ئەو ناوە نارد.[٢٥٠]

---

246 تاریخ الفارقی, ١٧٢-١٧٣. هەروەها(نك: ابن خلكان ١٢٨/٥. صفدی, ١٧٧/٨)

247 ابن ازرق, ٢١٣-٢١٤.

248 همو, ٢١٦-٢١٨.

249 ابن ازرق, ٢٢١.

250 هەر هەمان سەرچاوە, ابن اثیر, الكامل, ٨/ ٣١٣. عزالدین ابن شداد, ٢١٨/٣.

ماوەی حکومەتی ئیبنو بەڵخیی زۆری نەحایاندو بێگومان خەڵك لە رەفتارو هەڵوێستەکانی ناڕازی بوون و کۆمەڵێك لە کوردەکانی شار وەك ئەبولهەیجاو و ئەبوعەبدوڵلا بن مووسەك و ئەبولحەسەن عەلی لە ساڵی ٤٨٢ دا، شکایەتی حاڵ و بارودۆخی ناوچەکەیان بردە لای سوڵتان مەلیك شاو داوایان لێکرد لە سەر کورسی دەسەڵات، دەری بکات. سوڵتانیش داواکارییەکەی پەسند کردو عەمیدوددەولە ئیبنوجەهیر، مێردی زوبێدی کیژی نیزامومولکی کردە دەسەڵاتداری حکومەتی میافارقین.[٢٥١] عەمیدوددەولە هەر بە گەیشتن بۆ میافارقین، دەسبەجێ ئەبولحەسەن عەلی کردە فەرمانڕەوای ئەرزەن. بەڵام دوای ماوەیەك لە بەغداوە بانگ کرا بۆ وەرگرتنی پۆستی وەزارەتی خەلیفە المقتدی. ئەویش کۆمەڵێکی تر لە فارقییەکانی لەگەڵ خۆی بردن بۆ دارالخلافە و لەوێ زۆر لێبڕاوانە تێکۆشا رێزو حورمەتیان بگیرێ و دوای ئەوە کە چەندین خەڵات و دیاری بەهاداریان پێبەخشین، بەرەو وڵاتی خۆیان بەرێی کردنەوەو[٢٥٢] ئەبولبەرەکاتی برای لە شوێنی خۆی دانا بۆ فەرمانڕەوایی ئەرزەن. لە ساڵی ٤٨٥ ك دا، ئەویش بۆ بەغدا بانگهێشت کراو لە نیوەی رێگا دابوو کە هەواڵی مەرگی سوڵتان مەلیك شای سەلجووقیی بە گوێ گەیشت.[٢٥٣]

**١– ٢– ٥– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی بەرکیاروق دا (٤٨٥– ٤٩٨ ك)**

مردنی مەلیك شاو ململانێ و تێکهەڵچوونی خوێناویی پاشماوەکانی لە پێناوی بە دەستەوەگرتنی جڵەوی دەسەڵات دا، سەرانسەری جەزیرەی تووشی قەیران کردو ئەو هێمنایەتییەی کە بەرهەمی بەزۆرپێکەوەگرێدانی ئاپۆرەی خەڵکی

---

[251] ابن ازرق, ٢٢٤ -٢٢٦. ابن وردي, ٢/١٠.

[252] ابن ازرق, ٢٢٧ -٢٢٩.

[253] همو, ٢٢٩,١.

ناوچەکە بوو، لە ژێر سێبەری دەسەڵاتی سەلجوقییەکان دا لە ناو چوو و ئاژاوەو قەیران جێی گرتەوە.

ئیبراهیم بن قورەیشی میری عوقەیلی لە ساڵی ٤٨٢ ك ڕا لە لایەن مەلیك شای سەلجووقییەوە لەزیندان کرابوو دوای مردنی سوڵتان، "تورکان" خاتوون هاوسەری سوڵتان، دەرفەتی هەلاتنی بۆ رەخساند و خێرا نیازی گەڕانەوەی بۆ موسڵ کەوتە سەرو کوردەکانی ناوچەی موسڵی لە خۆی کۆ کردەوەو بە یارمەتیی و پشتیوانی ئەوان عەلی برازای لە شار وەدەرناو بۆخۆی لە سەر کورسی دەسەڵاتی موسڵ پاڵی دایەوە.[٢٥٤] لە لایەکی ترەوە تاجوددەولە "ئۆتۆش" ی برای مەلیك شا کە فەرمانڕەوای دیمەشق بوو، دوای مەرگی سوڵتان بە پەلە بەرەو جەزیرە کەوتە ڕێ و نوسەیبینی دایە بەر زەبری شمشێرو دەستی کرد بە کۆمەڵکوژیی خەڵکی ناوچەکەو ئەمیرحوسێن بن نەسروددەولەی مەڕوانیش، لەو کوشت وبڕە دەرباز نەبوو و گیانی لە دەست دا[٢٥٥]. دوای ئەو شەڕە سوپای بردە سەر موسڵ و ئەوێشی داگیرکرد.[٢٥٦]

بارو دۆخی دیاربەکریش هەموارو لەبار نەبوو، ناصرالدولە مەنسوور کە لە ساڵی ٤٧٩ ك و کاتی رووخانی حکوومەتەکەیەوە لە گوندی حەڕبیی نیشتەجێ بوو،مەرگی مەلیکشای بە دەرفەت زانی و دەستی بە سەر جەزیرەی ئیبنوعومەر داگرت.[٢٥٧]

---

[254] ابن قلانسی, ٢٠١. ابن ازرق,٢٣٣. ئەمین, ١١٨.

[255] هەر سەرچاوەی پێشوو, ابن اثیر الکامل,٣٦٨/٨.

[256] همو,٣٦٩/٨. عزالدین ابن شداد,٣١٢/٣.

[257] ابن ازرق,٢٣٢. عزالدین ابن شداد, ٢١٨/٣. غندور, ١١٥.

رووداوی مەرگی مەلیك شا بارودۆخی میافارقینیشی شێواندو ئاپۆرەی خەڵك هەر بەبیستنی ئەو هەواڵە رژانە ناو شارو دوای ماوەیەك ناكۆكیی و راجیاوازیی، لە سەر ئەوە پێكهاتن كە بەركیاروق-كوڕی گەورەو جێنشینی مەلیك شا- بۆ شار بانگهێشت بكەن و بە هۆی ئەوە كە بەركیاروق بڕوبیانووی دێنایەوەو خەمساردیی دەنواند لە هاتن بۆ میافارقین، شێخ ئەبوسالم بن مەحوور كە یەكێك لە گەورەپیاوانی شار بوو، سەرەڕای رازی نەبوونی خۆی، لە لایەن خەڵكەوە وەك فەرمانڕەوای شار دیاریكرا.[٢٥٨] دوای تێپەڕینی ماوەیەكی زۆر كە بەركیاروق هەر نەهاتبوو بۆ ناوچەكەو بە بیستنتی هەواڵی لەشكركێشیی "ئۆتۆش" بۆ ناوچە، شێخ هاوڕێ لە گەڵ كۆمەڵە خەڵكێك بە مەبەستی بانگهێشتنی "ئۆتۆش"، بەرەو نوسەیبین وەڕێ كەوتن. دوای چۆل بوونی شار لە فەرماندەو گەورەپیاوان، ئیبنوئەسەدی فارقیی كە شاعیرێكی رەوانبێژ بوو و كۆمەڵێك لایەنگرو پشتیوانی هەبوو و لەو ماوەیەدا سەرگەرمی پاراستنی شار بوو، شارەكەی دایە دەستی ناسروددەولە مەنسوور فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبنوعومەر،[٢٥٩] ئۆتۆش هەر بە بیستنی ئەو هەواڵە بە پەلەو بێ دواكەوتن هەڵیكوتایە سەری و دوای گرتنی ئامێد، گەمارۆی میافارقینیشی دا. خەڵكی شاریش لە ترسی ئەوە كە نەكا تووشی چارەنووسی نوسەیبین بن، لە مانگی ربیع الاول ی ٤٨٦ ك دا، شارەكەیان بە دەستەوە داو میر ناسروددەولەش، هانای بردە بەر خێوەتگەی ئیبنونەجم كە وەزیری سوڵتان بوو.[٢٦٠]

---

[258] ابن ازرق, ٢٣٠ -٢٣٢.

[259] همو, ٢٣٢ - ٢٣٥

[260] همو, ٢٣٥ -٢٣٦. هەروەها (نك: ابن قلانسی,٢٠١. ابن اثیر,الكامل,٣٦٩/٨ -٣٧٠)

تاج الدوله " ئۆتۆش " کاتێك شارەکەی بە تەواویی خستە ژێر رکێفی خۆی، سپاردی بە دەستییەکێك لە سەردارەکانی بە نێوی ئەبووتاهیرو خزمەتکارێکی خۆی کە ناوی " تۆغتگین" بوو، لە سەر داناو کردی بە راوێژکاری کوڕەکەی کە ناوی شمس الملوك دوقاق بوو.[٢٦١] پاشان سوپای بردە سەر ئازەربایجان. لەو ماوەداو لە ساڵی ٤٨٨ ك دا ئامێدیەکان، شۆرشیان لە دژی "ئۆتۆش" هەڵگیرساند. تۆغتگین سوپای بردە سەر ناوچەکەو وێڕای سەرکوتکردنی شۆرش بە شێوەیەکی بێبەزە بیانە، سەری هێندێك لە شۆرشگێڕەکانی بڕی و ژمارەیەکی تریشی لە داردان.[٢٦٢]

لە ساڵی ٤٨٩ ك دا ساڵێك دوای کوژرانی ئۆتۆش لە شەڕ لەگەڵ بەرکیاروق دا، ئەبولهەیجاو کوڕی مووسەك هەزە بانیی فەرمانڕەوای کوردی هەولێر هاوڕێ لەگەڵ محمد کوڕی شەرەفوددەولە فەرمانڕەوای نوسەیبین، بانگهێشتی "قەوامودەولە ئەبوسەعید کەربوقا" یان کردبۆ بەگژداچوون و شەڕ دژی عەلی بن شەرەفوددەولە فەرمانڕەوای موسڵ و داوایان لێکرد بەو مەبەستە بێتە ناوچەکە. دیارە لەو کاتەدا ئەبوسەعید تازە بە فەرمانی بەرکیاروق لە زیندانی حەڵەب ئازاد کرابوو. "کەربوقا" هەر کە گەیشتەوێ خیانەتی پێکردن و محمدی کوڕی شەرەفوددەولەی کوشت و دوای داگیرکردنی نوسەیبین، بە توندیی گەمارۆی موسڵی داو سەرەنجام ئەوێشی گرت و بە راکردنی عەلی کوڕی شەرەفوددەولە بۆ لای "سەدەقەی کوڕی مەزیەد" لە حیللە، تەمەنی دەوڵەتی بەنی عوقەیل کۆتاییهات و موسڵ و دەورەبەرەکەی بە تەواویی کەوتنە

---

[261] ابن ازرق, ٢٣٦ -٢٣٧. عزالدین ابن شداد, ٤١٧/٣ .

[262] ابن ازرق , ٢٣٩ .

ژێرچەپۆکی تورکە سەلجووقییەکان.[٢٦٣] هەر لەو ساڵەدا کەبەنی عوقەیل دەسەڵاتەکەیان هەرەسی هێنا،میر ناسروددەولە مەنسووری مەڕوانیی پەردەی ژیانی دادایەوەو بەرەو مردن گەڕایەوەو هاوسەرەکەی تەرمەکەی گواستەوە بۆ ئامێدو لەوێ ئەسپاردەی خاکی کرد. بە مردنی مەنسوورو زاڵبوونی سێبەری دەسەڵاتی سەلاجیقە بە سەرقەڵەمڕەوەکەیاندا، دۆسیەی دەوڵەت ودەسەڵاتی بەنی مەڕوان بە فەرمی پێچرایەوە.[٢٦٤] بەڵام پاشماوەکانی بەنی مەڕوان بەکردەوە درێژە یان بەحکوومەت و دەسەڵاتی بچووك کراوەی خۆیان داو هێندێك قەڵای بچووك لە ناوچەکەدا، هەر لە ژێر چمك وچەمۆکی خۆیان دابوو و تا لەکۆتایی ولەساڵی ٥٣٣ ك دا،"حیسامەدین تەمەرتاش"فەرمانڕەوای ئۆرتۆق ی ماردین،[٢٦٥] بە گرتنی قەڵای هەتتاخ بە تەواویی کۆتایی بە دەسەڵاتی بەنی مەڕوان هێنا بە سەر ناوچەکەدا.[٢٦٦] رەگەزنامەی بنەماڵەی بەنی مەڕوان وەك کۆتاییەکی جوان، لە لاپەڕەی بەرامبەرمان خراوەتە بەر دیدی هەمووان.

---

[263] ابن اثیر,الکامل,٤٠٢/٨-٤٠٣.عزالدین ابن شداد,١٦٤/٣.لین پول,٢٠٨/١.

[264] ابن اثیر الکامل,٤٠١/٨ . ابن کثیر, ١٧٥/٥.

[265] (ئۆرتۆقییەکان تیرەیەکی تری غۆزەکان بوون و وەچەی ئۆرتۆقی کوڕی ئەکسەب بوون کە لە ریزی سوپای مەلیکشادا خزمەتی دەکردو سەرەنجام بوو بە دەسەڵاتداری فەلەستین. کوڕەکانی توانای خۆڕاگرییان نەبوو لە بەرامبەر فاتمیی و خاچهەڵگرەکان داو لە دەورو بەری دیاربەکرو حەسەن کێف جێگیر بوون و بوونە دوو وەچە. نەوەکانی "سوکمان"ی یەکەم لە حەسەن کێف و ئامێدو وەچەی "ئیلغاز"ی یەکەم لە ماردین و میافارقین. هاتنەسەرکاری زەنگییەکان رێگەی لە سەرەڕۆیی و چاوچنۆکیی ئەوان گرت و پاشان ئەییوبییەکان دەسەڵاتی خۆیان زیاتر فراوان کردو حەسەن کێف و ئامێدو میافارقین یان لە ئورتۆقییەکان ستاندەوەو لە کۆتاییدا تەنیا ئەو بەشەیان کە لە ماردین بوون بە هۆی تەسلیم بوون بە هۆلاکۆ, مانەوە) ((سلسلەهای اسلامی جدید ٣٧٦-٣٧٩)

[266] ابن اثیر الکامل, ٧٩/٩. ابن عبري, ٢٨٧. ابوالفداْ ١٤/٣. ابن وردي, ٦٧/٢.

ناسروددەولە مەنسوور دوای مردنی باوکی چوو بۆ حەسەن کێف و رەگەڵ مووسا تورکمەن کەوت کە نوێنەری کەربوقا بوو. ساڵی ٤٩٤ ك کاتێك کەربووقا ماڵاوایی لە ژیان کرد، یەکێك لە سەردارەکانی کە ناوی "سونقورجە" بوو، لافاوی سوپای بە سەر موسڵ وەرکردو لە ساڵی ٤٩٥ ك دا، ئەو شارەی داگیر کرد. گەورە پیاوانی موسڵیش بانگهێشتی مووسا تورکمەن یان کرد بۆ شارەکەو شەڕو پێکدادان لە نێوان سوپای "سونقورجە"و هێزەکانی مووسادا دەستی پێکردو کوڕی میر مەنسوور کە لە ریزی سوپای مووسادابوو، بە زەبری شمشێرێك سەری سونقورجەی پەل داو مووسا بە سەر شارەکەدا زاڵ بوو.

جگەرمژ کە فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبنوعومەربوو، بە بیستنی ئەو هەواڵە بەرەو موسڵ رۆیشت وسەرەنجام خستییە ژێرسێبەری ئالآی خۆی ودەستی بە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کوردەکانی ئەو هەرێمەدا گرت و ناچاری کردن پەیڕەویی لە فەرمانی بکەن.[٢٦٧]

لە سایەی ئاشتیی و تەبایی نێوان بەرکیاروق و غیاسوددین موحەممەدی برای کە دوای چەندین شەڕ پێکەوە ئاشت ببوونەوە، هەر لەو ساڵەدا دیاربەکرو جەزیرەو موسڵ، دران بە موحەممەد.[٢٦٨] ململانێ و کەڵەوەکێشیی نێوان شازادە سەلجووقییەکان و سەرهەڵدان و پەرەسەندنی هێزو دەسەڵاتە خۆجێییە جۆراوجۆرەکان لە ناوچە جیاجیاکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامیی لە لایەك و بڵێسەی پەرەگرتووی مەشخەڵی گڕی ئاگری پێشڤەچوونی سەلجووقییەکان بەرەو ئاسیای بچووك-کە بە سەرکەوتنی ئالب ئەرسەلان لە ساڵی٤٦٣ ك بە سەر ئیمپراتۆری رۆم لە شەڕی بەناوبانگی مەلازگرد دا، هەڵگیرسابوو- تا

---

267 ابن اثیر,الکامل,٨/ ٤٧١ -٤٧٢. ابن وردي,٢/ ٢٤.

268 ابن اثیر, الکامل, ٨/ ٤٦٣.

لێوارەکانی دەریای مەڕمەڕە پێوەچوبوو و خەریك بوو بە تینی بڵێسە بە تینەکانی قوستەنتینییەش هەڵپڕوکێنێ، بوو بە هۆی ئەوە کە ئیمپراتۆر "کومنیۆس"، داوای یارمەتیی وپشتیوانیی لە پاپ ئۆربانی دووهەم بکا.

**ڕەگەزنامەی بنەماڵەی بەنی مەڕوان** [269]




[269] زامباور, ٢٠٧.

ابو نصر احمد ممهدالدوله ابوالحسن على

سعيد سليمان ابوالحسن محمد نظام الدين نصر

ناصرالدولة منصور

لــە ساڵــی ٥٣٢ ک دا حسام الديـن تەمەرتاش لەقەڵای هەتتاخ وەدەری نا.

ئەو بارودۆخە بە دڵی پاپ بوو و دەرفەتێکی لەباری بۆ هەڵکەوت تا بە هۆییەکخستنەوەی کلیسای یۆنان — کە لە ساڵی ٤٦٦ک دا لە کلیسای رۆم جیا ببۆوە– لە گەڵ کلیسای رۆم، پلەوپێگەی خۆی سەقامگیر بکاو لە وتارێکی ئاگرین وهەستبزوێندا،داوای لە هەموان کرد چەك هەڵگرن و بەرەو رۆژهەڵات هێرش بەرن و برا مەسیحییەکانییان دەرباز بکەن و خاکی پیرۆز لە بن دەستی کافرەکان (موسڵمانەکان) رزگار بکەن. لە ماوەیەکی کەم دا سوپایەکی سامناك و پڕمەترسیی لە چەشنی شەپۆلی بە تەوژمی لافاوێك دا، بەرەو رۆژهەڵات

کەوتەڕێ و بە هێرشبردن بۆ سەر ئەنتاکییە لە ساڵی ٤٩١ ك و بيت المقدس لە ساڵی ٤٩٢ك دا،و کوشتوبڕو قەڵاچۆی بە کۆمەڵی موسڵمانەکانی ئەو شارەو درێژەدان بەپێشڤەچوون بەرەو شام، یەکێك لە گەورەترین رووداوە مێژووییەکانی ناوچەو جیهان (شەڕی خاچهەڵگرەکان) لەسەر رووپەڕی پەڕتووکی مێژوو تۆمارکراو لە ئاست و پێوانەی رادەی هۆکارەکان و فرەیی بەشداربووان دا،[٢٧٠] دوو سەدەی رۆژهەڵات و رۆژئاوای بە یەکسانیی، کردن بە هاوشانییەکتر. کوردو تورك و عەرەبەکانی ناوچەی موسڵ لە ساڵی ٤٩٧ ك دا لە ژێر فەرماندەیی جگەرمژ، فەرمانڕەوای شاردا، هێرشیان کردە سەر شام و فەرەنگییەکانیان بە توندیی تێکشکاندن.[٢٧١]

غياث الدين محمد کە لە کاتی ئاشتیی لەگەڵ بەرکیاروق دا موسڵ و دەڤەری جەزیرەی وەرگرتبوو، لە ساڵی ٤٩٨ ك دا، سوپای هێنایە سەر ئەوشارە. جگەرمژ بە بیستنی هەواڵەکە تاکتیکی(زەوی سووتاو)ی بە کارهێناو بە زەبری زۆر خەڵکی دەوروبەری هێنایە ناو شوورەی شارو ئەو دەوروبەرەی وێران کردو لە نێو شاردا خەریکی بەرگریی بوو. بەڵام کاتێك هەواڵی مردنی بەرکیاروقی بیست، شارەکەی دایە دەستی محمدو ئەویش بە هۆی ئەوە کە دەیزانی جگەرمژ کەسێکی خۆشەویست و خاوەن پایەیە، شارەکەی بە خۆی سپاردەوەو بە پەلە بەرەو بەغدا رۆیشت و لە سەر تەختی بەرکیاروق دانیشت و بوو بە جێنشینی.[٢٧٢]

---

[270] بۆ شارەزایی سەبارەت بە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی ئەو شەڕانەو پاڵنەرەکانی بەشداریی لەواندا, بڕوانە: (نك: حیتتی, ٨٠٦-٨٠٧.

[271] همو، ٨/ ٤٩٦, ابن تغر بردی, ١٨٨/٥, رانسیمان, ٤٦/٢.

[272] ابن اثیر الکامل, ٨/ ٥٠٤-٥٠٥.

**١–٢– ٦– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی غیات الدین محمد(٤٩٨–٥١١)**

دوای مردنی بەرکیاروق کوردەکانی ماردین شۆرشیان هەڵگیرساندو ناوچەکەیان شڵەژاند. "یاقوت "ی کوڕی ئورتۆق کە باوکیشی بەشداریی کردبوو لە سەرکوتکردنی مەڕوانییەکان دا، داوای لە فەرمانڕەوای شار کرد ڕێگەی پێبدا لە پەنای قەڵای شار خۆی قایم کاو کۆتایی بە دەستڕۆیشتوویی کوردەکان بێنێ بە سەر ئەو شوێنەداو بە پەسند کردن و رازیبوون بە داواکارییەکەی، شاری ماردین یشی داگیر کرد. بەڵام لە کاتی هێرشبردن بۆ سەرجەزیرەی ئیبنوعومەر کوژراو "سوکما قوتبی" جڵەوی دەسەڵاتی ماردینی بەدەستەوە گرت و دوای مردنی ئەویش براکەی (ئیلغازی کوڕی ئۆرتۆق) بوو بە مەزنی شارو دواتریش وەچەی ئیلغازیی، دەسەڵاتداری شار بوون.[٢٧٣]

قیلێچ ئەرسەلان کە لە سەلجووقییەکانی رۆم بوو دوای تێپەڕینی ساڵێك بە سەر مەرگی شمس الملوك دوقاق لە ساڵی ٤٩٨ك دا، لە لایەن زیائەددین موحەممەد عەجەمیی کە نوێنەری دوقاق بوو لە میافارقین، بانگهێشت کراو بوو بە دەسەڵاتداری شارەکەو میرەکانی تری دیاربەکریش هاتنە خزمەتی و ئامادەیی خۆیان بۆ پەیڕەویی و گوێڕایەڵیی دوقاق نیشان دا.[٢٧٤]

بە هۆی ئەوە کە جگەرمژ فەرمانڕەوای موسڵ پەیمانشکێنیی کردبوو، غیاسەددین موحەممەد داهاتی دیاربەکرو بەشەکانی تری جەزیرەی دا بە " جائۆلی سەقائۆ" کە شەڕوانێکی تورك بوو و لە ساڵی ٥٠٠ ك دا بەرەو موسڵ بەڕێی کرد. ناوبراو دوای بەیدەست کردنی بوازیج، رووی کردە هەولێر. ئەبولهەیجاو ئیبن مووسەك هەزەبانیی فەرمانڕەوای کوردی هەولێر جگەرمژی

---

[273] ئیبنوئەسیر, الکامل, ٨/ ٥١٠-٥١١. شەمیسانی, مدینة ماردین....., ١١٣.

[274] ابن ازرق, ٢٧٢.

ئاگادار کردەوە ئەگەر بە پەلە فریای نەکەوێ، جوێ لە تەسلیم بوون و خۆتێکەڵکردن لە گەڵ سەقائۆ، رێگەچارەیەکی تر شکا نابا. جگەرمژ سوپای تەیار کردو رۆیشت بۆ هەولێر. ئیبنوموسەکیش سوپایەکی بە سەرپەرستیی کوڕەکانی بەرێکرد کە لە گوندێکی نزیکی هەولێر بە نێوی "باکەلبا" رەگەڵ سوپای جگەرمژ کەوتن.لەو بێنەوبەرەدا جائولی بە خۆی وسوپاکەیەوە گەیشتە سەریان و زۆر بە توندیی تووشی شکستی کردن و جگەرمژو کوڕەکانی ئیبنوموسەك بە دیلیی کەوتنە بەر دە ستی و سەرەنجام جگەرمژ لە ماوەی ئەو بە دیل گیرانەی دا، گیانی دا.[٢٧٥]

خەڵکی موسڵ بە بیستنی ئەو هەواڵە دەستەودامێنی فەرمانڕەوایانی دەوروبەرو قیلیج ئەرسەلان و بورسوقی و دارۆغەی بەغدا بوون و زەنگی کوڕی جگەرمژیان کردە دەسەڵاتداری شارو بە گەیشتنی سەقائۆ بۆ نزیك دەروازەکانی شار، سەنگەری بەرگرییان گرت. یەکێك لە ناودارانی شاری موسڵ کە ناوی "سوکەیرات" بوو و لە ریزی سوپای جگەرمژ دابوو، لە کاتی بەدیل گیرانی ئەودا هەڵات بۆ هەولێر. سەقائۆ کوڕەکانی ئیبنوموسەکی لە گەڵ ئەو کوسەیراتەدا ئاڵ و گۆڕ کرد.[٢٧٦]

هەر بە گەیشتنی راسپاردەی خەڵکی موسڵ، قلیج ئەرسەلان سوپای ناردە ئەوێ و "خەمورتاش"ی خزمەتکارەکەی باوکی بە سەر میافارقینەوە دانا. ئەویش دەستی کرد بە چەوساندنەوەی خەڵکی شارو مەردم لە چنگی

---

[275] ابن اثیر الکامل, ٨/ ٥٣٥-٥٣٦. صائغ, ١/ ١٥٧. ئەمین زەکی بەگ: خلاصە تاریخ الکرد.......,
١٥٠.

[276] ابن اثیر, الکامل, ٨/٥٣٧.

توندوتیژیی رەفتارەکانی وەزاڵە هاتبوون.[٢٧٧] بە گەیشتنی قلیج ئەرسەلان بۆ نوسەیبین، سەقائۆ رایکرد بۆ رەحبەو موسڵییەکانیش شارەکەیان دایە دەستی قلیج ئەرسەلان.

ئەویش دوای جێگیر بوونی لە شارەکەدا، قازی ابو محمد عبدالله بن قاسم شارەزووریی بۆ قەزاوەت و پێڕاگەیشتنی کێشەکانی موسڵ، کردە قازیی.[٢٧٨]

دوابەدوای ئاسایی بوونەوەی بارودۆخی موسڵ، قیلیج ئەرسەلان بە پەلە بە پێسیری جائولی سەقائۆ دارۆیشت و لە رۆخ رووباری خابوور کەوتنە شەڕو سوپای قیلیج لەو تێکهەڵچوونەدا پەرتەوازە بوو و کاتێك زانی بۆخۆی بە تەواویی گەمارۆ دراوە، بە ئەسپەوە خۆی خستە خابوور. ئەسپ بە ناخی ئاودا رۆچوو و قلیج ئەرسەلانیش خنکا. موسڵییەکانیش بەچۆکدا هاتن و شارەکەیان تەسلیمی سەقائۆ کرد.[٢٧٩]

لە ساڵی ٥٠١ ك دا سولڵتان غیاسەددین موحەممەد، نیازی بەغدای کەوتە سەرو داوای لە "سیف الدوله سەدەقەی کوڕی مەنسووری ئەسەدیی میری بەنی مەزیەدو بنیاتنەری شاری حیلله" کرد، " سورخاب" ی کوڕی کەیخوسرەو فەرمانڕەوای ساوە کە پەنای بۆ سەدەقە هێناوە، بداتەوە بە سولڵتان. بەڵام سەدەقە ملی نەداو رازی نەبوو. بۆیە سولڵتان لە مانگی رەجەبی ئەو ساڵەدا سوپای هێنایە سەر سەدەقە. کوردەکان هاوشان لە گەڵ عەرەبە خوفاجەکان، پێکهێنەری دەستەراستی سوپای سەدەقە بوون و ئەویش هیوایەکی زۆری بە دەست و چەمۆکی ئەو شەڕوانانە هەبوو. لە شەڕێکدا کە لە گوندێکی نێوان

---

[277] ابن ازرق , ٢٧٤ .

[278] ابن اثير الكامل, ٨/ ٥٣٨ -٥٣٩.

[279] ابن اثير , الكامل, ٨/ ٥٤٠ -٥٤١.اقسرايى,٢٨ -٢٩ .

واست و بەغدا بە نێوی نوعمانییە روویدا، سەدەقە تێکشکاو ژمارەیەکی بەرچاو لە سەربازەکانی کوژران.[٢٨٠]

دوای تێکشکاندنی سەدەقە،سوڵتان غیاس الدین محمد، فەرمانی بەفەرمانڕەوای کوردی هەولێر ئەبولهەیجای کوڕی موسەك ی هەزەبانی و سەردارەکانی تری ئەودا، هێرش بکەنە سەر شاری موسڵ. بەهۆی ئەوە کە جاولی سەقائۆ خۆی لەدانی باج و پیتاك دەبوێریٚ و لە شەڕی دژی سەدەقەش بەشداری نەکرد. ئیبنوموسەك و هاوپەیمانەکانی دوای تێپەڕینی ماوەیەك بەسەرگەمارۆی موسڵدا، بەیارمەتی کۆمەڵێك لە گەچکارانی شار، دەستیان بە سەر داگرت و سوڵتان جەنگاوەرێکی بەرەگەز تورکی کە ناوی میرمەودود بوو، بۆ بەڕێوەبردنی حکومەتی موسڵ دیاری کرد.[٢٨١]

هەر لەو ساڵەدا خەڵکی میافارقین هەوێنی شیری بەختیان هەڵگەڕاو میر سوکمان قوتبی فەرمانڕەوای خەلات لە چنگی زۆرو زێفی "خەمووڕتاش" رزگاری کردن وجڵەوی شارەکەی گرتە دەست وتێکۆشا باری نالەباری شاری میافارقین باشتر بکاو لە ئاکامدا خەڵك لە ژیانی کولەمەرگیی خەلەسان و ئاهێکیان هاتەوە بەر.[٢٨٢] لە ساڵی ٥٠٣ ك دا، خەڵکی ئامێدیش بە مردنی ئیبراهیم یەنال تورکمانی فەرمانڕەوای دەستنیشاندەی"توتوش" لە ستەم و بەدرەفتاریی ئەو مەزنە چەوت و لارە، رزگاریان بوو.[٢٨٣]

---

[280] ابن جوزی , ١٠٨/١٧. ابن اثیر , الکامل, ٥٥٥/٨. حسینی,١١٤.

[281] ابن اثیر, الکامل , ٥٦٣/٨-٥٦٤. غندور, ١١٣. ئەمین زەکی بەگ: خلاصة تاریخ الکر. ...,١٥١.

[282] ابن قلانسي, ٢٦٣. ابن ازرق, ٢٧٤. -٢٧٥. ابن اثیر,الکامل,٨/ ٥٧٤.

[283] ابن قلانسي,٢٦٨,ابن اثیر الکامل,٨/ ٥٨١.

له ساڵی ٥٠٥ ك دا ئیبنومووسەك هەزەبانیی فەرمانڕەوای هەولێرو میرەکانی تری ناوچە وەك میرمەودودو .... بە فەرمانی غیاسەددین مەحەممەد بۆ بەرەی شەڕی فەرەنگییان وەڕێکەوتن و هێندێك لە قەڵاکانی ئەوانیان لە نزیکی شەنگار خستە دەستی خۆیان و لە درێژەی ئەو هێرشەدا، شاری "روها"یان ئابڵووقە دا. بەڵام بە هۆی نالێکیی و ناتەبایی نێوخۆیان،بە ئاکام نەگەیشتن و هەر کەسەو گەڕایەوە مەڵبەندی قەڵەمڕەوی خۆی.[٢٨٤]

بە درێژبوونەوەی ماوەی تاڵان و برۆی بالدوین پاشای بیت المقدس لە شام و داوای یارمەتی فەرمانڕەوای ناوچەکە لە میرمەودوود لە ساڵی ٥٠٦ ك دا، ناوبراو سوپایەکی گەورەوگرانی کوردو تورکانی گرد کردەوەو بەرەو شام لەشکرکێشیی کرد. لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ٥٠٧ ك دا، ئەو سوپایە شکستی گەورەی بە سەر فەرەنگییەکان هێناو تارو ماری کردن.[٢٨٥] میر مەودوود دوای ناردنەوەی سوپا بۆ موسڵ بە مەبەستی پشوودان، بۆخۆی لە دیمەشق مایەوەو لەوێ بە دەستی سەربازێکی ئیسماعیلیی تیرۆر کرا.

دوای تیرۆری میر مەودوود سوڵتان "ئاق سونقوربورسووق"ی بۆ حکومەتی موسڵ و جەزیرە دیاری کرد. ئەویش هەر وەك میرەکەی پێش خۆی، سەربازێکی بە رەگەز تورك بوو و ئەرکی چالاکیی دژی فەرەنگییانی خرابۆ سەرشانی. هەر بۆیە لە ساڵی ٥٠٨ ك دا، فەرماندە یی سوپایەکی ١٥٠٠٠ کەسیی وە ئەستۆ گرت و هاوشان لە گەڵ مەلیك مەسعوود کوڕی سوڵتان مەحەممەد کە عیمادەددین زەنگییەکەمیش لەگەڵیان بوو، هێرشی بردە سەر روهاو دوای تێپەڕینی دوو مانگ بە سەر گەمارۆی شارەکەداو کوشتنی

---

284 ابن اثير الكامل, ٥٨٧/٨ -٥٨٨. رانسيسمان,١٤١/٢.

285 ابن قلانسي, ٢٩٣ -٢٩٥.

ژمارەیەکی بەرچاو لە فەرەنگییەکان، بە هۆی سەرهەڵدانی ناتەبایی لە نێوان هێزە سەربازییەکان دا، بۆی نەلوا ئاکامێکی روون بە دەستەوە بدا.[٢٨٦]

لە ساڵی ٥٠٩ ك دا، کاتێك سوڵتان هەواڵی ناتەبایی و پەرت و بڵاویی سوپای راسپێراوی بیست، فەوجێکی سەربازی تری کە بە شێوەیەکی سەرەکیی لە سەربازانی موسڵ و جەزیرە پێکهاتبوو، نارد بۆ شام کە سەرەڕای دەستەبەرکردنی چەندین سەرکەوتن و سەرەنجام لە بەرامبەر فەرەنگییەکان دا شکان.[٢٨٧] هەر لە کۆتاییەکانی ئەو ساڵەدا، بورسووقی لە لایەن سوڵتانەوەلە حکوومەت لابراو میر "جیوش بەگ"ی کردە دەسەڵاتداری حکوومەتی ئەو شارەو مەسعوودی کوڕیشی بە جیوش بەگ سپارد.[٢٨٨] دوای ئەوە جارێکی تر نیازی کرد سوپایەکی تر بەرەو شام بنێرێ. بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەداو لە سەرەتاکانی ساڵی ٥١١ ك دا ماڵاوایی لە ژیان کردو موغیسوددین مەحموودی کوڕی، بوو بە جێنشینی باوکی.

## ١- ٢- ٧- کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی موغیسوددین مەحموود (٥١١-٥٢٥ ك دا.)

---

286 ابن اثير, الكامل, ٨/ ٦٠١. رانسيسمان, ١٤٨/٢.

287 ابن اثير, الكامل, ٨/ ٦٠٧.

288 همو, ٨/ ٦١١.

هاوکات لەگەڵ هاتنەسەرکاری موغیسوددین، موولەرزەیەکی بە هێز عێراق و جەزیرەی وەلەرزە خست[٢٨٩] کە لە هەولێر زۆر بە هێز بوو و ئاپۆرەیەکی زۆری لە حەشیمەتی ئەو شارە، لە ناو برد. هەر لەو کاتەدا لافاوێکی بەرین شاری شەنگاری خاپوور کردو ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەو شارەی لە ناو نوێنی مەرگ دا نواند.[٢٩٠]

دوای کۆچی دوایی خەلیفە ئەلموستەزهیر بیللا لە ساڵی ٥١٢ ك دا، ئەلموستەڕشیدی کوڕی لە جێی بابی بوو بە خەلیفە. بەڵام کوڕەکەی دیکەی کە ناوی ئەبولحەسەن بوو، شۆڕشێکی هەڵگیرساندو کوردو تورکەکانیش چوونە ریزی شۆڕشەکەیەوە. ناوبراو رۆیشت بۆ حیللە بۆ لای "دووبەیس". بەڵام دوای ماوەیەك لەوێش هەڵات و دەستدرێژیی کردە سەر قەڵەمڕەوی خەلیفە. سەربازانی دووبەیس لە نزیك شاری "سێلح" تێکیان شکاندو کوردو تورکەکانیش هەڵاتن و میر ئەبولحەسەنیش هاوڕێ لە گەڵ دە کەس لە هاوڕێکانی، سەریان لێ شێواو رێیان گوم کردو لە بیابان سەرەدەریان دەرنەکردو ئەگەر سەعد — کە کوردێك بوو — بە هانایانەوە نەهاتبا، هەموویان لە بێ ئاویی وتینوایەتیی دا سەریان دەنایەوە. خەلیفەزادەی یاخی سەرەنجام لە لایەن "دووبەیس"ەوە رادەستی خەلیفە کرایەوە.[٢٩١]

هەر لەو رۆژانەدا کوردەکان موسڵ و دەورویەرکەیان شڵەژاند. "جیوش بەگ" نوێنەری سوڵتان مەسعوود لە موسڵ، بە گرتنەبەری سیاسەتی تاکتیکی (مستی پۆڵایین) بروسکەئاسا هەڵیکوتایە سەر قەڵاکانیان و یەك لە دواییەك دەکەوتنە

---

[289] همو,٨/ ٦٢٤.

[290] ابوشامه, الروضتين, ٢٨/١. ذهبی, العبر فی..., ٢٣,١/٤

[291] ابن جوزی, ١٧١/١٧. ابن اثير, الكامل, ٦٢٩/٨-٦٣٠

ژێر چمك و چنگییەوەو کوردەکانی دیکەش بەرەو چیاو دۆڵەکان پاشەکشەیان کرد. بەم جۆرە باری هێمنایەتیی باڵی بە سەر ناوچەکەدا کێشاو لە تەواوی ماوەی دەسەلاتی جیوش بەگ(٥١١-٥١٤) دا، کوردەکان بۆیان نەلوا چەکدار ببنەوە.[٢٩٢]

لە ساڵی ٥١٤ ك دا جارێکی تریش شۆرشی بێ ئاکامی سوڵتان مەسعوود دژی مەحموودی برای،دام و دەزگای دەڤەری موسڵی خستە ناو کەشێکی نالەبارو هەرچەند دیرۆکنووسان باسی هەڵوێستی کوردەکانیان نەکردووە لەو ململانێیەدا، بەلام بێگومان کاریگەریی و شوێنی خراپی لە سەر باری گوزەرانیان داناوە. ساڵێك دواتر مەحموود دەسەلاتی موسڵ ی بە "ئاق سونقور بورسووقی" سپاردو بە سوپایەکی گەورەو گران و تەیارو زۆرەوە، بەرەو ئەو دەڤەرە بەرێی کرد. وادیارە ناوبراو ترسی لە هێزو دەسەلاتی بنەماڵەی کوردی هەزەبانیی لە هەولێر هەبووە. چونکە هەر دوابەدوای جێگیربوونی لە موسڵ، ئەو بنەماڵەی لە فەرمانڕەوایی هەولێر لادا[٢٩٣] و سوڵتانی سەلجووقیش بە مەبەستی پتەو و سەقامگیرکردنی دەسەلاتەکەی، شەنگارو جەزیرەی ئیبنوعومەریشی پێدا.[٢٩٤]

سوڵتان هەر لەو ساڵەداحکوومەتی میافارقین ی دایە دەستی نەجمەددین ئیلغازیی کوڕی ئورتۆق فەرمانڕەوای ئامێد، کە پێشتر "سوکمان قوتبیی"

---

[292] ابن اثیر, الکامل, ٨/ ٦٨٠. صائغ, ١٦١/١.

[293] ابن اثیر, الکامل, ٨/ ٧٠٥.

[294] ابن اثیر الکامل, ٦٦٨/٨. عزالدین ابن شداد,٣م١٦٥. ابوشامە, الروضتین, ٢٩/١ .

فەرمانڕەوی ئەو حکوومەتە بوو و ئەو شارە هەر لە دەستی نەوەکانی دا مایەوە تا لە ساڵی ٥٨٠ ك دا، سەلاحەدین ئەیوبیی لە دەستی دەرهێنان.[٢٩٥]

ماوەی دەسەڵاتی "بورسووقی" بە سەر موسڵ دا زۆری نەخایاندو ناوبراو لە ساڵی ٥٢٠ ك دا، بە زەبری شمشێری خۆبەخشە ئیسماعیلییەکان، لە پەلو پۆ کەوت و عیززەددین مەسعوودی کوڕی سولْتان لەسەر کورسییەکەی دانیشت. ناوبراو ئەو دەسەڵاتەی کە باوکی لە بنەماڵەی هەزەبانییەکانی وەرگرتبۆوە، گەڕاندەوە بۆ ئەو بنەماڵەو مەزنایەتیی هەولێری بەوان سپاردەوە.[٢٩٦] هەزەبانییەکان بە وەرگرتنەوەی تواناو دەسەڵاتەکەیان، جارێکی تریش چالاکانە هاتنەوە گۆڕەپانی سیاسیی ناوچەو رۆڵی بەرچاویان هەبوو. ئیبنوموسەك کە فەرمانڕەوای کوردەکان بوو و لە کاتی هێرشی مەحموود بۆ سەر بەغدا لە ریزی سوپای خەلیفەدا سەنگەری بەربەرەکانیی گرتبوو، کتوپڕ هەڵوێستی گۆڕی و لە ساڵی ٥٢١ ك دا پاڵی وە سولْتانی سەلجووقی داو بەو کارەی بە تەواویی ورەی خەلیفەی دابەزاندو ناچاری کرد ئاشتی قبوڵ بکاو میرنشینی هەزەبانیی هەولێری کە– دەسەڵاتێکی سەربەخۆی نەبوو و شوێنکەوتەی چۆنییەتیی پێوەندی نێوان خەلیفەوسولْتان بوو–، کردە گوێڕایەڵی سەلجووقییەکان.[٢٩٧]

دەسەڵاتی عیزەددین مەسعوود لە موسڵ دەوڵەت و دەسەڵاتێکی کاتیی بوو و ناوبراو دوای تێپەڕینی چەند مانگ بە سەر حکوومەتەکەیدا، کۆچی دوایی کرد. دوای مەرگی عیزەددین یەکێك لە خزمەتکارە بە رەگەزتورکەکان کە ناوی

[295] ابن اثير, الكامل, ٨/ ٦٧١. ابن عبري, ٢٨١.
[296] ابن ثير , الكامل, ٨/ ٧٠٥.
[297] همو و٨/٧٠٧. التاريخ الباهر, ٣٠. محمد حسين, ٣٧-٣٨.

جاولی بوو هاوڕێ لە گەڵ دوو کاربەدە ستی شار، کە بریتیی بوون لە قازیی بەهائەددین شارەزووریی و محمد باغیسانی ناردن بۆ بەغدا بۆ لای سوڵتان بەو مەبەستە کە دەسەڵاتی ناوچەکە بدرێتە دەستی کوڕە مێرمنداڵەکەی عیزەددین. نوێنەرانی موسڵ کە بۆخۆیان لە دەسەڵاتی جاولیی دەترسان، لە دیداریی خۆیان لەگەڵ موغیسوددین مەحموود دا، وێڕای ئاماژەکردن بە منداڵیی و کرچ وکاڵیی کوڕەکەی عیزەددین و مەترسیی پێشڤەچوونی فەرەنگیەکان تا جەزیرەی ئیبنوعومەرو بە سەرنجدانی ئازایەتیی و لێهاتوویی عیمادەددین زەنگییەکەم، داوایان کردکە عیمادەددین بۆ دەسەڵاتداریی حکومەتی موسڵ، رەوانەی ئەو دەڤەرە بکرێت. سوڵتانیش هەموو ئاماژەو تێبینییەکانی بە هەند وە رگرت و بە خواستەکانیان رازی بوو و لە ساڵی ٥٢١ ك دا، عیمادەددین بۆ موسڵ بەڕێ کرا.[298]

**بەندی سێهەم: کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی ئەتابەکانی زەنگی (٥٢١-٥٨١ ك.)**

**١- ٣-١- کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی عیمادەددین زەنگییەکەم (٥٢١-٥٤١ ك دا.)**

عیمادەدین زەنگی کوڕی "ئاق سونقور" بوو کە خزمەتکاری مەلیك شاو یەکێك لە یاوە رە نزیکەکانی بوو. ئاق سونقوور بە هۆی زیتی و زیرەکیی و لێهاتوویی خۆی، بوو بە کەسایەتیەکی دیارو بەرچاو لە پێکهاتەی دەزگای سیاسیی و سەربازیی حکومەتی سەلجووقییەکان داو مەلیك شا نازناوی "قسیم الدولە"ی پێبەخشی. عیمادەددین لە ساڵی ٤٨٧ ك کاتێك باوکی کوژرا، لە

298 ابن اثير, الكامل, ٦/٩-٩. التاريخ الباهر, ٣٤-٣٥. ابوشامه, الروضتين, ١٣٠/١.ابن خلدون, ٦٦/٥. صائغ, ١٦٧/١.

میانەی شۆرشی دژی "توتوش"دا، منالێکی دە ساڵە بوو و بەڕادەیەك لێهاتوویی و کارامەیی نواند، کە وەك باوکی توانی پلەوپایە گرنگەکانی دەسەڵات، دەستەبەر بکات.[٢٩٩]

ململانێ و کێشەی نێوخۆیی سەلجووقییەکان سەرەڕای ئەوە کە زیانی لە هێزو توانای تایبەتی سەڵتەنەتخوازەکان دا، بوو بە هۆی ئەوە کە سوڵتانە سەلجووقییەکان بە مەبەستی پاراستنی هێزو پاڵپشتیی و دەسەڵاتەکەیان، چەند ناوچەیەك بدەنە فەرماندە سەربازییەکانیان کە ئەو تاکتیکە ئاکامێکی نەخوازراوی بۆ ئەوان بە دواوە بوو و خودی ئەو سیاسەت و تاکتیکە رێگەی خۆش دەکرد بۆ پێکهاتن و دروستبوونی چەند میرنشینێکی سەربەخۆ – وەك ئەتابەکانی جەزیرە –و سەرەنجام رۆڵێکی گرینگی هەبوو لە نەمانی دەسەڵاتی سەلجووقیی داو لە هامان کاتدا کاریگەریی نەرێنیی و تێکدەرانەی هەبوو لە پێکهاتەی نەتەوەیی – کە لەم باسەدا زۆرتر جەختی لە سەر دەکرێ– و باری ئابووریی و کۆمەڵایەتیی قەڵەمڕەوی خۆیاندا.

عیمادەددین زەنگی کە ئەرکی سەرپەرستیی و چاودێریی هەردوو کوڕەکەی سوڵتان مەحموود (ئالب ئەرسەلان و فەرروخ شا) ی لە سەر شان بوو، بە گەیشتنی بۆ موسڵ لە ساڵی ٥٢١ ك دا، پلەی "قاضي القضات"ی قەڵەمڕەوەکەی دا بە قازی بەهائەددین شارەزووریی کە رۆڵێکی بێوێنەی هەبوو لە بە دەسەڵات گەیشتنی عیمادەددین داو هەموو کەس دانی بە تێگەیشتوویی و فرەزانیی قازی دا دێناو عیمادەددین چەندین شوێنی دیکەی دا بە قازیی و لە هەموو کاروبارەکان دا راوێژی لەگەڵ دەکردو گوێی لێدەگرت. قازی لە نێو میرو

[299] بۆ شارەزایی زیاتر سەبارەت بە ژیان و کاروباری عمادالدین تا کاتی بە دەسەڵات گەیشتنی لە موسڵ، بڕوانە: نك: شاعر،٢٩ -٣٥.

دەسەڵاتدارنی تری عیمادەددین دا لە هەمووان زیاتر خاوەن پایەو ڕێزو بەرزیی بوو و بە باشترین شێوە لە پێناوی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دا تێدەکۆشا.[٣٠٠]

عیمادەددین هەستی بە بارودۆخی ناسك و هەستیاری قەڵەمڕەوی خۆی کردو پێشڕەویی خێرای فەرەنگییەکانیش ، ترسێکی گەورەی لە ناخی دا دروست کردبوو. هەر لەبەر ئەو هۆیە بوو کە دوای گەشەپێدان و باشترکردنی بارودۆخی موسڵ، لە ساڵی ٥٢٢ ك دا بە مەبەستی ڕوویەڕووبوونەوەی فەرەنگییەکان و ڕێکوپێك کردنی کاروبارەکان بە خێرایی، هێرشی کردە سەر جەزیرەی ئیبنوعومەرو جەزیرەکەی لە دەست "بورسوقی" خزمەتکار دەرهێناو دوای نوسەیبین و شەنگار، خابووریشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لە درێژەی هێرشەکانیدا ڕووی کردە هەولێر چونکە پێی وابوو بوونی ناوەندێکی تری وەك دەسەڵاتی بنەماڵەی هەزەبانیی لەو شارەدا لە گەڵ ئامانجی سەرەکیی ئەودا کە یەکخستنەوەی تێکڕای دەسەڵاتی ناوچەکەیە لە پێناو خۆئامادەکردن بۆ هێرش بردنە سەر خاچهەڵگرە دەستدرێژکەرەکان، و ڕێ وشوێن و بەرنامەی سیاسی شارەزایانی هەزەبانییەکان لە هەولێر کە چەندین ساڵ لە سایەی ئەو سیاسەتەو لە پێناوی بەرژەوندیی خۆیان داکەڵکیان لە چۆنییەتیی پێوەندیی نێوان خەلیفەو سوڵتان وەرگرتبوو، شتێك نەبوو خۆی لە چاوە تیژو وردبینەکانی عیمادەددین، حەشار بدا. هەر بۆیە بە پەلە هێرشی بۆ کردو دوای داگیرکردنی شارەکە دایە دەستی زە ینوددین عەلی کوجەك کە یەکێك لە سەردارە ناودارەکانی بوو. بە دانانی زەینوددین، زنجیرەی نیمچە سەربەخۆی بەنی بوکتگین لە هەولێر بارگەو بنەی پێچایەوەو گۆڕەپانی سیاسی لە مێژوودا بەجێ هێشت. عیمادەددین دوای سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی سیاسی خۆی لە

---

[300] ابن اثیر, الکامل, ٨/٩. ابوشامه, الروضتین, ٣٠/١. ابن خلدون, ٦٦/٥. صائغ, ١٦٧/١.

ناوچەی جەزیرەدا، بەرەو بەرەی شەڕی فەرەنگییەکان لە حەڕڕان رویشت و ئەو شارەشی گرت.[٣٠١]

سەرکوتکردنی شۆرشەکانی فەرمانڕەواکانی ئامێد، حەسەن کێف و ماردین[٣٠٢] و کوژرانی خەڵکێکی زۆری موسڵ و جەزیرە بە کارەساتی موولەرزە بەسامەکەی ساڵی ٥٢٤ ك ، بوونە کۆسپی بەردەم پێشڤەچوونی زەنگییەکەم لە شەڕی دژی فەرەنگییەکان دا.[٣٠٣] هەر لەو ساڵەدا ئەسەدەددین شێرکۆ و نەجمەددین ئەییوب دوو کوڕەکەی "شاز"ی کوڕی مەڕوان، لە دەوینەوە[٣٠٤] بەرەو عێرق هاتن[٣٠٥] و چوونە نێو دەزگای مجاهدالدین بیهروز کە داڕۆغەی بەغدا بوو و ئەویش دوای ماوەیەك نەجمەددین ئەییوبی کرد بە دژدارو پاسەوانی قەڵای تکریت، بە هۆی ئەوە کە مرۆڤێکی ئاکارجوان و لێزان بوو. سپاردنی ئەو دەسەڵاتە بە نەجمەددین قۆناغێکی نوێی لە مێژووی سیاسی و فەرهەنگیی ئیسلام و ناوچەدا هێنایە کایەو هەروەك بە گوێرەی باسەکەمان

---

301 ابن اثیر, الکامل, ٨/٩-٩.ابوشامه, الروضتین, ١/ ٣٠-٣١. عزالدین ابن شداد, ١٦٧/٣

302 ابن اثیر, الکامل, ٢٣/٩-٢٤. ابوشامه,الروضتین, ٣١/١

303 ابن جوزی, ٢٦٥/١٧. ابن اثیر, الکامل, ٢٦/٩ .

304 (شارێکە لە سەر رێگای ئەرران و وڵاتی گورجستان هەڵکەوتووە لە سەر سنووری ئازەربایجان) ((ابن خلکان ١٣٩\٧))

305 بە داخەوە هیچ کام لە مێژوونووسەکان بە روونی باسی ئەو کاتەیان نەکردووە کە کوڕانی "شاز"ی کوڕی مەڕوان ئەوشارەیان بە جێ هێشتووە. بەڵام مینۆرسکی بە سەرنجدان لەو راستییە کە لە ساڵی ٥٤٥ ك دا دەوین کەوتە دەستی "توغان ئەرسەلان" و کوشتنی "فەزلون"ی سێهەمی شەددادیی هەروەها پێوەندی نزیکی نێوان شەددادیی و ئەییوبییەکان, لە سەر ئەو باوەڕەیە کە کوڕانی "شاز" توانای قبوڵکردنی ئەوداگیرکەرەخوێنخۆرەیان نەبوو و هەر لە گەڵ گیرانی شارەکە لەو مێژووەدا, بەرەو عێراق رۆیشتوون.) ((پژوهشهایی در تاریخ قفقاز ١٨٤,.

ئاماژەی بۆ دەکەین، هاتنە کایەی ئەییوبییەکان و ڕۆڵی بەرچاویان لە گوڕەپانی سیاسی ناوچەکەدا، لێرەوە دەستی پێکرد.[٣٠٦]

عیمادەددین زەنگییەکەم لە ساڵی ٥٢٥ ک دا لە بەرەی شامەوە گەڕایەوە بۆ قەڵەمڕەوی خۆی و لە درێژەی سیاسەتەکەی لە پێناوییەکخستنەوەی دەسەڵاتی خۆی لە ناوچەکەدا، دەستی بەسەر قەڵایەکی کوردەکان داگرت[٣٠٧] بە ناوی قەڵای "موجهیمەر".[٣٠٨] ساڵی دواتر عیمادەددین خۆی خستە ناو ململانێی کوڕەکانی "مغيث الدين محمود"و بە پاڵپشتیی لە مەسعوود، سوپای هێنایە سەر بەغدا. بەڵام سوپاییەکگرتووی سەلجووق شا –کوڕەکەی تری مەحموود– و خەلیفە هێزی عیمادەددینیان تێکشکاندو ئەگەر نەجمەددین ئەییوب میری تکریت فریای نەکەوتباو پەنای نەداباو وێڕای چارەسەری برینەکانی لە پەڕینەوەی دەجلە هاوکاری نەکردبا، بێگومان چارەنووسی مردن یان بەدیل گیران دەبوو.[٣٠٩]

ساڵێك دواتر کوردە حومەیدییەکانی ناوچەی موسڵ، بە پێچەوانەی نەجمەددین ئەییوب رەفتاریان کردو سیاسەتێکی تریان گرتە بەرو کاتێك خەلیفەالمسترشد هێرشی هێنایە سەر موسڵ ی پێتەختی عیمادەددین، خەلیفە داوای یارمەتیی و پشتیوانیی لەوان کردو ئەوانیش بەفەرماندە یی وسەرپەرستیی عیسا حومەیدی میری حومەیدییەکان، بە بەڵێ وەڵامی داوای خەلیفەیان دایەوە[٣١٠] و بەم

---

[306] ابن اثیر الکامل, ٣٤٣/٩. ابوشامه الروضتین, ١٢٩/١. ابن خلکان ١٤٢/٧. ابن واصل, ٧/١-٨.
[307] هەڵکەوتەی جوگرافیی ئەو شوێنە و تۆمار کردنی لە سەرچاوە پێوەندیدارەکاندا, نەدۆزرایەوە.
[308] ابن واصل , ٤٣/١.
[309] ابن اثیر الکامل, ٢٤٣/٩. ابوشامه الروضتین, ١٢٩/١. ابن خلکان, ١٤٢/٧-١٤٣.
[310] ابن اثیر الکامل , ٥٢/٩. ابن عبری, ٢٨٣-٢٨٤. هەروەها (نك , Minorsky)
“kurds”kurdistan”, EI2 , V, VI ,p,45

هەڵوێستە لە ناکاو و چاوەڕوان نەکراوەیان، داینەمۆی شەڕی عیمادەددین زەنگییەکەمیان دژی کوردەکانی ناوچەکە وەگەڕ خست. هەڵبەت ئەو هەڵوێستە تاکە هۆکاری دژایەتیی زەنگی لە بەرامبەر کوردەکان و هێرش بۆ سەر ناوچەکەیان نەبوو، بەڵکو دراوسێیەتیی و سنووری هاوبەش لە گەڵ میرنشنە نەیارەکانی و گەورەدوژمنێکی وەك خاچهەڵگرەکان، پێویستی بەوە هەبوو کە بە سوپایەکی پۆشتەو تەیارو رێکوپێك و دڵسۆزەوە درێژە بە دەسەڵاتەکەی بداو پێکهێنانی سوپایەکی لەو چەشنەش پێویستی دەکرد کە قەڵەمڕەوی زۆرتری لە بەر دەست دابێ بۆ ئەوەی لە ناو فەرماندەو هێزەکانی دا دابەشی بکاو بە دیاریی بۆیان تەرخان بکاو لە رێگای ئابوورییەوە دەسەڵاتەکەی فروانتر بکاو بۆ ئەم مەبەستەش ناوچەکانی باکوورو باکووری رۆژهەڵاتی موسڵ کە نیشتمانی کەونارای کوردەکان بوو و لە رووی کشتوکاڵ و ئابوورییەوە گرینگترین جەمسەرەکانی ناوچەکە بوو و بۆ پێکان و وەدیهێنانی ئەو ئامانجە زۆر بە باشیی دەستی دەدا.

عیمادەددین بەلەبەرچاوگرتنی دەسەڵات و توانای کوردەکان و پەرش و بڵاویان لە ناوچەکەدا، سەرەتا کوردە دراوسێکانی سەرکوت کردو یارمەتیی و پشتیوانیی عیسا حومەیدیی لە خەلیفە لە ساڵی پێشتردا، سەرباری هۆکارەکان بوو و لە ساڵی ٥٢٧ ك دا زەنگی بەرەو قەڵەمڕەوی کوردە حومەیدییەکان رۆیشت و هێرشی کردە سەر قەڵاکانی شووش و ئاکرێ و... ئەو دوو قەڵایە بە هۆی ئەوەکە بە سەر گوندو زەوییە کشتوکاڵییەکانیان دا زاڵبوون، گرینگییەکی تایبەتیان هەبوو و تا ئەو ساڵە نێوانیان لەگەڵ زەنگی دا خۆش بوو و فەرماندەکەیان عیسا حومەیدی لە کاتی زاڵبوونی زەنگی بەسەر موسڵ دا، لە قەڵەمڕەوەکەی دا مایەوە. بەڵام پێوەندی و پشتوانییەکەی لە خەلیفەی

عەبباسیی، ئەم پێوەندییەی پچڕاند. دوای گەمارۆیەکی توندوتووش، عیمادەدین ئەو دوو قەڵایەو قەڵاکانی تری حومەیدییەکای بەیدەست کرد و بەو کارە ناوچەکەی لە دەستدرێژیی و جموجۆڵی ئەوان خاترجەم کردو هێمنایەتیی و ئارامیی باڵی بە سەر ناوچەکەدا کێشا.[٣١١] دواتر زەنگی بەرەو ئامێد ملی ناو نەسیروددین جەقەری نوێنەری خۆی بۆ درێژەدانی هێرش و پیشڤەچوونەکانی لە قەڵەمڕەوی کوردەکان راسپاردو سەردارێکی تری خۆی بەرەو زۆزان بەڕێ کردو بەم جۆرەو بەو سیاسەتە زبرو توندوتیژە، کوردەکانی ئەو دەڤەرەشی سەرکوت کردن و کۆتایی بە سەربزێوییەکانیان هێنا.[٣١٢]

لە درێژەی رەوتی سەرکوتی بێبەزەییانەی کوردە حومەیدییەکاندا، ئەبولهەیجاو بن عەبدوڵلا هەکاریی[٣١٣] فەرمانڕەوای قەڵای قایمی ئاشێب و قەڵاکانی تری جودەیدەو تووشیی و... ترسێکی زۆری لێ نیشت و لە ساڵی ٥٢٨ ك دا، نوێنەرێکی خۆی بۆ لای عیمادەددین ناردو وێڕای بەخشینی سامان و دارایی و دراوێکی زۆر بە زەنگی، ئامادەیی گوێڕایەڵیی خۆی بۆ دەربڕی و دوای ماوەیەك بۆخۆی چوو بۆ لای لە موسڵ و لەوێ خۆری تەمەنی لە خۆرنشینی مەرگ ئاوا بوو و لە گردی تەوبە بە خاك سپێردرا. لە کاتی رۆیشتنی خۆیدا بۆ موسڵ لە ترسی داگیرکردنی قەڵای ئاشێب لە ماوەی سەفەرەکەیدا،

---

311 ابن اثیر الکامل , ٥٢/٩ -٥٣. التاریخ الباهر, ٤٨. ابن واصل, ٥٥/١. صائغ,١٩٦/١. شاعر, ٣٨-٤٠. هەروەها(نك: ابوشامەالروضتین. ٣٢/١.

312 ابن اثیر الکامل , ٥٢/٩ -٥٣. التاریخ الباهر, ٤٨, ابن واصل , ٥٥/١. صائغ , ١٦٩/١. شاعر, ٣٨-٤٠. هەروەها, (نك: ابوشامە الروضتین, ٣٢/١

313 ( مینۆرسکی ناوی ئەم ئەبولهەیجائەی لە گەڵ ناوی ئەبولهەیجا کوڕی مووسەك هەزەبانیی فەرمانڕەوای هەولێر لێ تێکچووە کەلە ساڵی ٥٠٢ك دا بوو بە گوێڕا یەڵ و شوێنکەوتەی سەلجووقییەکان و مێژووی مردنیشی روون نیە.) minorsky\kurds kurdistan,EI2,V,VI,p,455

ئەحمەدی کوڕیشی لەوێ لابردو کردی بە فەرمانڕەوای قەڵای تووشی و کوردێکی دیکەی لە جیاتی خۆی بە سەر قەڵای ئاشێبەوە دانا کە ناوی "باولئەرجی"[٣١٤] بوو.[٣١٥]

لە ساڵی ٥٢٨ ك داو دوای تەواوکردنی کاری کوردە حومەیدییەکان و داگیرکردنی تێکڕای قەڵەمڕەوەکەیان، عیمادەددین زەنگی شاری ئامێدی ئابڵووقە داو سەرەڕای ئەوەی کە هەموو ڕۆژێ ئاڵقەی گەمارۆی لە سەر تەنگتر دەکردن و دارستانەکانی دەوروبەری شارەکەی خاپوور دەکردن، نەیتوانی بە سەریدا زاڵ بێ و بێ گەیشتن بە ئاکام گەڕایەوە.[٣١٦]

موولەرزە پەیتاپەیتاکان لەو ساڵەدا، نێوەنێوە هێمنایەتیی و ئاسوودەیی خەڵکی تێکدەدا. ئیبنوئەسیر باسی موولەرزەیەکی بەهێز دەکات کە لە ساڵی ٥٢٩ دا، عێراق وموسڵ و جەزیرەو ناوچە چیاییەکانی گرتەوەو ئاپۆرەیەکی زۆری حەشیمەتی خەڵك بوونە قوربانیی.[٣١٧]

الراشد بالله خەلیفەی نوێی عەبباسیی کە دوای کوژرانی المسترشدی باوکی لە ساڵی ٥٢٩ ك دا بە خەلیفە هەڵبژێرابوو، لە کاتی گەمارۆی بەغدا لە لایەن سوڵتان "غیاث الدین مسعود"ی سەلجووقیی لە ٥٣٠ ك دا پەنای بردە بەر موسڵ و دوای زاڵبوونی مەسعود بە سەر بەغدا دا، بڕیاری وەلانانی الراشدی لە

---

[314] ناوبراو باوکی عەلی کوڕی ئەحمەدە کە بە مەشتووب ناسرابوو و پاشان لە شەڕی خاچهەڵگرەکان دا بوو بە هەواڵنێرو راسپێرابوو بۆ وتوێژ لەگەڵ پاشای فەرانسە. (نك: هەر ئەم توێژینەوەیە. بەندی چوارەم.)

[315] ابن اثیر الکامل, ٥٣/٩. ابن واصل, ٥٥/١-٥٦. شاعر, ٤٠-٤١.

[316] ابن اثیر الکامل, ٥٢/٩. ابن واصل, ٥٤/١.

[317] الکامل, ٧٠/٩.

زاناو فەقیهەکان وەرگرت و ابوعبدالله المقتفی ی لە جیات ناوبراو کردە خەلیفە.[٣١٨]

عیمادەددین زەنگی دوای دانانی المقتفی بۆ خەلافەت لە ساڵی ٥٣١ ك دا قازیی کەمالەددین مەحەممەد شارەزووریی[٣١٩] بە نوێنەرایەتیی خۆی ناردە دارالخلافەی بەغدا. نوێنەری زەنگی لە بەغدا بە ئاسانیی پێ بەمل نەبوو و بەوپەڕی تواناو شەهامەتەوە تا بەڵگەنامەی لابردنی الراشدی بە چاوی خۆی نەدی، پەیمانی بە خەلیفەی نوێ نەداو بە زیرەکیی و هۆشیاریی خۆی توانی چەندین بەش و دەڤەری تریش لە خەلیفە وەربگرێ بۆ عیمادەددین و کاتێ گەڕایەوە موسڵ فەرمانی لادانی راشیدی بۆ زەنگی هانی.[٣٢٠]

ساڵی دواتر قازیی کەمالەدین شارەزووریش دوای رووبەڕووبوونەوەی زەنگی لەگەڵ هەردوو سوپای خاچهەڵگرو رۆمییەکان لە بەرەی شەڕی شام، بە نوێنەرایەتیی زەنگی سەفەری کرد بۆ بەغدا بەمەبەستی داوای یارمەتیی وپاڵپشتیی سوڵتان لەغیاث الدین مسعود کە وەڵامی داواکەیان نەدایەوەو هاوکاری نەکردن و کاتێك زانی بە قسەی زل و چەنەلێدانی لووت بەرزانە بە ئاکام ناگات، سیاسەت و تاکتیکی (گوشاری نهێنیی) گرتە بەرو پیلانێکی زیرەکانەی داڕشت و پارەی دا بە هێندێك لات و لاکەوتەی شارو لە نێوەندی خوتبەی هەینی دا دەستیان کرد بە هاوارو هەیڕۆ هەیڕۆ بۆ ئیسلامیان گەیاندە دارو دیوارو خەڵکیان بۆ شەڕ هان دەدا. پیلانەکە سەری گرت و لە گەڵ بەرزبوونەوەی دەنگی (هاوار بۆ ئیسلام) لە نێو خوتبەکان دا، نوێژخوێنان دژی

---

[318] ابن اثیر,الکامل, ٧٦/٩. ابوشامە الروضتین, ٣١/١. حسیني, ١٤٠.

[319] بۆ شارەزاییی زیاتر لە ژیانی ناوبراو بڕوانە(نك: هەر ئەم لێکۆڵینەوەیە, بەندی شەشەم

[320] ابن اثیر الکامل , ٧٩/٩. التاریخ الباهر, ٥٤. ابن واصل , ٦٩/١-٧٠.

مەسعوود و کەمتەرخەمییەکەی وەخۆ کەوتن و بارەگای مەسعوودیان گەمارۆ داو ئەویش بە ناچاریی ملی بۆ خواستەکەی کەمالەددین دا. هاوکات لەگەڵ جمینی سوپای پشتیوان، پەیامنێری عیمادەددین هەواڵی پاشەکشەی رۆمییەکانی هێناو سوپا بڵاوەی کرد. [٣٢١]

شێرکۆو نەجمەددین ئەییوب هەر لەو ساڵەدا بە هۆی کوژرانی کەسێك بە دەستی شێرکۆ لە تکریت، بە فەرمانی مجاهدالدین بهروز لەوشارە دەرکران، و بە پشتبەستن بەو پێوەندییە دۆستانەی لەگەڵ عیمادەددین زەنگی هەیانبوو بەرەو موسڵ رۆیشتن و ئەویش بە گەرمیی بەخێری هێنان. [٣٢٢] هەر لەو شەوەدا کە ئەوان لە شار وەدەرکەوتن، سەلاحەددین چاوی بە دنیا هەڵێنا. [٣٢٣] نەجمەددین ی باوکی لەو دەربەدەرییەدا قەت پێی وانەبوو کە رۆژێك دادێ ئەو منداڵە ساوایەی دە بێتە کەسایەتییەك کە تێکڕای پاشاکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا سەری رێزی بۆ دادەنەوێنن و گەورەترین بەربەست دەبێ لە بەردەم خاچهەڵگرەکان.

ماوەیەکی کەم دوای گەیشتنیان بۆ موسڵ، قازیی بەهائەددین شارەزووری کە راوێژکارو یاری غارو قازیی قازییەکانی شارو هاوڕێ و هاوکارو پشتیوان و وەفاداری زەنگی بوو، بارگەی بەرەو نەمان تێکناو پێڵووی چاوەکانی لێکناو دەستی مەرگ بەرگی کتێبی ژیانی وێکنا. [٣٢٤] بە وتەی ئیبنوئەسیر

321 ابن اثير, الكامل , ٩/ ٩١-٩٢. ابوشامة الروضتين, ١/ ٥٣

322 ابن اثير, الكامل , ٣٤٣/٩. ابوشامة الروضتين , ١/ ١٢٩. ابن خلكان ١٤٢/٧-١٤٣. ابن واصل ١,/٨-٩.

323 ابن شداد يوسف بن رافع,٦. ابوشامة , لروضتين, ٣٣/١. ابن خلكان, ١٤٤/٧-١٤٥. ابوالفداء ٣,/٩١.

324 ابوشامة الروضتين ,٣٣/١.

موولەرزەیەکی بەهێز شام و جەزیرەو موسڵ و دیاربەکری خاپوور کردو خەڵکێکی زۆر لە ژێر داروپەردووی داڕووخاودا مردو ماڵاواییان لە ژیان کرد. [٣٢٥]

قازیی کەمالەددین شارەزووریی لە ساڵی ٥٣٤ ك و لە کاتی هێرشی زەنگی بۆ سەر شاری دیمەشق دا، لە لایەن زەنگییەوە فەرمانی پێدرا لە ژێر کاریگەریی پلەوپایەو دەسترۆیشتوویی خۆی دا، گەورەپیاوانی دیمەشق رازی بکات کە شارەکە بەدەستەوە بدەن و ئەوانیش دەسبەجێ و بە بێ هیچ مەرجێك داواکارییەکەیان قبوڵ کردو ئەویش لەو ولامە کوتوپڕەیان هەستی بە مەترسیی کردو بەلەبەرچاوگرتنی تەنگەبەریی و دژواریی رێگاکانی شارو مەترسیی کەوتنە کەمینی دیمەشقییەکان، ترس و دڵەتەپەی خستە ناخی عیمادەدین لە مەڕ رۆیشتنە ناو شار. زەنگیش متمانەی پێکردو لەوێوە سوپای بردە سەربەعلەبەك و دوای گرتنی شارەکە، بە نەجمەددین ئەییوبی سپارد. [٣٢٦]

بە مردنی میر ئەبولهەیجا ی کوڕی عبدالله هەکاریی لە ساڵی ٥٣٧ ك دا لە شاری موسڵ، ئەحمەدی کوڕی، قەڵای تووش ی بەجیهێشت و بە مەبەستی سەرپەرستیی و خاوەنداریی قەڵای ئاشێب، گەڕایەوە سەر کۆنەهەواری. بەڵام "باولئەرجی" ریگەی پێنەدا. چونکە دەیەویست بیداتە دەستی عەلی کوڕە بچووکەکەی ئەبولهەیجاو . عیمادەددین لە کاتی گرژیی ئەو ململانێیەو لەوکاتەدا کە ناتەباییەکەیان لە چڵەپۆپەدابوو گەیشتە سەریان و پاشان بە فێڵ وای نیشان دا کە پاشەکشە دەکاو لەم رێگایەوە کوردەکانی بەرەو کەوتنەداوی مەرگ پەلکێش کردو کت وپڕ گەڕایەوە سەریان و ژمارەیەکی زۆرو بەرچاوی لەو

---

[325] الکامل, ٨٩/٩.

[326] ابن اثیر, التاریخ الباهر, ٥٨-٥٩. ابوشامة الروضتین, ٣٣/١

کوردانه کوشت و بڕو قەڵاچۆ کردو دوای گرتنی قەڵای ئاشێب، سەرلەنوێ دروستی کردەوەو بە ناوی خۆیەوە ناوی نا "عیمادییە".

میرنەسیروددین جەقەر نوێنەری زەنگی لە موسڵ، پێشتر زۆربەی قەڵاکانی کوردەکانی ناوچەی هەکاری گرتبوو و ئەو چەند قەڵایەی کە لەبەردەستیاندا مابوون، دوای مردنی زەنگی "قەراجا" فەرمانڕەوای قەڵای عیمادییە، کە عەلی کوجەك بە فەرمانڕەوای ناوچەکە دایناوبوو، دەستی بە سەر داگرتن.[٣٢٧]

دوای تێکشکاندنی کوردەکانی هەکاریی عیمادەددین بەرەو قەڵەمڕەوی کوردە میهرانییەکان لە نزیك جەزیرەی ئیبنوعومەر ڕۆیشت و دەستی بە سەر قەڵا گرینگەکانیان داگرت. وەك قەڵای کەواشی، زەعفەرانی، شەعبانی، رابیەو....، شیاوی باسە کە زەنگی زۆر بە خێرایی ولە ماوەیەکی کەم دا دەستی بە سەر میهرانییەکان دارۆیشت و کەوتنە ژێر فەرمانییەوە. چونکە سەرکوتی بێ بەزەیانەی کوردە هەکارییەکان بە دەستی زەنگی بە تەواویی وورەی میهرانییەکانی دابەزاندبوو. هەر بۆیە عیمادەددین ئاخرین قۆناغی پێشڤەچوونی خۆی لە قەڵەمڕەوەکەیان دا لە ڕێگای وتوێژەوە بردە پێش و بە مەبەستی سەلماندنی نیازپاکیی خۆی زۆربەی گیراوەکانیانی لە ماوەی وت و وێژدا، ئازاد کردن.[٣٢٨]

تێوەگلانی هێزەکانی زەنگی و خەریك بوونیان بە سەرکوتکردنی کوردە میهرانی و هەکارییەکان، ڕێگەی بۆ فەرەنگییەکان خۆش کردو لەو دەرفەتە کەڵکیان وەرگرت و تا سەر سنوورەکانی دیاربەکر پێشڕەوییان کرد. عیمادەددین زەنگیش بڕیاری دا بە گرتنی روها– ناوەندێکی گرینگ و یەکەمینی ئەو میرنشینانەبوو کە کەوتبۆ ژێر چەپۆکیانەوە– وەڵامی ئەو هێرش و

---

[327] ابن اثیر الکامل , ٥٣,١٢٤/٩. التاریخ الباهر, ٦٤. ابوشامة الروضتین, ٣٦/١.شاعر, ٤١-٤٢.

[328] ابن ثیر الکامل ,٥٣/٩-٥٤. شاعر,٤٢-٤٤.

دەستدرێژییانەیان بداتەوە. هەر لەو پێناوەدا سەرەتا بە مەبەستی هەڵخەڵەتاندنی "ژوسیلین" فەرماندەی فەرەنگییەکان، چەند شەڕێکی پەرش و بڵاوی لە ناوچەکانی دیاربەکردا کردو کاتێك ژوسیلین دڵنیا بوو لەوە کە هێرش ناکاتە سەر روهاو بەجێی هێشت، بە پەلە سوپای هێنایە سەر[٣٢٩] و "ئیستیڤێن رانسینمان" بە گەیشتن و پشتیوانیی هێزی کوردو تورکەکانی جەزیرە، زەنگی لە ساڵی ٥٣٧ یان ٥٣٩ ك دا،[٣٣٠] شارەکەی گرت. پشتیوانیی کوردەکانی جەزیرە لە عیمادەددین، خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی خاچهەڵگرەکان داو هەروەك "فیلیپ حیتتی" رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ ئەو راستییەی ئاشکرا کردووە، بەم سەرکەوتنە قۆناغی سەرکەوتن و وڵاتگیریی فەرەنگییەکان کۆتایی هات و قۆناغی دژکردەوەی جیهانی ئیسلامییان[٣٣١] دەست پێکردو ئەو بەشداریی و رۆڵە بەرچاوەی کوردەکان دواترو لە سەردەمی سەلاحەددین دا گەیشتە چڵەپۆپە، کە لە شوێنی خۆیدا بە درێژیی باسی دەکەین.

رۆڵی بەرچاو و بەشداریی بێدرێغی کوردەکان لە یارمەتیدانی چەسپاندن و سەقامگیر کردنی پێگەی زەنگییەکەم لەو برگە هەستیارو قۆناغە ناسکەدا کە بە توندیی خەریکی شەڕی فەرەنگییەکان بوو، تەنیا لە بەرەکانی شەڕدا نەبوو. لە ساڵی ٥٣٩ك دا، قازیی تاجەددین یەحیا شارەزووریی برای قازیی کەمالەددین، کودەتای پڕمەترسی ئالب ئەرسەلانی سەلجووقی لە موسڵ سەرکوت کرد بەو فێڵە کە رازی کرد پاشەکشە بکا بۆ قەڵای شارو بەڵێنی سەڵتەنەتی پێداو لەوێ دەستگیری کردو بەو چالاکییە گەورەو گرینگە وێڕای

---

[329] ابن اثیر الامل , ۱۳۱/۹-۱۳۳ .ابوشامة الروضتین , ۳٦/۱ -۳۷ .

[330] تاریخ جنگهای صلیبی, ۲۷۳/۲ .

[331] تاریخ عرب, ۸۰۷ .

گێڕانەوەی دەسەڵات بۆ زەنگی، ڕێگەی گرت لە گەڕانەوەی زەنگی بۆ موسڵ کە مەترسی بەدەسەڵاتگەیشتنی فەرەنگییەکانی بەدواوە بوو و گڕی ئاگری ئاژاوەیەکی داکوژاند کە لەوانەبوو بە بڵێسەداربوونی گڕەکەی لەو بارودۆخە ناسکەدا، قەوارەی دنیای ئیسلام بخاتە مەترسییەوە.[٣٣٢] زەنگیش بە بیستنی هەواڵی چارەسەری قەیرانەکە بە دەستی شارەزووریی، هەناسەی ئاسوودەیی هەڵکێشاو بانگهێشتی زەینوددین عەلی کوجەك ی کرد کە لە هەولێر بوو و کردی بە دەسەڵاتداری موسڵ.[٣٣٣] هەولێریش لەو مێژووە بەدواوە تا گەڕانەوەی عەلی کوجەك لە ساڵی ٥٦٣ ك دا، لە بەر دستی نوێنەرەکانی دابوو. عیمادەددین دوای گەڕانەوە لە بەرەی شام لە درێژەی سیاسەتی سەقامگیرترکردنی دەسەڵاتەکەیدا، بڕیاریداکۆتایی بە هێزو دەسەڵاتی ئەو چەند قەڵا سەربەخۆیانە بێنێ کە تا ئەوکاتە نەکەوتبوونە ژێر دەسەڵاتییەوە. لە پێناوی پێکانی ئەو ئامانجەدا بۆخۆی لەشکرێکی گەورەو گرانی تەیار کردو بە بەشداریی کەمالەددین و تاجەددین هێرشی کردە سەر قەڵای جەعبەر[٣٣٤] و فەرمانیشی بە عەلی کوجەکی نوێنەری دا کە هێرش بەرێتە سەر قەڵای فەنەك کە لە نزیك جەزیرەی ئیبنوعومەر بوو. ئەو قەڵایە لە دێرزەمانەوە لە ژێر دەسەڵاتی کوردە بەشنەوییەکان دابوو کە نێوبانگی مێرخاسیی و حەواندنەوەو پێشوازیی کردن لە هەموو لێقەوماوێك و پەنادانی بێ ئەنوایان لە لایەن ئەو کوردانەوە، لە هەموو جێیەك دەنگی دابۆوەو لە کاتی ئەو هێرشە لە ژێر

---

[332] اصفهانی, تاریخ دولت ال سلجوق, ١٨٩. ابن اثیر الکامل, ٩/١٣٣-١٣٤. التاریخ الباهر, ٧٢. ابوشامة الروضتین, ١/٤٠-٤١.

[333] ابن اثیر الکامل , ٩/١٣٤. التاریخ الباهر, ٧٢. ابوشامةالروضتین, ١/٤١.

[334] ئەو قەڵایە لە نزیك سیففەین و نێوان بالیس و رققە هەڵکەوتووە. پێشتر پێی دەگوترا دەوسیر.(معجم البلدان, ٢/١٦٤).

سەرپەرستیی و فەرماندەیی میر حیسامەددین ی بەشنەویی لە قەڵاکەدا دەژیان. پتەویی، قایم و قوڵیی قەڵاکەو هێزی لەگیران نەهاتووی کوردە بەشنەوییەکان، نەیارانی هێرشبەری ناچار کرد گەمارۆی بدەن و بەرەبەرە حەڵقەی گەمارۆیان لێ تەسکتر بکەنەوەو بەم جۆرە بە چۆکیان دابێنن. بەڵام کوژرانی عیمادەددین زەنگیی لە کاتی ئابڵووقەی قەڵای جەعبەر لە ساڵی ٥٤١ ك دا، تووشی تەنگانەی کردن و لە پێناوی کۆنترۆڵ کردنی بارودۆخی موسڵ دا، بە پەلە گەڕانەوە ئەو شارە[٣٣٥] و بەم جۆرە قەدەر بوو بە پشتیوانی کوردە بەشنەوییەکان و قەڵای فەنەك هەر لە ژێر دەسەڵاتیان دا مایەوە.

موسڵ لە سەردەمی عیمادەددین زەنگییەکەم (٥٢١–٥٤١) دا بوو بە شارێکی ئاوەدان، رووله گەشە، پڕگوڵ ومیوە[٣٣٦] و هەر زانایەك دەهاتە وێ رووی دەکردە ماڵی قازییە شارەزوورییەکان و ئەوانیش رێزیان دەگرت و چەندی بۆیان لوابا، لە رێزگرتنیاندا درێغی یان نەدەکرد.[٣٣٧]

**١– ٣– ٢– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی سیف الدین غازییەکەم دا (٥٤١– ٥٤٤)**

دوای کوژرانی عیمادەددین سوپاکەی بوو بە دوو گرووپ. هێندێکیان لەگەڵ نوورەدین مەحمود زەنگی بەرەو دیمەشق رۆیشتن و ژمارەیەکی دیکەشیان کە قازیی کەمالەددین و تاجەددین شارەزووریش لە ریزی ئەوان دابوون، لەگەڵ ئالب ئەرسەلان کوڕی مەحموود سەلجووقی، گەڕانەوە بۆ موسڵ. قازی

---

335 ابن اثير الكامل , ٩ /١٤١-١٤٢. التاريخ الباهر, ٧٣. ابوشامةالروضتين, ٤١/١. غندور , ١٢٢. شاعر, ٤٥-٤٦.
336 ابن عبري ,٢٨٨.
337 صائغ , ١٧٣/١.

کەمالەددین و ژمارەیەکی تر لە گەورەپیاوەکان لە دەوری ئالب ئەرسەلان کۆبوونەوە.[٣٣٨] بەڵام ئامانجی خۆیان نەپێکاو عەلی کوجەك ناردی بە دوای کوڕەکەی تری زەنگی دا کە ناوی سیف الدین غازی بوو و لە شارەزوورەوە هێنایەوەو کردی بە جێنشینی عیمادەددین.[٣٣٩]

سیف الدین لە مەودای تەمەنی کورتی دەسەڵاتەکەی دا میراتگری ئەو هیمنایەتیە بوو کە لە سایەی حکومەتی سەردەمی باوکییەوە دابین ببوو و هەرچەندە وەك خۆی لە گەڵ هیچ گرفت و تەنگژەیەك بەرەڕوو نەبوو، بەڵام ئەو نەبوونیی و قات و قڕییە لەڕادەبەدەرەی کە لە ژێر گوشاری هێرشی سوپاو هێزی چەند میرو فەرماندەیەکی سوڵتان غیاث الدین مسعود بۆ سەر بەغدا لە ساڵی ٥٤٣ ك دا دەستی پێکردبوو، سێبەری رەشی دێوەزمەی مەرگ و نەمانی بە سەر جەزیرەدا زاڵ کرد.[٣٤٠]

سیف الدین ساڵێك دوای گەڕانەوە لە هێرشی بێ بەزەییانە بۆ سەر شاری ماردین و تالان کردنی ئەو شارە، کۆچی دوایی کرد[٣٤١] و قوتبەددین مەودوودی برای لە سەر کورسی دسەڵاتەکەی پاڵی دایەوە.

**١– ٣– ٣– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی قوتبەددین مەودوودی زەنگی دا (٥٤٤–٥٦٥ ك)**

دوابەدوای بە دەستەوەگرتنی جڵەوی دەسەڵات لە لایەن قوتبەددین، نوورەدین زەنگی کەوتە خۆو بە بیانووی ئەوە کە ئەو برا گەورەیەو لێهاتوویی

---

338 ابن خلكان ,٣/٤ .

339 ابن اثير الكامل , ١٤٤/٩. ابوشامة الروضتين, ٤٧/١. عزالدين ابن شداد, /١٦٧ .

340 ابن اثير الكامل , ١٦١/٩ .

341 همو التاريخ الباهر, ٩١. ابوشامة الروضتين, ٦٥/١ .

زیاتری هەیەو شیاوترە بۆ جێنشینیی، بەرەو شەنگار ڕۆیشت و ئەو شارەی داگیر کرد. بەڵام هۆشیاریی و زیرەکیی و وردبینیی جەمالەددین کە وەزیری قوتبەددین بوو، توانی ئاشتی لە نێوان ئەو دوو برایەدا سەقامگیر بکاو نوورەدین شەنگاری دایەوە دەستی قوتبەددین و بەرەو شام گەڕایەوە[٣٤٢] و گومانی تێدا نییە کە ئەو هێرشە کاریگەریی نالەباری لە سەر ژیانی کوردەکانی شەنگار هەبوو و شوێنەواری نەخوازراوی لە دوای خۆی بە جێ هێشت.

دوای مردنی **غیاث الدین مسعود سەلجووقیی** لە ساڵی٥٤٧ ک دا، معزالدین مەلیک شای کوڕی مەحموود، کە برازای غیاسوددین بوو، جێی گرتەوەو دەسەڵاتی گرتە دەست. مەسعوود بیلال هەر بە بیستنی هەواڵەکە، هەڵگەڕایەوەو شۆرشی کردو بەرەو حیللە ڕۆیشت. سوڵتان مەلیک شا بە مەبەستی سەرکوتی ناوبراو، سوپایەکی لە ژێر فەرماندەیی کوردێك بە نێوی میر سالار، بەرەو حیللە بەڕێ کرد. بە گەیشتنی میر سالار بۆ حیللە، مەسعوود داوای ئاشتبوونەوەی کرد. بەڵام لە کاتی وتو وێژدا خیانەتی کردو سالاری کوردی لە رووباردا خنکاند.[٣٤٣]

لە ساڵی ٥٥٠ ک دا قازیی تاجەددین یەحیا شارەزووریی کە لەو ساڵەدا قازیی جەزیرەی ئیبنو عومەر بوو، کۆچی دوایی کرد.[٣٤٤] تاجەددین ئەو کەسایەتیە بەرزە بوو کە بە لێزانیی و تێگەیشتوویی و وردبینیی خۆی توانی ئاژاوەی ئالب ئەرسەلان کوڕی مەحموود لە ساڵی ٥٣٩ ک دا، سەرکوت بکاو بڵێسەی گڕی ئاگرێکی دامرکاند کە لەوانەبوو بە هۆی گەڕانەوەی عیمادەددین زەنگییەکەم بۆ

---

[342] ابن اثیر الکامل , ١٦٧/٦ -١٦٨. ابوشامة الروضتین, ٦٧/١ .

[343] ابن اثیر الکامل ,١٨٧/٩ .

[344] همو,٢٢٢/٩ .

موسڵ، ڕێگە خۆش بکاو دەرفەت بڕەخسێنێ بۆ هێرشی بەربڵاو و هەمەلایەنەی خاچهەڵگرەکان، بەرەو ڕۆژهەڵات.

کاتێك سوڵتان موحەممەد سەلجووقیی لە ساڵی ٥٥٢ ك دا شاری بەغدای گەمارۆ دا، کوردەکانی دەڤەری موسڵ لە ژێر فەرماندەیی عەلی کوجەك دا، خێرا پاڵپشتیی و یارمەتییان کردو دوای گەڕانەوەی سوڵتان بۆ هەمەدان، کوردەکانیش بە بێ دەستەبەرکردنی هیچ دەسکەوتێك گەڕانەوە بۆ موسڵ.[٣٤٥]

قازیی کەمالەددین شارەزووریی دوای مردنی زەنگییەکەم، بەرەو شام ڕۆیشت و چوو بۆ لای نوورەدین کە کوڕە گەورەی زەنگییەکەم بوو ولە ساڵی ٥٥٥ ك دا، کرا بە قازیی قازییەکانی قەڵەمڕەوی نوورەدین و بڕیار درا لە کاتی پڕکاریی و سەرهەڵدانی گرفت و لەمپەرەکان دا،محی الدین ی کوڕی جێی بگرێتەوە.[٣٤٦]

نوورەدین مەحموود زەنگی ئەو شمشێرەی کە باوکی لە پێناوی بەگژداچوونەوەی فەرەنگییەکان دا هەڵیکێشابوو و لە بەرەی شەڕی شام دا بە کاری هێنابوو، نەخستەوە ناو کالان و قارەمانانە هەڵیگرتەوەو توانی زەبری گورچ وبڕ لە خاچهەڵگرەکان بدات. لە درێژەی ئەو شەڕانەداو لە ساڵی ٥٥٨ ك دا لە شەڕی بوقەیعەدا، لە ناکاو کەوتە کەمینی نەیارانەوەو کەمی مابوو بە هۆی تێگیرانی هەوساری ئەسپەکەی، بکوژرێ. بەڵام یەکێك لە سەربازە کوردەکانی خۆی کردە قوربانی و پەتی هەوسارەکەی بڕی و بە بایی گیانی خۆی، گیانی نوورەدینی دەرباز کرد. دوای تەواو بوونی شەڕەکە نوورەدین بەشدارانی دەربازبووی شەڕەکەی کۆ کردەوەو سامان و دارایی و خەڵاتی

345 حسيني, ١٦٣ -١٦٧. ابن تغردي , بردي, ٥/ ٣٢٥

346 ابن قلانسى ,٥٤٨. ابوشامـةالروضتين, ١/ ١٢٤.

بایەخداری پێبەخشین.[٣٤٧] ئەگەر نوورەدین لەو بڕگە هەستیارەدا گیانی دابا، دیار نەبوو کە شەڕی خاچهەڵگرەکان بە چ ئاراستەیەك دا دەڕۆیشت و چارەنووسی موسڵمانان چ دەبوو؟ کوردەکان کە هەر لە سەرەتای هێرشە سەرەتاییەکانی خاچهەڵگرەکانەوە، سەنگەری بەربەرەکانیی و بەرەنگاربوونەوە یان گرتبوو، جارێکی تریش بوونە بەربەستی بەردەم لافاوی لەشکری مەرگهێنی نەیاران. نوورەدین لە تۆڵەی ئەو شکستەدا ساڵێك دواتر بە پاڵپشتیی و یارمەتی هێزی پشتیوانی دەڤەری جەزیرە کە کوردەکانیش بەشێك بوون لە پێکهاتەی ئەو هێزە، سوپای فەرەنگییەکانی لە قەڵای حارم دا تووشی تێکشکانێکی بەژان کردو ژمارەیەك لە سەربازەکانی دوژمن لە ژێر زەبری شمشێری نوورەدین دا کوژران.[٣٤٨]

هەر لەو سەردەمەداو هاوکات لەگەڵ شڵەژانی بارودۆخی فاتمییەکان و راکردنی "شاور" وەزیری العاضد لدین الله خەلیفەی فاتمیی بۆ شام و داوای پشتیوانیی لە نوورەدین بۆ ئارام کردنەوەی میسر، ئەویش ئەسەدەددین شێرکۆ کە قارەمانترین سەرداری سوپاکەی و مامی سەلاحەددین بوو، وێڕای ژمارەیەکی تری کوردەکان، رەوانەی میسر کرد. لە ساڵی ٥٦٢ ك دا سەرەڕای رازینەبوون، سەلاحەددینی برازاشی لەگەڵ خۆی برد بۆمیسر.[٣٤٩]

زەینوددین عەلی کوجەك نوێنەری قوتبەددین زەنگی لە موسڵ کە عیمادەددین زەنگییەکەم لە ساڵی ٥٣٩ ك دا بانگهێشتی کردبوو بۆ ئەو شارەو چەندین هەرێم و ناوچەی کوردنشینی وەك شارەزوور و قەڵاکانی، ناوچەی

---

347 ابن اثير الكامل , ٣٠٢/٩. التاريخ الباهر, ١١٧. ابوالفداء ٤١/٣. ابن كثير ,٢٤٦/١٢.
348 ابن اثير الكامل ,٣٠٨/٩-٣١٠.
349 همو,٣٢٧/٩. ابن كثير, ٢٧٠/١٢.

هەکاریی، قەڵای ئامێد، شاری شەنگارو.... لە بەر دەست دابوو، بە هۆی لە دەستدانی هێزی بیستن و بینین لە ساڵی ٥٦٣ ك دا، جیا لە هەولێر هەموو ناوچە کوردنشینەکانی تری بە قوتبەددین مەودود زەنگیی سپاردو بۆخۆشی گەڕایەوە هەولێرو دوای چەند مانگێك هەر لەوێ دواهەناسەی داو بەرەو هەوارگەی نەمان باری کردو زین الدین یوسف ی کوڕی بوو بە جێنشینی.[٣٥٠]

ئەسەدەددین شێرکۆ سەرداری ناوداری نوورەدین لە ساڵی ٥٦٤ ك دا دوای گرتنی میسرو گەیشتن بە پلەی وەزیرایەتیی العاضد، خەلیفەی فاتمیی، کۆچی دوایی کردو سەلاحەددینی برازای، جێی گرتەوە. چوار سەردارەکەی شێرکۆ کە بە هاوشانیی و هاوکاروانیی لەگەڵ شێرکۆدا چووبوونە میسرو هەرکامیان چاوی تەمای لە جێنشینیی بڕیبوو، بە بیستنی هەواڵی جێنشینیی سەلاحەددین، شڵەژان. بەڵام فەقێ زیائەددین عیسا هەکاریی زیرەکانەو بە لەباریی ناڕازییەکانی بێدەنگ کردن و بە سیف الدین عەلی کوڕی ئەحمەد مەشتووب[٣٥١] هەکاریی کە هاووڵاتیی خۆی بوو، گوت: رکابەرەکانی توانای بێدەنگیی و رەزامەندییان نییە لە بەرامبەر گەشەی دەسەڵاتەکەی داو ئەوەی وە بیر شەهابەددین حارمی هێنایەوە – کە خاڵی سەلاحەددین بوو– ململانێ لەگەڵ خوارزادا، کاڵفامیی و دوور لە ژیرییەو بە قوتبەددین یەنال هەزەبانیی[٣٥٢]

---

[350] ابن ثیر الکامل , ٣٣/٩. التاریخ الباهر, ١٣٥. ابوشامة الروضتین,١٥٢/١. ابن خلکان, ١١٦/٤

[351] بۆیەپێی دەگوترا مشطوب (قەڵشیو) چونکە لە شەڕێك دا لاچاوی بریندار کرابوو و قەڵشی تێکەوتبوو

[352] ( جێی سەرسامی یە سەرەڕای ئەوە کە هەموو سەرچاوە مێژووییەکان کۆکن لە سەر ئەوە کە سیف الدین مەشتووب هەکارییەو قوتبەددینیش هەزەبانی یەو تێکڕای توێژەرو شارەزایانی مێژووش ئەو راستی یە دەزانن کە ئەو ئەو دوو تیرە (هەکاریی و هەزەبانیی) کوردن, "سوهەیل تەقوش" لە کتێبەکەی خۆیدا ئەو دوو میرە بە تورك ناو دەبا.) ((نك:دولت ایوبیان \٢٦))

گوت: کە ئەویش برازای ئەبولهەیجای فەرمانڕەوای هەولێر بوو، (تۆ و سەڵاحەددین هەردووکتان کوردن و دەتوانن پێکەوە رێگە بگرن لە دەسەڵاتی تورکەکان"[٣٥٣] و تەنیا چوارەمین سەردار " یاروقی تورکمان" لە بەرامبەر زیائەددین دا پڕ روویی و رووهەڵماڵاویی کردو گەڕایەوە بۆ لای نوورەدین لە شام.[٣٥٤]

هەر چەند قسە کردن لە مەڕ هەستی ناسیۆنالیستیی لەو سەردەمەدا هەڵەیەکی مێژووییە، بەڵام ئەوەش راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە زانای شەرعزان زیائەددین هەکاریی بە ئاماژەکردن بە پێوەندی نێوان کوردە نەیارەکانی سەڵاحەددین، توانی رێگەیان لێبگرێ و لە تێکهەڵچوون لەگەڵ سەڵاحەددین، وریایان بکاتەوەو ناشێ ئەو هەوڵ وماندووبوونە پڕبایەخە لە لایەن خوێنەری کوردەوە بە هەند نەگیرێ کە دوای تێپەڕینی چەندین سەدە بە سەر ئەو سەردەمەدا، ئێستاش ناچارە لە پێناو سەلماندنی بوونی نەتەوەکەی دا پەنا بەرێتە بەر پێناسەی نەتەوەیی خۆی. نوورەدین زەنگی کە لە دیمەشقەوە گوێ بیستی هەواڵ و رووداوەکانی میسر دەبوو و سەڵاحەددینیش بە نوێنەرایەتیی ئەو دەسەڵاتی میسری وەرگرتبوو، بڕیاری لێبڕاوانەتری دا بۆ بەگژداچوونەوەی فەرەنگییەکان و لە ساڵی ٥٦٥ ك دا کاتێك هەواڵی دابەزینی هێزی پاڵپشتیی ئەوانی بیست لە دیمیات، قوتبەددین یەنال هەزەبانیی بەرەو دیمیات بەڕێ کرد.[٣٥٥] ئەو موولەرزە سامناکەی کە هەر لەو ساڵەدا سەرانسەری میسرو جەزیرەو عێراقی لەرزاندەوەو لە شام تەوژمێکی زۆرتری هەبوو، زەبری

[353] ابن اثير ,التاريخ الباهر,١٤٢.

[354] همو الكامل, ٩/٣٤١-٣٤٣.

[355] ابو شامه الروضتين, ١/١٨٤.

بە ژان و پڕکارەساتی بە سەر هەردوو بەرەی موسڵمان و فەرەنگییەکان هێناو هەردوولا ناچار بوون بە پێچەوانەی حەزی خۆیان پەیمانی شەڕداکوژان لە نێوانیان دا ببەستن.[٣٥٦] ماڵی قازیی محی الدین شارەزووریش لە حەڵەب بە هۆی تەوژمی بە تینی ئەو موولەرزە بە تەواویی وێران بوو و تووشی تەمی خەمی کرد. مێژوونووسی بەنێوبانگ عیماد کاتب ئیسفەهانیی کە ماوەیەك دوای ئەو کارە ساتە سەردانی قازیی کردبوو، هۆنراوەیەکی سەبارەت بەو کارە ساتە بۆ قازیی هۆنییەوە.[٣٥٧]

دوای تێپەڕینی دوو مانگ بە سەر کارەساتی ئەو موولەرزەدا، قوتبەددین مەودوود زەنگی بە بێدەنگیی ماڵاوایی لە رەنگی ژیان کردو رۆژی تەمەنی لە رۆژئاوای مەرگ ئاوا بوو و سیف الدین غازی دووهەم ی کوڕی جێی گرتەوە.

**١–٣– ٤– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی سیف الدین غازی دووهەم دا(٥٦٥– ٥٧٦ ك)**

نوورەدین مەحموود زەنگی بە بیستنی هەواڵی مەرگی براکەی، نیازی موسڵی کەوتە سەرو بەرەو جەزیرە رێی گرتە بەرو دوای گرتنی نوسەیبین و شەنگار، گەمارۆی موسڵی داو سەرەنجام لە ساڵی ٥٦٦ ك دا، شارەکە خۆی بەدەستەوەدا. نوورەدین زەنگی دوای گرتنی موسڵ، فەخرووددین عەبدولمەسیح ی وەزیری سیف الدین کە هۆکاری سەرەکیی هێرشەکە بوو، لەگەڵ خۆی برد بۆ شام و کۆتایی بە سێبەری رەشی رێ وشوێنە چەوسێنەرەکانی لە ناوچە

---

356 ابن اثیر الکامل , ٩/٣٥٣-٣٥٤. ابوشامة الروضتین, ١/١٨٤

357 همو , ١/١٨٤.

بەردەستکراوەکان دا هێناو دوای چل رۆژ مانەوە لە موسڵ، گەڕایەوە بۆ شام.[٣٥٨]

لە گەڕانەوەیدا شاری شەنگاری دایە دەستی برازاکەی خۆی عیمادەددینی دووهەم. قازیی کەمالەددین شارەزووریی نەیاری ئەم کارە بوو و پێی وابوو بە هۆی ئەوە کە عیمادەددین گەورەترە لە سەیفەددینی دووهەم کە فەرمانڕەوای موسڵ بوو، پەیڕە ویی لە فەرمانەکانی سەیفەددین ناکا. بەڵام نوورەدین گوێی بەو پێشبینییە نەداو سەرەنجام لە ساڵی ٥٧٠ ك دا قسەکەی شارەزووریی وەك راستییەکی حاشاهەڵنەگر هاتە دی.[٣٥٩]

لە ساڵی ٥٦٧ ك دا سەلاحەددین دەوڵەتی فاتمییەکانی لە دەسەلات لاداو بە هۆی گەیشتنی پەیامنێری نوورەدین بۆ میسر کە دانان و لادانی سەلاحەددینی لە سەر کورسی دەسەلاتی میسر بە مافی خۆی دەزانی و ئەو راستییەی لە رێگەی پەیامنێرەکەیەوە گەیاندبۆ بەر گوێی سەلاحەددین، گرژییەك کەوتە نێوان نوورەددین و سەلاحەددین و بەلام بە هۆی تێگەیشتوویی و وردبینیی نەجمەددینی باوکی، گرفتەکە چارەسەر کراو هەردوولا بە مەرجی هێرشی هاوبەش بۆ سەر فەرەنگییەکان، پەیمانی ئاشتییان بەست. لە ساڵی ٥٦٨ ك دا "کەڕەك" لە ئابڵۆقەی سەربازیی سەلاحەددین دابوو، سەرەڕای بڕیارو رێکەوتنی پێشوو و لە بەر ئەگەری مەترسیی روویەڕووبوونەوە لەگەڵ نوورەدین بە هۆی ناکۆکیی ساڵی پێشتر، بە ماڵەوە گەڕایەوە میسرو فەقێ زیائەددین عیسا هەکاریی بە مەبەستی پۆزش و داوای لێبوردن رەوانەی لای نوورەدین کردو رایسپارد کە بە نوورەدین بڵێ بە هۆی نەخۆشیی باوکی سەلاحەددین—کە

---

358 ابن اثیر الکامل , ٣٥٩/٩-٣٦٠. التاریخ الباهر, ١٥٢-١٥٣. ابوشامةالروضتین , ١٨٧/١-١٨٨.

359 ابن اثیر,الکامل , ٣٦١/٩.

لە کاتی نەبوونی سەلاحەددین دا فەرمانڕەوای میسر بوو- و مەترسیی دەست بەسەرداگرتنی موسڵ لە لایەن شیعەکانەوە لە کاتی مەرگی باوکی دا، ناچار بوو بگەڕێتەوە میسر. ئەویش بە گەرمیی پێشوازیی لە زیائەددین کردو دڵڕەنجاویی خۆی لە سەلاحەددین شاردەوە ! سەلاحەددینیش بە گەیشتنی بۆ میسر بە سەر تەرمی باوکی داکەوت کە لە ئەسپ کەوتبۆ خوارەوە.[٣٦٠]

لە ساڵی ٥٦٨ ک دا قازیی کەمالەدین کە قازیی قازییەکان و چاودێری ئەوقاف نوورەدین بوو، بە نوێنەرایەتیی نوورەدین چوو بۆ بەغداو داوای لە خەلیفە المقتفی کرد قەڵەمڕەوی ژێر دەسەڵاتی نوورەدین کە شام و میسرو جەزیرەی دەگرتەوە، بە فەرمیی بناسێ. بە وتەی ئیبنو ئەسیر (دەزگای خەلافەت تا ئەو کاتە بەو چەشنە گەرم و گوڕییە پێشوازیی لە هیچ وەفدێك نەکردبوو"[٣٦١] و خەلیفەش تێکڕای داواکارییەکانی پەسند کرد. دوای مردنی نوورەدین زەنگی لە ساڵی ٥٦٩ ک دا، کەمالەددین ئەندامێکی ئەو کۆڕە بوو کە مەلیك ساڵحیان بۆ جێنشینیی هەڵبژارد. کەمالەددین کە لە هەمووان زیاتر ئاگاداری رادەی هێزو دەسەڵاتی سەلاحەددین بوو، لە کاتی وتو وێژ لە مەڕ ئەو بابەتە گرینگە، بەوپەڕی وردبینی و هۆشیارییەوە هەوڵیدا کە ئەندامانی تری کۆڕەکەش رازی بکا بانگهێشتی سەلاحەدین بکەن بۆ دیمەشق و سەبارەت بە جێنشینی نوورەدین راوێژی لەگەڵ بکەن. بەڵام ئەوان بە هۆی ترسیان لە لەقبوونی پێگەی خۆیان لە کاتی هاتنی سەلاحەددین دا، ئەو پێشنیارە یان پەسند نەکرد.[٣٦٢] بەڵام دوای ساڵێك لە گرینگیی هێزی سەلاحەدین تێگەیشتن

360 همو ,٣٨٥/٩.

361 الكامل , ٣٨٧/٩.

362 ابن اثير الكامل, ٣٩٦/٩. التاريخ الباهر,١٦٢. ابن واصل ,٣/٢.

و هاوڕێ لەگەڵ قازیی کەمالەددین بانگهێشتیان کرد بۆ دیمەشق و ئەویش بە حەوسەد سوارەوە بەرەو ئەوێ کەوتە ڕێ. بەڵام هەر بە گەیشتنی بۆ قەڵای شار قەڵا بەرەوڕووی وەستاو بەرگریی لە بەرامبەرداکرد. سەڵاحەددینیش قازیی کەمالەددین ی نارد بۆ ئەوەی وتو وێژ لەگەڵ دانیشتووانی قەڵا بکات و ئەویش لەو کارەدا سەرکەوتنی وەدەست هێناو رازی کردن کە خۆیان بە دەستەوە بدەن.[٣٦٣]

سەرەڕای ئەوە کە سەلاحەدین پێگەیەکی پتەو و سەقامگیری هەبوو لە دیمەشق دا، کوژرانی نوێنەرەکەی لە میسری سەروو تووشی تەنگژەی کرد. ئەو نوێنەرە کوردێکی حەکەمیی و برای[٣٦٤] حسام الدين ابوالهيجاء السمين و یەکێك لە ئازاترین سەردارانی سەڵاحەددین بوو. ئەبولهەیجاء بە مەبەستی تۆڵەی براکەی بەرەو میسر رۆیشت و بە پاڵپشتیی ئەو سوپایەی سەڵاحەددین خستبوویە ژێر فەرمانییەوە، توانی بکوژان بە سزای تاوانەکەیان بگەیەنێ و هێمنایەتیی بۆ ناوچەکە بگێڕێتەوە.[٣٦٥]

هاوکات لەگەڵ بە دەسەڵات گەیشتنی سەڵاحەددین لە دیمەشق دوای گرتنی شارەکە، نەزاریەکانی[٣٦٦] شام چەند جارێك هەوڵیان دا سەڵاحەددین تیرۆر

---

[363] ابن اثير الكامل ,٩/٤٠٤-٤٠٦. ابن واصل ,٢/٢٠. ابن تغري بردي, ٦/٧٣.

[364] مینۆرسکیی بە هەڵەداچووەو نووسیویەتی ابوالهیجا ,فەرمانڕەوای ئەو شوێنەیە.(نك: پژوهشهایی در تاريخ ققفاز, ١٩٧.

[365] ابن اثير الكامل , ٩/٤٠٤.

[366] ( دوای وەفاتی ئیمام جەعفەری سادق شەشەمین پێشەوای شیعەکان لە ساڵی ١٤٨ ی کۆچیی دا, شیعەکان کێشەو ململانێیەکی زۆریان کەوتە نێوان لە سەر جێنشینیی ئەو. هێندێك لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە ئیمامەت لە دوای جەعفەری سادق مافی بێ ئەملاوئەولای ئیسماعیلی کوڕیەتی وبەم جۆرە بیرکردنەوەیان ڕێبازی خۆیان لە شیعەکانی تر جیا کردەوەو بە ((ئیسماعیلییە)) ناسران. بە تێپەڕینی

بکەن. لە کاتی دووهەمین هەوڵیان دابوو کە یەکێك لە سەردارو فەرماندە کوردەکان بە نێوی میر داود کوڕی مەنکولان بە بایی گیانی خۆی بەربینگی بە هێرشبەری تیرۆریست گرت و بڕستی لێ بڕی و کوشتی و گیانی سەلاحەددینی دەرباز کردو بۆخۆشی ماوەیەکی کەم دوای ئەو ڕووداوە بە هۆی کاریی بوونی برینەکەی گیانی سپارد.[٣٦٧] سەیفەددین غازی فەرمانڕەوای موسڵ کە لە پێشڤەچوونەکانی سەلاحەددین ترسی لێ نیشتبوو و لە ٥٧١ ك دا سوپاکەی لە شەڕی بەنێوبانگی" قوڕون حەمات" بە توندیی لە بەرامبەر هێزەکانی سەلاحەددین دا تیکشکابوون، ساڵێك دواتر قازیی عیمادەددینی کوڕی قازی کەمالەددین شارەزووریی بە نوێنەرایەتیی خۆی ناردە میسر بۆ لای سەلاحەددین. ئەویش هاوڕێ لەگەڵ وەفدی فەرمانڕەواکانی ماردین و حەسەن کێف بە گەیشتنی بۆ میسر، لەگەڵ پێشوازیی گەرمی سەلاحەددین بەرەو ڕوو بوو[٣٦٨] کوردە بەشنەوییەکانی قەڵای فەنەك کە پاش کوژرانی زەنگییەکەم لە ساڵی ٥٤١ ك دا، ترسیان لە سەر نەمابوو، نەیانتوانی لە باری نالەباری سیف الدین غازی دووهەم، کەڵك وەرگرن و لە جیاتی ئەو کارە خۆبەخۆ کەوتنە گیانییەکتر. فەرمانڕەوای قەڵاکە برایەکی بە نێوی عیسا هەبوو کە یاخیی ببوو

---

ڕۆژگار ئیسماعیلییەکانیش لە نێو خۆیان دا توشی جیاوازیی و جیابوونەوە بوون و دوای کۆچی دوایی المستنصر فاطمي لە میسر لە ساڵی ٤٨٧ ك . دا, هێندێك لەو شیعانە پێیان وابوو کە ئیمامەت مافی "نەزار"ی کوڕیەتی و کۆمەڵێکی تر دەیانگوت دەبێ کوڕەکەی تری (المستعلی) ببێتە پێشەواو بە هۆی ئەم دووبەرەکییە, دوو گرووپ لە نێو دڵی بزووتنەوەی ئیسماعیلییەکان لە مێژوودا سەریان هەڵدا بە نێوەکانی "نەزاریە" و "موستەعلەوییە". (( هاجسن, ٦٤-٨٠ , صابری ١٢٨-١٢٩)).

[367] اصفهاني ,الفتح القسّی, ٢١٠-٢١١. ابن واصل , ٢/٤٤-٤٥. بۆ زانینی درێژەی ئەم باسە بڕوانە: (نك: طقوش , ٩١-٩٤.

[368] ابوشامه الروضتین , ٢٦٢/١.

و شۆڕشی کردبوو. عیسا بە یارمەتیی و پشتیوانییەکێك لە هاوڕێکانی ئیبراهیم، دەستی بە سەر قەڵادا گرت و برایمی برای لە بەرزترین شوێنی قەڵاکە دا بەند کردو ژمارەیەك لە سەربازەکانی بۆ چاودێریی و پارێزگاریی لە قەڵا، لە سەر بان دانا. رۆژێك دواتر کاتێك عیسا هات قەڵا وەربگرێ، هاوسەری برایم کە لە لایەکی تری قەڵادا بەند کرابوو، پەنجەرەی زیندانەکەی خۆی شکاندو خۆی رزگار کردو بە جل و بەرگی خۆی پەتێکی دروست کردو هاوڕێیانی ئیبراهیمی هەڵکێشایە سەرەوە. هاوارو دەنگە دەنگی میر عیسا لەو پەڕی دەجلەوە کە بانگی سەربازەکانی خۆی دەکرد، نەگەیشتە گوێی پاسەوانەکانی سەربان و سەرەنجام میر برایم لە بەندیخانە رزگاری بوو و دیسان جڵەوی دەسەڵاتی گرتەوە دەست خۆی.[٣٦٩]

هەر لە مانگی موحەڕڕەمی ئەو ساڵەدا، قازیی کەمالەدین شارەزووریی قازیی قازییەکانی نوورەدین و چاودێری ئەوقاف و دیوانەکەی، کۆچی دوای کرد.[٣٧٠]

سەلاحەددین کە بە مەبەستی چاودێریی و رێکوپێك کردنی کاروباری میسر ماوەیەك لەوێ مایەوە، لە مانگی جمادی الثاني ساڵی ٥٧٣ ك دا گەڕایەوە بۆ شام. بەڵام کوت و پڕ لە "رەملە" لەگەڵ هێرشی فەرەنگییەکان بەرەوڕوو بۆوە. فەقێ زیائەددین عیسا هەکاریی ئازاترین کەسی نێو ریزی سوپای سەلاحەددین بوو و سەرەڕای ئازایەتیی و گیانبازیی ئەو و سەربازانی تری سەلاحەددین، موسڵمانەکان تووشی شکست هاتن و بە هەموو لایەك دا پەرتەوازە بوون. کاتێك شەو هات و تاریکایی بە سەر وڵات دا زاڵ بوو، فەقێ

369 ابن اثیر الکامل, ٩/ ٤٢٥-٤٢٦.

370 همو, ٤٢٧/٩.

هەکاریی و زەهیروددین ی برای ڕێگەیان لێ بزر بوو و بە پێچەوانەی ئاراستەی ڕۆیشتنی خۆیان بەرەو سوپای دوژمن ڕۆیشتن و کەوتنە چنگیانەوە.[٣٧١]

فەرەنگییەکان کە مەستی ئەو سەرکەوتنە بوون، لە خۆبایی بوون و گەمارۆی شاری "حومات"یان دا کە لە بندەستی شەهابەددین حارمی دابوو و هێزی پشتیوانیشیان بۆ هات و ورەو هێزیان زیاتر بوو. بەڵام سەیفەددین مەشتووب هەکاریی کە لە نزیکی ئەو شوێنە بوو، بروسکەئاسا خۆی گەیاندە شارو دوای چەند شەڕێکی سەخت و دژوار، هێرشبەرە نەیارەکانی لەوێ ڕاونان.[٣٧٢]

لەساڵی ٥٧٤ ك دا وشکە ساڵی شام و جەزیرەو عێراقی گرتەوەو لە ئاکام دا گرانی و قات و قڕی و نەبوونی سێبەری ڕەشی بەسەر ناوچەدازاڵ کردو بۆ ماوەی ساڵێك درێژەی هەبوو، بە رادەیەك کە خەڵك لە بەر ناچاریی گۆشتی مردارەوەبوویان دەخواردو ئەو بەدخۆراکییەش پەتایەکی مەرگهێن و دڵهەژێنی بە دواوە بوو و لافاوی مەرگ شەپۆلی لاشەی مرۆڤەکانی بەرەوجیهانی فانی هانی و خەڵکی ئەو ناوچانەی بە پۆل لە ناو برد.[٣٧٣]

دوای سەرکەوتنی سەلاحەدین لە ساڵی ٥٧٥ ك بە سەر فەرەنگییەکان لە شەڕی "مەرج عیون" دا، هەردوو لایەنی شەڕ دیل و گیراوەکانیان گۆڕینەوە. یەکێك لە شارەزاترین و لێهاتووترین کەسی دیلەکان فەقێ عیسا هەکاریی بوو کە لە میانەی ئەو ئاڵ وگۆڕەدا لە بەندی فەرەنگییەکان رزگار بوو.[٣٧٤] سەڵاحەددین دوای ئەو سەرکەوتنە قازیی زیائەددین شارەزووریی بە مەبەستی

---

371 همو,٤٢٨/٩-٤٢٩. ابن واصل , ٦١/٢.

372 همو,٦٤/٢

373 ابن اثیر الکامل , ٤٦٣/٩. هه روه ها همو, التاریخالباهر,١٧٨-١٧٩. ابوشامة الروضتین,٥/٢.

374 ابن واصل , ٧٦/٢.

دیدارو چاوپێکەوتنی خەلیفە "المستضئی" بەرەو بەغدا رەوانە کرد. بەڵام بەر لە گەیشتنی شارەزووریی خەلیفە کۆچی دوایی کردو ئەویش بەیعەتی بە خەلیفەی نوێ الناصرلدین الله داو سەلاحەدینیش لە شام خوتبەی بە ناوی خەلیفەی نوێ دەست پێکرد.[375] هێشتا هەولێر پشتی چەماوەی لە ژێر باری گرانی وشکەساڵیی و پەتای ساڵی پێشوو راست نەکردبۆوە، کە موولەرزەیەکی سامناك جارێکی تریش قەڵاو گوندەکانی دەورویەری شاری خاپوور کرد.[376]

سیف الدین غازی دووهەم لە ساڵی ٥٧٦ ك دا کۆچی دوایی کردو هەرچەندە لە سەرەتاوە دەیەویست معزالدین سەنجەرشا کوڕە بچووکەکەی ببێتە جێنشین لە دوای خۆی، لە سەر بنەمای راوێژو سپاردەی میرەکان و مەترسیی هەڵگەڕانەوەی عزالدین مەسعوود لە سەنجەر شای برای و بە لە بەرچاوگرتنی دەسەڵاتی سەڵاحەددین، رای خۆی گۆڕی و عزالدین مەسعوودی بۆ جێنشینی خۆی دیاریی کردو جەزیرەی ئیبنوعومەرو قەڵاکانی دەوروبەری دا بە سەنجەرشاو عەقری حومەیدییەشی سپاردە دەستی کوڕەکەی تری کە ناوی ناصرالدین کەسەك بوو.[377] بە دیاریکردنی سەنجەرشا بۆ پلەی فەرمانڕەوایی جەزیرە، بناغەی لقی جەزیرەی زەنگییەکان دامەزرا.

**١- ٣- ٥- کوردەکانی جەزیرە لەسەردەمی عزالدین مسعود دا (٥٧٦-٥٨١ ك)**

بە گەیشتنی دوو نوێنەری خەلیفە بۆ شام بۆ لای سەڵاحەددین لەو ساڵەدا، سەڵاحەددین یەکێك لەو دوو نوێنەرەی بانگهێشت کرد بۆ میسرو لە گەڵ خۆی

375 ابوشامة الروضتين, ١٥/٢.
376 همو, ١٦/٢
377 ابن اثير الكامل ,٤٤٦/٩-٤٤٧. ابن عبری, ٣٠٣.

بردو زیائەددین شارەزووریی لەگەڵ نوێنەرەکەی ترو وەفدی هاوڕێی دا، ناردەوە بەغداو گەڕانەوەی خۆی بەرەو میسر بۆ خەلیفە باس کرد.[٣٧٨]

دوای ساڵ و نیوێك مانەوە لە میسرلە ساڵی ٥٧٨ ك دا، سەلاحەددین بە مەبەستی چوون بۆ شام و لەوێوە هێرشکردنە سەر مووسڵ، میسری بەجێ هێشت. چونکە لە لایەك ئەو زانیارییانەی بە دەست گەیشتبوو کە عزالدین مەسعوود فەرمانڕەوای ئەو شارە بە نهێنیی پێوەندی بە فەرەنگییەکانەوە گرتووەو لە لایەکی تریشەوە بە هۆی پێوەندی خۆی لەگەڵ میرو سەردارەکانی عزالدین، بەردەوام لە لایەن ئەوانەوە بۆ ئەو هێرشە هان دەدرا.[٣٧٩]

هاوکات لەگەڵ هێرشی سەلاحەددین بۆ جەزیرە، هێندێك فەرمانڕەوای ناوچەکە رەگەڵی کەوتن. هەر بۆیە توانی هێندێك شاری سەر رێگای خۆی بە ئاسانیی بگرێ. وەك شارەکانی رەققە، خابوور، سەروج و نوسەیبین. شاری نوسەیبن ی دایە دەستی سەرداری ئازاو لێهاتووی کورد ابوالهیجاو السمین و شاری خابووریشی سپاردە دەستی  کوردێکی تری هەکاریی کە ناوی جەمال الدین خوشتەرین بوو.[٣٨٠]

سەلاحەدین دوای راوێژکردن لەگەڵ فەرماندە سەربازییەکانی لە نوسەیبین، رووی کردە موسڵ. بەڵام وارشی بەرزی شارەکە لە دەستەبەرکردنی ئاکامێکی باش لە رێگای سەربازییەوە هیوابڕاوی کردو دواتریش کە لە رێگەی وتو وێژی سیاسییەوە لەگەڵ عزالدین نەگەیشتە هیچ ئاکامێك، بڕیاری دا لە رێگەی

---

378 ابن واصل, ٩٥/٢.

379 بۆ زانیا ریی زیاتر بڕوانە: ابن اثیر الکامل ,٩/ ٤٦٢. ابوشامةالروضتین,٣٠/٢. صائغ ١٨٧/١.طقوش, ٦٣-٦٧.

380 ابن اثیر, الکامل , ٤٦٢/٩-٤٦٣. ابوشامة الروضتین , ٣٢/٢. عزالدین ابن شداد, ١٣٤/٣. ابن واصل , ١١٩/٢.

تەسکتر کردنەوەی ئاڵقەی گەمارۆی سەربازییەوە، بگاتە ئامانجی خۆی. هەر بەو مەبەستە سوپای هێنایە سەر شەنگار کە قورگی شاری موسڵ بوو. شرف الدین برای عزالدین مسعود کە فەرمانڕەوای شار بوو، بەربەرەکانییەکی توندی کرد. بەڵام یەکێك لە سەردارو فەرماندەکانی شار کە کوردێکی زەرزاریی بوو، دەرفەتی بۆ سەلاحەددین رەخساندو هێنایە ناو شارەوە. دوای ئەو کارە شرف الدین ورەی رووخاو لە موحەڕڕەمی ساڵی ٥٧٨ ك دا شارەکەی بە دەستەوە دا. بە گرتنی شەنگار بەپشتیوانی کوردە زەرزارییەکان پێگەی سەلاحەدین پتەو وسەقامگیرتر بوو و وئەو شارە بوو بە قەلایەکی قایم وسەنگەرێك بۆ پاراستنی هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی.[٣٨١] سەلاحەدین دوای ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی شار، لە ژێر کاریگەری تەوژمی تەزووی سەرمای زستانی ئەو ناوچە دا، گەڕایەوە بۆ نوسەیبین وکاتێك هەستی کرد خەڵکی شارەکە سکالایان لە رەفتاری ابوالهیجاو ی فەرمانڕەوایان هەیە، لە سەر کورسی دەسەڵات لایبردو لەگەڵ خۆی بردی بۆ حەڕڕان.[٣٨٢]

دوای ئەوە کە هاوپەیمانەکانی عزالدین مسعودیش نەیانتوانی ببنە بەربەست لە سەر رێگای سەلاحەددین، ئەویش بە مۆڵەت خواستن لە خەلیفە الناصرلدین الله بەرەو ئامێد رۆیشت کە لە چوارچێوەی سنووری قەڵەمڕەوی سەلجووقییەکان دابوو و بەهائەددین کوڕی نیسان فەرمانڕەوای شارەکە بوو. قەلای شارەکە کە لە پتەوییدا وێردی سەر زاری هەموو کەس بوو، سەلاحەددین ی ناچار کرد لە پشت قەلاکەوە گەمارۆی بدات و چاوەڕوان بێت. دوای تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر بە سەر ئەو گەمارۆیەدا، سەلاحەدین چەند نامەیەکی

[381] ابن اثير الكامل , ٩/ ٤٦٦. ابن واصل , ٢/١٢٣-١٢٤. شميساني, مدينة سنجار من....., ١٣٥.
[382] ابن اثير الكامل , ٩/٤٦٦. ابوشامة الروضتين,٢/١٣٣. ابن واصل , ٢/١٢٤.

نووسی و لە نووکی نێزەی قایم کردن و بەرەو نێو شارەکەی فرێدان و ئامێدییەکانی هان دا هاوکاریی بکەن و وریای کردنەوە کە خۆیان لە ململانێ و بەربەرەکانیی دوور بگرن. لە لایەکی تریشەوە کۆمەڵێك خەریکی کون کردنی وارشی شار بوون و سەرەنجام کوڕی نیسان جیا لە خۆ بەدەستەوەدان چارە سەرێکی تری نەبوو و لە ساڵی ٥٧٩ ك دا سەلاحەددین رۆیشتە ناو شارەکەو تێکڕای دەسکەوت و غەنیمەتە سەرسوڕهێنەرەکان کەوتنە ژێر دەستی.[٣٨٣]

لە گرمەی ئەو هەڵلاوهەنگامەدا کەسەرکەوتنەکانی سەلاحەددین لە دەڤەری جەزیرەدا لە چلەپۆپە دابوون، عزالدین مەسعوود دەسەلاتداری موسڵ لە هەڵوێستێکی سەرسوڕهێنەرو چاوەڕوان نەکراودا بڕیاری گرتنی مجاهدالدین قایمازی دا کە پایەی پتەوی حکومەتەکەی بوو و هەولێرو شارەزوورو عەقری حومەیدییەو جەزیرەی ئیبنوعومەری لە بەردەست دابوو ونوێنەرەکانی فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانەیان دەکردو سەرەنجام بڕیارەکەی جێبەجێ کردو بەندی کرد. زینەددین یوسف فەرمانڕەوای هەولێرو سەنجەرشای فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبنوعومەر لە بەرامبەر ئەو رەفتارەی مەسعوود دا دژکردەوەیان نیشان داو وازیان لە گوێڕایەڵیی و پەیڕە ویی عزالدین هێناو لە جیاتی ئەوە چوونە ژێر فەرمانی سەلاحەددین و رایانگەیاند کە پەیڕەوی لەو دەکەن. ئەم قەیرانە پێگەی عزالدین ی لاواز کردو بە ناچاریی پەنای بردە بەروتو وێژ. بۆ ئەو مەبەستە قازیی محی الدین شارەزووریی هاوڕێ لەگەڵ نوێنەرانی خەلیفەدا بەرەو حەڵەب نارد بۆ لای سەلاحەددین. بەڵام وتووێژەکە نەگەیشتە ئاکام و شارەزووریی هەڕەشەی لە سەلاحەددین کرد ئەگەر چاوپۆشیی لە هەولێر

[383] ابن اثیر الکامل ٩/ ٤٧٠-٤٧١. ابن واصل , ٢/ ١٣٤-١٣٦. بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە دەسکەوتە سەرسوڕهینەرەکانی ئامێد بڕوانە:ابوشامة الروضتین , ٢/ ٣٩.

نەکاودەستی لێ بەرنەدا،ئەتابەگی موسڵ بە پاڵپشتیی و هاوکاریی پاشاکانی وڵاتی عەجەم دژی سەڵاحەددین شەڕ دەکا.[٣٨٤]

کاتێك قەیرانەکە قووڵتر بۆوە، عزالدین وازی لە خۆبەزلزانیی و لووت بەرزیی هێناو لە ساڵی ٥٨٠ ك دا، (قایمان)ی ئازاد کرد. قایماز دوای رزگاربوونی لە بەندیخانە بە پەلەو بێ دواکەوتن خۆی گەیاندە بارەگای"قزلئەرسەلان" فەرمانڕەوای ئازە ربایجان و بە پشتیوانیی و هاوشانیی ئەو، سوپای هێنایە هەولێر. سەربازەکانی قزل ئەرسەلان هەر بە نزیکبوونەوە یان لە هەولێر، دەستیان کرد بە کوشت و بڕی کوردەکان و بەزەبری زۆر ژنەکانیان بە دیل گرتن و قایمازیش نەیتوانی دەستیان وەبەربێنێ و رێگەیان لێبگرێ. لە گەرمەی ئەودەستدرێژیانەدا زین الدین یوسف فەرمانڕەوای هەولێر گەیشتە سەریان و تووشی شکستێکی دژواری کردن و کوردەکانی هەولێریش دەستیان بە سەر دارایی و چەك و تفاقەکەیان داگرت.[٣٨٥] زین الدین یوسف کە تازە بەڵگەی حوکمی فەرمانڕەوایی هەولێرو دەوروبەرەکەی لە سەڵاحەددین وەرگرتبوو، هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی پێڕاگەیاندو ئەویش بۆ جاری دووهەم خۆی ئامادەو تەیار کرد تا سەر لەنوێ گەمارۆی موسڵ بدا.[٣٨٦]

سەڵاحەددین لە سالی ٥٨١ ك دا هێرشی کردە سەر شاری موسڵ. کاتێك لەموسڵ نزیك بۆوە قازیی زیائەدین شارەزووریی رەوانەی دارالخلافە کرد بۆ ئەوەی هۆکارەکانی هێرشەکە بۆ خەلیفە باس بکا.[٣٨٧] عزالدین مسعود جارێکی

---

[384] ابن اثیر الكامل , ٩/٤٧٤-٤٧٦. ابن واصل,٢/١٥٥-١٥٦. محمد حسين , ٧٠-٧١.

[385] ابن اثیر الكامل ٩/ ٤٨٠

[386] ابن وصل , ٢/١٦٣-١٦٤. بهاءالدين ابن شداد, ٦٧-٦٨. هەروەها بڕوانە: (نك: Richards, "Salahaldin" EI2, V,VIII ,p,911)

[387] ابن واصل ,٢/١٦٦.

تریش هانای بردە بەر رێگەچارەی سیاسی و دایکی خۆی لەگەڵ کچەمامەکەی واتە کچی نوورەدین ناردن بۆ لای سەلاحەددین بەو مەبەستە کە لە بڕیاری هێرش پاشگەز بێتەوەو بە هۆی بەشداریی کچی نورەدین لە وتو وێژەکاندا، دڵی بە ئاکامی دانیشتنەکە خۆش بوو و هیوادار بوو ئاکامێکی باش دەستەبەر بکا. دیارە سەلاحەددین پێی خۆش بوو داواکارییەکان پەسند بکا، بەلام دوو شەڕوانە بە نێوبانگە هەکارییەکان فەقێ زیائەددین عیساو سیف الدین مەشتووب، بیرو ڕای سەلاحەددینیان گۆڕی و سوور بوون لە سەر درێژەدانی گەمارۆی موسڵ.[٣٨٨]

سەلاحەددین لە مەودای ئابڵووقەکەدا مەشتووبی نارد بۆ قەلای جودەیدە لە ناوچەی هەکاریی و هەر بە گەیشتنی مەشتووب بۆ ئەو شوێنە ژمارەیەکی زۆری کوردەکان لە دەورەی کۆبوونەوە. ناوبراو تا دواکاتی گەمارۆی موسڵ لەو ناوچە مایەوەو پاشان لەگەڵ سەلاحەددین رۆیشت بۆ خەلات.[٣٨٩]

سەرەنجام سەلاحەدین بە هۆی چەند هۆکارێك وەك گەرمای زۆری ناوچەکە، بەربەرەکانیی سەرسەختانەی خەڵك و قایمازو هەروەها لە هەموو ئەو پاساوانە گرینگتر کۆچی دوایی فەرمانڕەوایانی ئامێد و خەلات و دیاری نەکردنی کەسێك بۆ جینشینیی ئەوان، بەرەو خەلات رۆیشت. بەلام نەیتوانی بیگرێ وسەرکەوتوو نەبوو. هەربۆیە لەوێوە هێرشی کرد بۆ میافارۆقین و بە پیلانێکی سیاسی بە

---

[388] ابن اثير الكامل , ١٠م٥ -٦. قس: ابن واصل, ٢/ ١٧٠ -١٧١

[389] (مینۆرسکی لەم بارەوە بە هەڵەدا چووەو گوتویەتی: مەشتووب فەرمانی پێدرا تا جەزیرەی ئیبنوعومەر گەمارۆ بدات.) ((پژوهشهایی در تاریخ قفقاز / ١١٩))

سەریدا زاڵ بوو و خستیە ژێر دەسەلأتی خۆی.[٣٩٠] وێڕای ئەم سەرکەوتنە لقی ئەییوبییەکانی دیاربەکر هاتنە گۆڕەپانی مێژوو ونێوبانگیان دەنگی دایەوە.

گرتنی میافارقین هێزو دەسەلأتی سەلأحەددینی پتەوتر کرد. لە سایەی ئەو هێزو توانایەدا بۆ جاری سێهەم لەشکری هێنایەوە سەر موسڵ و بڕیاریدا بە دریژاییی وەرزی زستان درێژە بە گەمارۆی شارەکە بداو ئابلۆقەیان لە سەر توندتر بکاو دەرووی دەربازبوونیان لێ تەسکتر بکاتەوەو لەم رێگایەوە بە چۆکیان دابێنێ و ناچاریان بکا خۆیان بە دەستەوە بدەن. سەرەنجام لە رەمەزانی ٥٨١ ك دا عزالدین بۆ ئاشتیی پێبەمل بوو و لەوکاتە بەدواوە لە جیاتی تورکە سەلجووقییەکان، بە نێوی سەلأحەددین خوتبە خوێندرایەوە.[٣٩١]

## بەندی چوارەم : کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی ئەییوبییەکاندا (٥٨١– ٦١٤ ك)

### ١– ٤–١– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی صلاح الدین ئەییوبیی دا.

گرتنی موسڵ لە لایەکەوە زەبرێکی کاریگەری ئەوتۆی لە دەسەلأتی زەنگییەکان دا کە بەرەو نەمان سەرەنگرێ بوون و لە لایەکی ترەوە قەڵەمڕەوی دەسەلأتی صلاح الدین تەوای ناوچەکانی نێوان نیل و فوراتی گرتەوە، جیا لە چەند قەلأیەك کە لە ژێر دەسەلأتی زەنگییەکان دابوون و ئەوەش دەرفەتی بۆ صلاح الدین رەخساند تا بە خاترجەمیی دەست بکاتەوە بە شەڕی خاچهەڵگرەکان و بە کۆکردنەوەی هێز لەو ناوچانە، سوپاکەی بەهێزتر کرد. بەلأم سەرەڕای ئەو بارودۆخە هەموارو لەبارەش، خاڵێکی گرینگ

---

390 ابن اثير الكامل , ١٠/٨-٩. ابوشامة الروضتين , ٢/٦٣-٦٤. ابن واصل و٢/١٦٩-١٧٠. ميرخواند,٤/٥٩٨.

391 ابن اثير الكامل , ١٠/٩-١٠. ابنخلكان ,١٧٢/٧. ابن واصل ,١٧١/٢.

هەبوو کە پێویست بوو صلاح الدین لە بەرچاوی بگرێ و گرینگیی پێبدات. ئەویش ناکۆکیی و ناتەبایی نێوان کوردو تورکەکان بوو. ئەو تورکانەی کە ماوەی سەدەیەك بوو لە ناوچەکەدا نیشتەجێ ببوون و دوای پەرەسەندنی دەسەڵاتی سەلجووقییەکان هاتبوونە ناوچەکەو نێوە نێوە لە سەر رووداویك با بچووکیش با، تێکهەڵچوونی توندو خوێناوییان لەگەڵ کوردەکان دەبوو و وەك لە درێژەی توێژینەوەکەدا ئاماژەی بۆ دەکەین ئەو شەڕو تێکهەڵچوونانە تەشەنەی سەندو سوپای صلاح الدینیشی گرتەوە. لە ساڵی ٥٨١ ك دا کوردەکانی ناوچەی زۆزان رێگەیان لە کاروانی ئاهەنگێکی بووك گواستنەوەی تورکەکان گرت و دوای گەورەبوونەوەی ناکۆکیی و ئاژاوەکە، زاواکەیان کوشت. تورکەکانیش شمشێری تۆڵەیان لەکالان دەرێناو بە ملی ژمارەیەکی بەرچاوی کوردەکانیان دا هێناو کوشتارێکی زۆریان کرد. دژکردەوەی کوردەکان لە بەرامبەر ئەو کوشتارەدا پانتاییەکی فراوانی گرتەوەو گڕی بڵێسەی ئەو ئاژاوەو تێکهەڵچوونە خوێناوییە گەیشتە دیاربەکرو خەلات وموسڵ و شام و ئازەربایجان! کێشەو ململانێ و تێکهەڵچوونی نەتەوەیی سەرانسەری ناوچەی گرتەوەومەترسیی و نائارامیی، هەموو رێگاکانی هاتوچۆی گرتەوە. هەر چەندە لە سایەی هەوڵ وتێکۆشانی مجاهدالدین قایماز لە ساڵی ٥٨٢ ك دا ئاشیی لە نێوانیان دا جێگیر بووو رازی کردن کە پێکەوە شان بە شانییەکتر دژی مەسیحییەکانی ئەرمەنی و شام شەڕ بکەن، بەڵام کێشەیەکی ترلەنوسەیبین پشکۆی ئاوری ئاژاوەکەی گەشاندە وە و سەرلەنوێ شەڕ هەڵگیرسایەوەو لافاوی مەرگ هێرشی بۆ ناوچەکە هێنایەوە.[٣٩٢]

---

[392] ابن اثير الكامل , ١١/١٠. بهاء الدين ابن شداد, ٧١. ئەمین زەکی بەگ: خلاصة تاريخ الكرد.., ١٥٧. رشید یاسمی,١٩٣.

صلاح الدين كە دوای گرتنی موسڵ هاتبۆوە بۆ شام، درێژەی بە شەڕی دژی فەرەنگییەکان دا. لە ساڵی ٥٨٣ ك دا داوای هێزی پاڵپشتیی کرد لە هەولێرو ناوچەی جەزیرەو بە گەیشتنی ئەو هێزانە، درێژەی بە پێشڕەویی خۆی دا. هەر لەو ساڵەدا شاری عەککای گرت و خەڵکەکەی کردە سەرپشك لە مانەوە یان بەجێ هێشتنی شارداو بە مەبەستی ڕێگرتن لە تاڵان و بڕۆی شارەکەو پاراستنی سامانی خەڵك، چەند بنکەیەکی سەربازیی تێدا دروست کردو دارایی و زەوی و زاری کشتوکاڵیی شاسوارەکانی فیرقەی داویە[٣٩٣] ی سپاردە دە ستی فەقیێ زیائەددین عیسا هەکاریی.[٣٩٤]

دوای گرتنی عەککا صلاح الدين چەندین قەڵاو شارەکانی سەیدا، جوبەیل، بەیروت ی خستە بن دەستی خۆیەوە. پاشان بەرەو عەسقەلان ڕۆیشت و بە مەنجەنیقی ئاگرپژێن ئاوربارانی کردو دیوارەکانی ئەو شارەی خاپوور کرد. یەکێك لەو کوردە مێرخاس و بەنێوبانگانەی کە لەکاتی ئەو گەمارۆ دژوارەدا شەهید بوو، میر ئیبراهیم کوڕی حەسەنی میهرانی بوو. فەرماندەکانی شار سەرەنجام بەچۆك داهاتن و بە ناچاریی خۆیان بەدەستەوە داو بە مەرجی پاراستنی گیانیان لە مانگی جمادی الاخری ی ساڵی٥٨٣ ك دا شارەکەیان بە سەلاحەددین سپارد.[٣٩٥]

پاشان صلاح الدين سوپای هێنایە سەر بيت المقدس و لە کاتی پێشڕەوییان دا میر جمال الدين شەروین کوڕی حەسەن زەرزاریی شان بە شانی ژمارەیەکی

---

[393] "داوییە" و "ئیسبیتارییە" دوو گرووپی مەسیحیی بوون کە دەستیان لە خۆشگوزەرانی دونیا بەردابوو و خۆیان بۆ جیهاد دژی موسڵمانان تەرخان کردبوو. نك: اصفهاني, الفتح اقسّي..., ٧٦٢,ح ٦.

[394] اصفهاني الفح القسي,٩٠. ابن اثير الكامل , ٢٨/١٠. ابن واصل ,٢٠٢/٢. شاندور, ٢٣٩.

[395] اصفهاني الفتح القسي,.., ١١٣. هە روەها نك: ابن اثير الكامل , ٣٣/١٠

تر لە كوردە زەرزارییەكان، وەپێش سوپا كەوتنەوە بەڵام كەوتنە داوی لەناكاوی پاسەوانانی بەرەی پێشەوەی سوپای فەرەنگییەكان و هەموویان بە كۆمەڵ تێداچوون و لە تەمی خەمی نەمانیان دا سوپای موسڵمانانیان دڵ بەخەم كرد. [٣٩٦] لە مانگی رەجەب ی ساڵی ٥٨٣ ك دا ئاشتینامەیەكی گەڵاڵە كردو لە سەر بناغەی ئەو گەڵاڵە لە گەڵ فەرەنگییەكان پێكهات و رۆیشتنە ناو قودسەوەو بە پێچەوانەی هەڵوێستی خوێنرێژانەی خاچهەڵگرەكان لە ساڵی ٤٩٢ ك دا كە لافاوی خوێنیان لە لاشەی بە كۆمەڵ كوژراوی موسڵمانان وەرێخستبوو، لە خوێنی هەموویان خۆش بوو و پارێزگاریی لە گیانیان كردو بەم جۆرە چڵەپۆپەی مێرخاسیی و پیاوەتیی خۆی لە سەر رووپەڕی پەڕتووكی مێژوو تۆمار كردو بیرەوەرییەكی ئەوەندە خۆشی لە دەفتەری بیرەوەریی زەینی موسڵمانان دا بە جیّ هێشت كە ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمە ئێستاش ئۆقرەیی و سووكناییان پێدەبەخشیّ. صلاح الدین شارەكەی بە سەرداری نێوداری خۆی زیائەددین عیسا هەكاریی سپاردو ئەویش لە جیاتی خۆی زەهیروددین ی برای بە سەر شارەكەوە دانا. [٣٩٧]

دوای ئەو سەركەوتنە سەڵاحەددین قازیی زیائەددین ئەبولقاسمی شارەزووریی ناردە بەغدا بۆ لای خەلیفە بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو سەركەوتنە گرینگ و چارەنووسسازەی پیّ رابگەیەنیّ. [٣٩٨]

دوای ئازادكردنی قودس صلاح الدین لە ژێر كاریگەریی و هاندانی سیف الدین مەشتووب هەكاریی كە بە نوێنەرایەتیی ئەو شارەكانی سەیداو بەیرووت ی

---

396 ابن واصل , ٢١٢,١/٢.

397 اصفهانی , الفتح القسی..., ٥٧٩.

398 همو ١٤٧.

بەڕێوە دەبرد، شاری "صور"ی گەمارۆ دا[٣٩٩] و سەرەنجام لە بەر چەند هۆکارێك وازی لێ هێناو دەستی لێ بەردا.[٤٠٠]

سەرەڕای کەمتەرخەمیی مێژوونووسان لە مەڕ ئەو کوردانەی ژێردەست و بێ حکوومەت بوون،[٤٠١] ڕۆڵی بەرچاو و کاریگەریان لەو ساڵەدا، درزێکی بچووکی خستە دیواری ئەو کەمتەرخەمییەو وێڕای ئەوە کە ئەو کوردانە بەشداریی کارایان هەبووە لە سەر گۆڕەپانی مێژوو بە تایبەتی لە شەڕی خاچهەڵگرەکان دا شاسوارو سەرداری مەیدانەکە بوون، تەنیا لەو ساڵانەدا کە ئەو شەڕانە لە چڵەپۆپە دابوون، بە گرینگیی پێدانەوە باسی ڕۆڵی چالاکانەیان دەکەن. گومانی تێدا نییە ئەگەر مێژوونووسێك یان چەند کەسێك لەو مێژوونووسانە لە پێناوی کوردەکان پێنووسی لە سەر رووپەڕی پەڕتووکی مێژوو داناباو ئاوڕێکی لە مێژووی ئەوان دابایەوە، مێژووناس و شیتەڵکارانی ئێستا زانیاریی زۆرتریان سەبارەت بە رابردووی ئەو کوردانە دەبوو.

گرتنی بیت المقدس ڕادەی لێبڕاویی و بڕواپتەویی سەلاحەددین و سەربازەکانی زیاتر کردو ئەوان لەدرێژەی ئەو هێرش و سەرکەوتنە پەیتاپەیتایانەدا، بەتوندی

---

399 ابن واصل , ٢/٢٤٢-٢٤٣. بۆ زانینی درێژەی ئەم باسە بڕوانە (نك: طقوش, ١٥٩-١٦٠.

400 ابن واصل , ٢/٢٤٥-٢٤٦.

401 ( پێزیستە ئاماژە بەو خاڵە بکەین کە نووسەر کاتێك بە پێداگرییەوە باسی کەمتەرخەمیی و سستیی مێژوونووسان دەکات لە حاند کوردەکان, مەبەستی ئەوە نیە کە ئەوان نیازیان پاك نەبووە یان ویستوویانە زیان بە کوردەکان بگەیەنن! بەڵکو ئەوە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی مێژووی کۆنی ئێمەیە کە زۆرتر گرینگییان بە پاشاو زنجیرە حکومەتخوازەکان داوەو (( بە سیلەی چاویش)) ئاماژەیان بە مێژووی خەڵکی ئاسایی و دوور لە حکومەت نەکردووە —کە کوردەکانیش بەشێك لەو خەڵکانە بوون —و ئەم هەڵوێستەی مێژوونووسان لە مەڕ هەموو ئەو نەتەوەو چین و توێژانە کە بێدەسەڵات بوون و حکوومەتیان نەبووە, وەك یەکە. جا کورد بن یان بلوچ, یان تورك و.....)

تەنگیان بە هێرشبەرە خاچهەڵگرەکان هەڵچنی و بڕستیان لە بەر بڕین.سەلاحەددین لەساڵی ٥٨٥ ك دا قازیی زیائەددین ئەبولقاسم شارەزووریی وێڕای چەندین دیاریی و لەگەڵ دیلە فەڕەنگییەکان و لەهەموان گرینگتر خاچی پیرۆزی خاچهەڵگرەکان، ڕەوانەی دارالخلافەی بەغداکرد.[٤٠٢]

ڕزگاربونی بيت المقدس و تێکشکانی خاچهەڵگرەکان، بەتوندی ئوروپای داچڵەکاندو لافاوی لەشکرێکی گەورە وگرانی سەرلەنوێ بەرەو ڕۆژهەڵات بەڕێکرد. دووساڵ دواتر سوپای خاچهەڵگرەکان شاری عەکایان ئابلوقەداو شەڕێکی گرنگ و سەرسوڕهێنەر لەمێژووی جەنگی خاچهەڵگرەکان دا دەستی پێکرد. سەلاحەددین هەربەبیستنی هەواڵەکە وازی لەشەڕە پەڕش و بلاوەکان هێناو خۆی گەیاندە شارەکە. فەرەنگییەکان بە چەشنێك شارەکەیان گەمارۆ دابوو کە تەنیا لە دەریاوە ڕێی تێدەچوو و سوپای سەلاحەددینیش لە وشکانییەوە هێزو پشتیوانیی بۆ دەهات. ئەو گەمارۆیە بە جۆرێك بوو کە هێزی فەرەنگییەکان ببوونە لەمپەر لە نێوان موسڵمانانی ناو شارو سوپای سەلاحەددین داو ڕێگەیان لە بە یەکگەیشتنی خەڵك و سوپا گرتبوو. هەر لە سەرەتای شەڕو ململانێدا تقی الدين عمر برازای صلاح الدين ، توانی زەبرێکی بەژانی تۆقێنەر لە هێزی فەرەنگییەکان بدا. مامیشی کەڵکی لەو دەرفەتەە وەرگرت و هێزی پاڵپشتیی سەربازیی و چەك و تفاق و خۆراکی رەوانەی شارەکە کرد. پارێزگاریی کردن لە شار پێویستی بە شەڕوانێکی ئازاو نەبەزو زیت و زۆرزان بوو و صلاح الدين، شاسوارو شەڕوانی بە نێوبانگی کورد میر حسام الدين ابوالهيجاو السمين ی، بۆ راپەڕاندنی ئەو ئەرکە دیاری کردو بەرەو ئەوێ

402 اصفهانی, الفتح القسی..., ٢٨٠, ابن واصل , ٢٧٨/٢ -٢٧٩.

بەڕێی کرد.[٤٠٣] ئەو جەنگاوەرە بە باوەڕە چەندین جار لە گۆڕە پانی شەڕدا ئازایەتیی خۆی سەلماندبوو و ناو و دەنگی جەستەی نەیارانی دەخستە لەرزەو بێگومان بوونی لە شاردا ورەی گەمارۆدراوانی دووهێندە بەرز دەکردەوە.

لە مانگی شەعبانی ساڵی ٥٨٥ ك دا فەرەنگییەکان هێرشێکی بەرینیان دەست پێکرد. صلاح الدین لای چەپی سوپاکەی سپاردە دەستی میر سیف الدین کوڕی مەشتووب هەکاریی و میر موجەللی کوڕی مەڕوان هەکاریی و کوردە میهرانیی و هەکارییەکانی تر. فەقێ زیائەددین عیساش کە سیاسەتمەدارێکی کاراو پسپۆڕێکی بواری سەربازیی بوو، بۆ ناوەندی سوپا دیاری کرا.[٤٠٤] لە سەرە تای شەڕەکەدا بە هۆی ئازایەتیی و فیداکاریی میر سیف الدین ، فەرەنگییەکان نەیانتوانی زەفەر بەلای چەپی سوپا بەرن. بەڵام هەر بە تێکشکاندنی لای راستی سوپا بەرەو خێوەتی صلاح الدین لە ناوەندی سوپا کە کوردەکانیشی تێدابوون بە توندیی هێرشیان کردو لە خێوەتەکەش نزیك کەوتنەوە. بەڵام کوردەکان وەك بەربەستێکی قایم لە بەرامبەریان راوەستان و بەربینگیان پێگرتن و هەرچەندە هێرشی دوژمنیان تێکشکاندو پاشەکشەیان پێکردن، بەڵام ژمارەیەکی بەرچاویان لێ کوژران کە زۆربەیان کوردی هەکاریی بوون و میر موجەللی کوڕی مەڕوان هەکاریی و زەهیروددین هەکاریی والی بیت المقدس و برای فەقێ زیائەددین عیساو حاجب خەلیل هەکاریی کە قارەمانی سەر گۆڕەپانی جەنگ بوو، بە نێوبانگترین کوژراوەکانی ئەو شەڕە بوون.[٤٠٥]

---

[403] ابن اثیر الکامل, ١٠/٧١. ئەمین زەکی بەگ, تاریخ الدول..., ٢١٥.

[404] بەهائەددین ئیبنو شەدداد, ١١٠, بۆ زانیاریی سەبارەت بە چۆنییەتیی پێکهاتەی سوپاکە بڕوانە :(نك: مینورسکی,پژوهشهایی در **تاریخ قفقاز**,١٩٣-١٩٥

[405] ابن اثیر الکامل, ١٠/٧٣. ابن واصل, ٢/ ٢٦٩-٢٩٩.

بەهائەددین کوڕی شەدداد کە لە ٦٣٢ ك دا کۆچی دوایی کردووەو بۆخۆی بەشداریی لە شەڕەکەدا کردووە، لە باسی ئەو شەڕەدا دەڵێ لە خەمی کوژرانی میر زەهیروددین دا، سەربازەکان بە بێ ویستی خۆیان فرمێسکیان دەباراندو فەقێ عیسای برای، ئەوانی سەرکۆنە دەکردو دەیگوت ئەمڕۆ ڕۆژی خۆشییە نەك خەم و تازیە.[٤٠٦]

---

فەرەنگییەکانیش لەو شەڕەدا دەهەزار کەسیان لێ کوژراو بە جۆرێك ورەیان رووخابوو کە ئاوڕیان وەکوژراوەکانیان نەدەدایەوەو بۆگەن و پیسبوونی ژینگەی ناوچەکە بە هۆی لاشەی لەت وپەت کراوی سەر گۆڕەپانی شەڕەکە کەشی دەڤەرەکەی تێکدابوو و نەخۆشیی بە دواوە بوو و صلاح الدین نەخۆش کەوت و بە پێداگریی پزیشك و فەرماندە سەربازییەکان، ناچاربوو تا کاتی خاوێنبوونەوەی کەشی دەڤەرەکە، ناوچە بە جێ بێڵێ و بگەڕێنەوە بۆ دەڤەری "خەڕرووبە"کە چەند قۆناغێك لە عەکا دوور بوو. ڕووداوێك کە لە هەموو ناخۆشییەکان زیاتر سەلاحەددینی دڵگران و خەمبار کرد، کۆچی دوایی فەقێ زیائەددین عیسا هەکاریی بوو لە مانگی ذي القعدةی ساڵی ٥٨٥ ك دا. بەهائەددین کوڕی شەدداد کە لە کاتی سەرەمەرگ دا لە لای بوو، دەڵێ: ئازاری پشووسواریی تینی بۆ هێنابوو و نەخۆشی سکچوونیش هێزی لە بەر بڕیبوو و سەرەڕای ئەوەش تا دواهەناسەی ژیانی دەستی لە نوێژکردن هەڵنەگرت.[٤٠٧] ئەو یەکێك لە یاوەرە نزیکەکانی ئەسەدەدین شێرکۆ بوو و بە هاوڕێیەتی ئەو چوو بۆ میسرو بەردەوام هاوڕێی بوو. تێکڕای دیرۆکنووسان باسی دادپەرەریی، جوامێریی، ئازایەتیی و دڵاوایی و نان بدەیی ئەو مرۆڤە مەزنە دەکەن. دوای

---

[406] النوادرالسلطانية..., ١١٢.

[407] همان, ١١٦.

سپاردنی گیانی بە پەلە پەیکەری پیرۆزیان هێنایەوە بۆ قودس و لەوێ بەخاکیان سپارد.[٤٠٨]

دوای تێپەڕینی وەرزی زستان، صلاح الدین لە مانگی سەفەری ساڵی ٥٨٦ ك دا لە خەڕوویەوە گەڕایەوە بۆ عەکاو توانی کەشتییە فەرەنگییەکان بە توندیی تێك بشکێنێ. سوپای خاچهەڵگرەکان لەو ساڵەدا یارمەتیی و پاڵپشتیی بۆ هات و بەهێزتر کراو هێرشی کردە سەرصلاح الدین. ئەو جارەیان صلاح الدین نێوجەرگەی سوپای بە کوڕەکانی خۆی سپاردو سیف الدین مەشتووب هەکاریی و میرخوشتەرین هەکاریی و کوردە حومەیدیی و زەرزاریی و میهرانییەکانی لە ریزی لای چەپی سوپاکە دانا.[٤٠٩] ئەم جۆرە پێکهاتەیە توانی ئەمجاریش سوپای دوژمن تێك بشکێنێ.[٤١٠]

---

لە مانگی شەووالی ٥٨٦ ك دا صلاح الدین گرووپێکی سەربازیی ناردە سەر رێی فەرەنگییەکان و فەرمانی پێدان کەمین بۆ دوژمن دابنێن و ببنە بەربەست لە بەردەم پێشڤەچوونی هێزی فەرەنگییەکان و هەواڵی جموجۆڵەکانیشیان بۆ صلاح الدین بنێرن. ئەو عەرەبانەی بەشداریی ئەو پیلانە سەربازییە بوون ملیان بۆ رێنماییە پێویستەکانی ئەو پیلانە نەداو بە هۆی کەمتەرخەمیی و پێشیلکاریی ئەوان، فەرەنگییەکان بەو تەڵەیەیان زانی و بروسکەئاسا هێرشیان بۆ هێنان و ژمارەیەکی بەرچاویان لێ کوشتن و میر"ئایاز"ی میهرانی لە ریزی

---

[408] اصفهاني, الفتح القسی...,٣٥٥. ابن اثير الكامل, ١٠/٧٧. هه روه ها نك: (ابن واصل, ٢/٣٠٩).

[409] بۆ شارەزایی زیاتر سەبارەت بە رێکخستنی سوپاکە بڕوانە(نك: مینۆرسکی,**پژوهشهایی در تاریخ قفقاز**, ١٩٥-١٩٧)

[410] اصفهانی, الفتح القسی..., ٤٤١-٤٤٣. ابن واصل, ٢/٣٤٣-٣٤٤.

کوژراوەکان دابوو کە یەکێك لە سەردارە ئازاو چاونەترسەکانی سوپای صلاح الدین بوو.[٤١١]

سەرەڕای تێکڕای ڕووداوە خوێناوییەکانی شەڕی عەکا، ئەو شەڕە مرۆڤدۆستیی و پیاوەتیی و جوامێریی بە دواوە بوو و ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرەی سەلماند کە گەوهەری مرۆڤایەتیی گەورەترە لەوە کە ناتەبایی نێوان ڕەگەوزو گرووپەکان و .... بتوانێ لە ناوی بەرێ و تەنانەت لە چڵەپۆپەی خرۆشانی شەپۆلی لافاوی خوێناویی لەو چەشنەش دا، دەتوانێ بەر بە لێشاوی شەڕو خوێنڕشتن بگرێ و کۆتایی بە پێکدادان بێنێ و بزەی شیرین بخاتەوە سەر لێوی جوانیی و مرۆڤدۆستیی.[٤١٢] هێرشی گەورەی موسڵمانەکان بۆ سەر فەرەنگییەکان لەو ساڵەدا ژمارەیەکی زۆری خاچهەڵگرەکانی تێدا کوژراو ناچاری کردن بەرەو عەکا پاشەکشە بکەن. سوپای تێکشکاوی فەرەنگیی تووشی قاتی و نەبوونییەکی دژوار بوو و برسییەتیی و تینوێتیی بڕستی لێ بڕین. هەر لەگەڵ گرفت و تەنگژەو شڵەژانی بارودۆخ و سەرهەڵدانی مەترسیی لە ناوچوونیان بەکۆمەڵ، میر سیف الدین مەشتووب هەکاریی کە وەك فەرماندەو سەروەرەکەی خۆی (صلاح الدین) شەڕکردن لە گەڵ دوژمنی لاواز لە هەل و مەرجی دژوارو تەنگەتاویی دا بە کارێکی ناجوامێرانەو دوور لە ڕەفتاری مێرخاسانەی خۆی دەزانی، لە سەیداو بەیرووتەوە بە هاوکاریی میرئوسامەی پارێزگاری بەیرووت، خێرا یارمەتیی سوپای فەرەنگیان کردو خۆراك و

411 اصفهانی , الفتح القسی..., ٥٥٩. بەهائەددین ئیبنوشەدداد, ٢٠٠. سلیمان, ٢٨٠ .

412 بۆ وەدەستهێنانی زانیاریی لە مەڕ کردەوەو هەڵوێستە جوامێرانەکانی سەلاحەددین لەو شەڕەدا, بڕوانە: (نك: بەهائەددین ئیبنو شەدداد, ١٦٩. ابن کثیر, ١٢/ ٣٦٤-٣٦٥ .

پێداویستی یان بۆ ناردن.[٤١٣] ئەگەر ئەو یارمەتییانە نەبان، بە هۆی هاتنی وەرزی زستان و زیادبوونی رێژەی ئاوی دەریا، بێگومان زۆربەی هەرەزۆریان لە برسان دەمردن.[٤١٤]

هەر لە رەمەزانی ئەو ساڵەدابوو زین الدین یوسف فەرمانڕەوای هەولێر کە هاوکاروانی صلاح الدین بوو، کۆچی دوایی کردو تەمی خەمی خستە سەر رووخساری سوپای موسڵمانان و موزەففەرەددین کۆکبری کە برای زین الدین بوو، داوای لە سەلاحەددین کرد لە جیاتی حەڕڕان و روها کە لە بەردەستی دابوون، هەولێر بداتە دەستی و بیکاتە فەرمانڕەوای شارەکە. ئەویش رازی بوو و وێڕای هەولێر، شارەزوور و دەوربەرەکەشی پێ سپارد. لە لایەکی تریشەوە خەڵکی هەولێر بە بیستنی هەواڵی مەرگی زین الدین داوایان لە مجاهدالدین قایماز کرد کە لە موسڵ بوو، بێتە هەولێر. بەڵام نە قایمازو نە عزالدین مسعود لە ترسی صلاح الدین نەیانوێرا وەڵامی داواکەیان بدەنەوە. بە جێگیربوونی کۆکبریی لە سەر کورسی دەسەڵاتی هەولێر، خەمێکی گەورە وەك دڕك قورگی ئەتابەکانی زەنگی گرت.[٤١٥]

---

[413] ابن اثیر ,الکامل, ٨٦/١٠.

[414] ( شاعیری نێوداری کورد عبدالله پەشێو کە بۆ دەربڕینی هاودەردیی لەگەڵ فەلەستینییەکان و چەوساوانی تری ئەم رۆژگارە خۆزگە دەخوازێ وەك رابردوو و وەك کوردێك لە گۆڕەپانی شەڕدابێ و تەنگ بە خاچهەڵگرەکان هەڵچنێ, ئەگەر ئاگای لە رەفتاری جوامێرانەی ئەو شەڕوانە کوردە بایە, کە لە چلەپۆپەی شەڕی خاچهەڵگرەکان دا چ هەڵوێستێکی هەبووە, دەیکردە سەردێری هەڵبەستە بە سۆزەکەی.) (( دیوانی عبدالله پەشێو, ١٠٩))

[415] ابن اثیر الکامل, ٨٧/١٠. بهاءالدین ابن شداد, ١٤٤-١٤٥. ابن خلکان, ١١٤/٤-١١٥. ابن واصل , ٣٣٩/٢. محمد حسین, ٩٧.

بە هۆی رووخانی بەشێکی زۆری شوورەی شاری عەکا بەسەر سوپای ناوشارەکەدا، هەلێکی لەبار بۆفەرەنگییەکان هەڵکەوت و ژمارەیەکیان کەڵکیان لەو دەرفەتە وەرگرت و هێرشیان کردە سەر شار. لە ژێر سایەی رێنمایی و پلانی سەربازیی **ابوالهیجاء السمین و بهاءالدین قەراقوش**، کە فەرماندەو سەرداری شاربوون، خەڵك و خەباتگێڕانی موسڵمان بەربەستێکی گەورەی ئینسانی یان لە خۆیان پێکهێناو سەرەنجام بە قوربانییدان و لە دەستدانی ژمارەیەکی زۆری پێکهاتەی ئەو بەربەستە مرۆڤییە لە بەرامبەر هێرشی گەورەو گرانی نەیاران دا، کە میر نەسر حومەیدیی فەرماندەیەکی کوردە حومەیدیەکانیش لە نێویان دابوو، توانی بە سەر دوژمندا زاڵ بن و هێرشەکە تێك بشکێنن.[٤١٦]

لەگەڵ هاتنی وەرزی زستان، دەریا بوو بە تۆفان و کرێوەو فەرەنگیی لە ترسی رۆچوون و ونبوونی کەشتیەکانیان لە نێو دەریادا، گواستیاننەوە بۆ صور. عیماد کاتب ئیسفەهانی کە لەو کاتەدا لە ریزی سوپا دابوو، دەڵێ: "دوای ئەو ئاڵ وگۆڕو جێگۆڕکە رێگایەك کرایەوەو دوای ماوەیەکی دوورودرێژ سوپای موسڵمانان توانی رووخی دەریا ببینێ. صلاح الدین کەڵکی لەو دەرفەتەوەرگرت و ئەبولهەیجاو و فەرماندەکانی تری شارەکەی کە لە ماوەی ئەو دووساڵەدا بە توندیی پارێزگارییان لە عەکا کردبوو، ناردنە دەرەوەی شارو چەند فەرماندەیەکی تازەی تری رەوانەی شار کرد کە میر سیف الدین مەشتووب هەکارییەکێك لەوفەرماندانە بوون".[٤١٧]

---

[416] اصفهانی, الفتح القسی..., ٤٦٤.

[417] الفتح القسی..., ٤٥٦–٤٥٧. ابن اثیر الکامل, ١٠/٨٧. بهاءالدین ابن شداد, ١٥٢–١٥٣. زەکی بەگ, تاریخ الدول..., ٢١٩.

لە سەرەتاکانی ساڵی ٥٨٧ ك دا مەشتووب و هێزە پشتیوانەکانی تر چوونە ناو شار. بەڵام بارودۆخی شار بە تەواویی شێوابوو و کەمیی پێداویستیەکانی ژیان و بێخەویی، کاری گران و بەرگریی بەردەوام بە قیمەتی گیان، توانای جەماوەری شارەکەیان بە تەواویی لاواز کردبوو. هەر لەو کات و بارودۆخەدا فیلیپ ئاگۆست ئیمپراتۆری فەرانسە و ریچارد شێردڵ پاشای ئینگلستان، گەیشتنە جێ و لەگەڵ هێزی گەمارۆدەر یەکیان گرتەوەو بە هاتنی ئەوان ورەی سوپای فەرەنگییەکان دووهێندە زیادی کرد. بە مەنجەنیقی ئاگرپژێن شارەکەیان ئاگرباران کردو تێکیان داو بەشێك لە وارشی شاریان خاپوور کرد. خاچهەڵگرەکان ئاویان لە سەر شارەکە بڕی و گەرمای لەرادەبەدەرو تینوێتیش بوونە سەربازی گرفتەکان. سیف الدین مەشتووب لەو فەرماندە زیت و زیرەکانە بوو کە پێی وابوو سەرکەوتن تەنیا تایبەت نییە بە گۆڕپانی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن لە کاتی نەبوونی هاوسەنگیی لە نێوان توانای هێزەکان داو لە هەل و مەرجی نایەکسان دا کارێکی دوورە لە ژیریی و باوەڕی وابوو کە وتو وێژی سیاسی جۆرێکە لە شەڕو کەڵك وەرگرتن لەو تاکتیکە لە کاتی پێویست دا، نیشانەی لێهاتوویی و پێگەیشتوویی ئەو فەرماندەیە کە تاکتیکەکە بەکار دێنێ و پاراستنی گیانی جەماوەرو سەربازەکان بە لایەوە لە هەمو بابەتێکی تر گرینگتر بوو و هەروەها بە هۆی ئەوە کە لە ساڵی پێشووتر لە کاتی فریاکەوتنی هێزی پەککەوتەی خاچهەڵگرەکاندائەو جوامێریی و تایبەتمەندییە بەرزانەی خۆی سەلماندبوو، بە هیوای ئەوە بوو کە ئەو چەشنە ئاکارجوانییە لە ئیمپراتۆری فەرانسەش دا هەبێ و هەر لەگەڵ دژواریی بارودۆخ و سەرهەڵدانی قەیرانە قووڵەکان دا شمشێری شەڕی خستە ناو کالانی بیرکردنەوەو چارەدۆزیی و بڕیاری دا بە وتووێژی سەربەرزانە، ڕێگە بگرێ لە

رووداني كارەساتی مەرگی بە هەرەوەزیی و شاری بە فەرماندەکانی تر سپاردو چەند وەرگێڕێکی زمانزانی لەگەڵ خۆی برد بۆ خێوەتی فیلیپ ئاگۆست و بە پشت بەستن بەو بەڵگەیە کە موسڵمانەکان لەکاتی گەمارۆی هەر شارێك داوەلامی بانگەوازی ئاشتیی، پارێزەرانی شارەکەیان دەدایەوەو نەك هەر دەستدرێژییان نەدەکردە سەر خەڵکی ئاسایی، بەڵکو رێنوێنیی و هاوکاریی ئەو کەسانەشیان دەکرد کە شارەکەیان بەجێ دەهێشت و تا گەیشتن بە شوێنی مەبەست بەرێزەوە لەگەڵیان دەچوون، داوای بەستنی پەیمانی ئاشتیی و پاراستنی گیان و هێمنایەتیی موسڵمانانی شارەکەی لە ئاگۆست کردو کاتێك گوێبیستی وەلامی بێ شەرمانەو دوور لە رێ وشوێن و داب ونەریتی مرۆڤانەی ئاگۆست بوو، داچڵەکاو هەڕەشەی لێکردو پێی گوت من و سەربازەکانم شانازیی شەهیدبوونمان بە لاوە سەربەرزانەترە لە سەرشۆڕیی و شوورەیی و سوێندی خوارد کە هەر یەکێك لە ئێمە تا پەنجا فەرەنگیی نەکوژین مل بۆ مەرگ نادەین و بە تووڕەیی گەڕایەوە بۆ عەکا! [٤١٨]

بە گەڕانەوەی مەشتووب شەپۆلی ترس شاری داگرت و خەڵك بە تەواویی ورەیان بەردابوو. لە لایەکی ترەوە وتووێژی صلاح الدینیش بە هۆی زۆرخوازیی و بڕوبیانووی لە رادەبەدەری فەرەنگییەکان، بێ ئاکام بوو. وەك ئاخرین رێگاچارە داوای لە جەماوەرو سوپای گەمارۆدراویی عەکا کرد کە لە شەوێکی دیاریکراودا دارایی و کەل وپەلیان لە ناو شاردا بەجێ بێڵن. وێکڕاو لە ریزێکییەکگرتوودا بەرەو دوژمن وەڕێ کەون و بۆخۆشی لە لای خۆیەوە هێرش بکات و لە دووو لاوە شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەن و بەم جۆرە رێگای دەربازبوون

---

[418] اصفهانی، الفتح القسی...، ٥٠٥. ئیبنوئەسیر، الکامل، ٩٥/١٠. بەهائەددین ئیبنوشەدداد، ١٦٨. شاندور، ٣٧٢-٣٧٣. سلیمان، ٢٩٦-٢٩٧.

بۆخۆخۆیان بکەنەوە. بەڵام بە پێچەوانەی پلانەکە موسڵمانانی شارەکە بە درێژایی شەو خەریکی کۆکردنەوەی سامان و دارایی و کەل و پەلەکانیان بوون! پێشقەرەوڵەکانی سوپای فەرەنگیی لە ماوەی ئەو بێنەو بەرەدا بەشێکی خەندەکی چواردەوری شاریان پڕ کردەوەو لە نیوەشەوی ئەو شەوەدا لە خەندەك پەڕینەوەو لەگەڵ گزینگی بەرەبەیاندا دەستیان بە سەر بەشێکی وارشی شاردا گرت. سیف الدین مەشتووب و حسام الدین حسین بن باریك میهرانیی کە دوو سەرداری کورد بوون، کاتێك تێگەیشتن سەلاحەددینیش هیچی بۆ ناکرێت، جارێکی تر چوونەوە لای فەرەنگییەکان و پەیمانێکی ئاشتی یان لەگەڵ گرێدان لە سەر بنەمای بەخشینی دووسەد هەزار دینارو ئازادکردنی دووسەدوپەنجا دیلی کارامەی فەرەنگیی و گێڕانەوەی خاچی پیرۆزو دانی بڕە پارەیەك بە فەرمانڕەوای شاری صورو بڕیار درا لە بەرامبەر ئەو ئیمتیازانەدا گیان و ماڵی موسڵمانانی شار پارێزراو بێ و دوای دوو مانگی دیکە دیل و دراوەکە بدرێتە دەستی فەرەنگییەکان.[٤١٩]

بەم جۆرە لە مانگی جمادی الاخرەی ساڵی ٥٨٧ ك دا دوا تێپەڕینی سی وحەوت مانگ بە سەر ئابلۆقەدا، شاری عەکا کەوتە بن دەستی فەرەنگییەکان و هەرچەندە خاچهەڵگرەکان گرەوی گۆڕەپانی شەڕیان بردەوەو سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، خوێنێك کە لە پێناوی ئەو شارەدا رژا، بۆ ماوەی چەندین ساڵ توانای ئوروپای لاواز کرد. سەردارو فەرماندە نێودارەکانی سوپای صلاح الدینیش تا توانیان لەو شەڕە مێژووییەدا شەڕو بەربەرەکانیان کردو زۆربەشیان لەوپێناوەدا گیانی خۆیان کردە قوربانیی. سیف الدین مەشتووب رۆڵی سەرەکیی هەبوو لە وتووێژی ئیمپراتۆری فەرانسەداو عیماد کاتب کە بۆخۆی

[419] اصفهانی, الفتح القسی..., ٥١٣-٥١٤. ابن اثیر الکامل, ١٠/٩٦-٩٧. سلیمان, ٢٩٧.

لەگەڵ ئەو سەرکردەدا لە بەرەکانی شەڕ بەشداریی کردووە سەبارەت بەو دەڵێ: (ئامادەبوونی لە گۆڕەپانی شەڕو پێکدادان دا ورەی موسڵمانانی دووهێندە بەرز دەکردەوەو خەمێکی قووڵ وترسێکی توندی تووشی دوژمن دەکردو بە بیستنی ناوی ، دڵیان دەکەوتە لەرزە".[٤٢٠] فەرەنگییەکان هەر کە زاڵ بوون بە سەر شارەکەدا، پەیمانیان پێشێل کردو تەواوی موسڵمانەکانیان لە بەندیخانەدا بەند کردو بیانوویان گرت و گوتیان تا کاتی جێبەجێکردنی بەندەکانی رێکەوتننامەی ئاشتیی، ئەو موسڵمانانە بە بارمتە لای ئێمە دەبن. صلاح الدین سەرەڕای ئەوە کە بەدەستی خۆی ئەو رێکەوتننامەی واژوو نەکردبوو، بەڵام بە مەبەستی رێزگرتنی پلەو پایەی فەرماندەکانی لە عەکا-کە لەبەر ناچاریی ملیان بۆ مەرجەکان دابوو- و هەروەها لە پێناوی پاراستنی گیانی موسڵمانە بەندکراوەکان، پێشەکیی پێویستی ئامادە کردو رێی بۆ رەخساندنی کارەکە خۆش کرد، بۆ ئەوەی لەکاتی دیاریکراو دا سییەکی ئەو دیل و دراوانە بدرێ و دوای ئازادکردنی بەشێکی دیلە موسڵمانەکان، لە لایەن فەرەنگییەکانەوە لە بەرامبەر پیادەکردنی سییەکی رێکەوتننامەکەدا، خاچی پیرۆزیش کە موسڵمانەکان لە بەغداوە هێنابوویانەوە، بداتەوە بە خاچهەڵگرەکان.

لەو رۆژەدا ریچارد شێردڵ دوو سەرداری خۆی هاوڕێ لەگەڵ حیسامەددین بن باریك میهرانیی کە سەردارێکی کوردی بەبارمتەگیراو بوو، ناردن بۆ کۆمەڵگای سەڵاحەددین بە مەبەستیی دڵنیابوون لە بوون و سەلامەتیی خاچی پیرۆزو ئەوانیش بەبینینی خاچەکە خاترجەم بوون و گەڕانەوە بۆ عەکا.[٤٢١]

---

420 الفتح القسي..., ٤٤١-٤٤٢.

421 بهاءالدين ابن شداد, ١٧٣.

سەرەڕای ئەوە کە سەلاحەددین بەشییەکەمی پەیماننامەکەی جێبەجێ کرد، فەرەنگییەکان لەو بەشەدا کە پێوەندیی بەوانەوە هەبوو، بڕوبیانویان گرت و کاتێك سەلاحەددین هەستی بەوەکرد کە بە نیازن فێڵی لێبکەن، دیل و دراوەکەی تری نەدایەوە بە خاچهەڵگرەکان. ریچاردیش لە هەلوێستێکی پەست و ناجوامێرانەدا، خۆڵی کردە ناو چاوی مرۆڤدۆستیی و مرۆویستیی و سێهەزار کەسی موسڵمانی لە پێش چاوی خەڵك رووت کردنەوەو هەر بەوشێوەیەش سەری پەل دان. فرمێسك لە چاوەکانی سەلاحەددین دا قەتیس ماو سەرەڕای پێداگریی و هاندانی زۆربەی ئەو سەردارو فەرماندانەی کە گڕی رق و قینیان لە بەرامبەر کردەوەی دزێو و ناجوامێرانەی ریچارد دا بڵێسەدارتر ببوو، رێگەی تۆڵەسەندنەوەی پێنەدان و خاچی پیرۆزو دیلەکانی شەڕی گێڕانەوە بۆ دیمەشق!![٤٢٢]

دۆڕاندن و گیرانی عەکاو کۆمەڵکوژیی سێهەزار دیلی موسڵمان بە دەستی ریچارد ئەویش بەو شێوە دزێوە، ورەی سوپای صلاح الدین ی زۆر لاواز کرد. دوای ئەو رووداوانە تەنیا خەریکی پارێزگاریی و بەربەرکانی بوو و بە مەبەستی رێگرتن لە پێشڤەچوونی ریچارد چەند قەلایەکی وێران کردو لەو بارودۆخەش دا وتووێژ لە نێوان هەردوو لادا بەردەوام بوو. هەرلەو کاتەدا میر شێرکۆی کوڕی باخل زەرزاریی و حوسێنی کوڕی باریك میهرانیی دوو سەرداری کورد کە لەعەکا بە دیل گیرابوون، پیلانێکیان داناو بڕیاریان دا رابکەن و بەو پەتەی کە لە دەرفەتێکی رەخساودا لە پشت خۆیان حەشاریان دابوو، لە نیوەشەوی ئەنگوستەچاودا لەو بەشەی وارشی شار کە زۆر لەبەرچاو دیار نەبوو، هاتنە

[422] ابن اثیر, الکامل, ١٠/٩٨. بۆ زانینی درێژەی باسی گیرانی شاری عەکاو رووداوەکانی دوای ئەو بڕوانە: ( شاندور, ٣٧٤-٣٨٠. طقوش, ١٦٦-١٧٤. رانسیسمان, ٣/٢٦-٦٨.

خوارەوە.پەتی حوسێن کوڕی باریك لە نیوەڕێ دا پچڕاو شێرکۆ هەرچەند هەوڵی دا نەیتوانی لەگەڵ خۆی بیباو لە ترسی دەستگیر کردن و هەڵوەشانەوەی پیلانەکە، بە تەنیایی رایکردو لە چیاکانی دەوروبەر خۆی حەشار داو بەندی دەست و پێی خۆی پساندو بە کوێرەوەریی و چەرمەسەریی خۆی گەیاندە سەربازگەیەکی موسڵمانەکان.[٤٢٣]

صلاح الدین دوای ئەوە کە لە رێگای وتووێژەوە نەگەیشتە هیچ ئاکامێك و بە نزیکبونەوەی وەرزی سەرماو بە هۆی ئاگاداربوونەوەی لە پیلانی فەرەنگییەکان بۆ سەرلەنوێ داگیر کردنەوەی قودس، گەڕایەوە ئەو شارەو دەستی کرد بە نۆژەنکردنەوەی قولەو وارشی شارەکە. لە کاتی کەمیی کەرەسەی بیناسازیی لە بەردەستی وەستاکارو بیناسازان دا وەك سەربازێکی ئاسایی لە دوورەوە بە درۆشکەکەی بەردی دێنا. لەو ماوەیەشدا پێشقەرەوڵانی سوپای موسڵمانان بەرگرییان لە دەوروبەری شار دەکردو بە خێرایی هەواڵەکانی سوپای دوژمنیان دەگەیاندە صلاح الدین.

لە کۆتایی ساڵی ٥٨٧ ك دا میر ئەبولهەیجائوسسەمین کە دوای بەجێ هێشتنی عەکا رۆیشتبوو بۆ میسر، بە سوپایەکی گەورەو گرانەوە هاتە ناو قودس و هەواڵی گەیشتنی ئەو سەردارە لە کاتی چڵەپۆپەی ئەو برگە هەستیارەدا، شەپۆلی شادی بە نێو موسڵمانان دا بڵاو کردەوەو وورەیان دووهێندە بەرز بۆوە و ترس و نیگەرانیی قووڵی خستە دڵی فەرەنگییەکانەوە.[٤٢٤]

لە مانگی جمادی الاخرەی ساڵی ٥٨٨ ك دا لەو رۆژەدا کە صلاح الدین لە خێوەتەکەی خۆی دا لە گەرمەی وتووێژ دابوو لەگەڵ مەلیك عادلی برای، میر

---

423 بهاءالدین ابن شدد, ١٩٤-١٩٥. هه روه ها (نك: ابن واصل, ٣٧٣/٢).

424 اصفهانی,الفتح القسی...,٥٦٢. ابن اثیر, الکامل, ١٠٢/١٠. ابن واصل , ٢/ ٣٧٥.

سیف الدین مەشتووب هەکاریی — خوای شمشێر لە گۆڕەپانی شەڕ،و راوێژو تەکبیر لە کاتی گەڕان بۆ چارەسەر— کە بە پێدانی بەشێك لە فیدیەی خۆی و دانانی گەرەنتیی و بەڵگەنامە بۆ باقی فیدیەکە لە زیندانی عەکا ئازاد کرابوو، کت وپڕ هاتە ژوورەوەو فرمێسکی شادیی بە بێ ویستی سەلاحەددین لە چاوەکانی دابارین و بە گەرمیی باوەشی بە میر سیف الدین داکرد. مۆڵەتی دا بە میوانەکانی بڕۆن و ماوەی چەند سەعاتێك پێکەوە دانیشتن وقسەی لەگەڵ کردو بە ووردی هەواڵی موسڵمانە بەندکراوەکانی تری بەندیخانەی عەکای لێ دەپرسی. پاشان نابلۆس و دەوروبەرکەی دا بە میر سیف الدین.[٤٢٥] گەڕانەوە و گەیشتنەجێی سەردارێکی ئازاو بە زراوی وەك مەشتووب لەو بڕگە ناسك و هەستیارەدا کە شار لە بەردەم هێرشی فەرەنگییەکان دابوو، بێگومان کاریگەریی باش و ئەرێنیی لە سەر وورەی موسڵمانان هەبوو و ترس و سامی خستە دڵی نەیارانی هێرشبەر. بە تایبەت کە ئەبولهەیجاو سەردارێکی تری بە نێوبانگی کورد تازە خۆی گەیاندبۆ قودس و بوونی ئەو دوو فەرماندە جەربەزەیە کە چەندین جار زەبری بە ژانیان لە خاچهەڵگرەکان دابوو و لە فەرماندەو سەرداره ناسراوەکانی شەڕی سێ ساڵەی عەکا بوون، رۆلێکی بەرچاو و حاشاهەڵنەگری لە خێرا پەسند کردنی ئاشتیی لە لایەن خاچهەڵگرەکانەوە هەبوو.

عیماد کاتب ئیسفەهانی کە بۆخۆی لە کاتی گەیشتنە جێی مەشتووب بۆ قودس لەوێ بوو، دەڵێ: (هەر بە گەیشتنەوەی بۆ شار عیمادەددینی کوڕی بە پەلە بەرەو پێشوازیی رۆیشت و لەو کاتەدا مووی سەری خۆی لە

---

[425] اصفهانی, الفتح القسی..., ٥٨٨. بهاءالدین ابن شداد, ٢٠٧. ابن خلكان, ١٨٢/١ -١٨٣. ابن واصل, ٣٨١٢.

پشتەسەرییەوە بە شێوەی تورکەکان هۆنیبۆوە، مەشتووب گرژو تووڕە بوو و کوڕەکەی خۆی سەرکۆنە کردو پێی گوت: بۆچی بە **پێچەوانەی داب ونەریتی کوردەکان** هەڵس و کەوتت کردووەو کارێکت کردووە کە لەنێوکورد دا باوی نییە؟"[٤٢٦] لەم باسەدا خاڵێك سەرنجمان رادەکێشێ و واتایەکمان بۆ روون دەبێتەوە. ئەویش ئەوەیە کە کوردەکان لەو سەردەمەدا بە گوێرەی داب و نەریتی نەتەوەیی تایبەتی خۆیان لە نێو ئاپۆرەی خەڵك دا دیار بوون و ئەگەر دیرۆکنووسان و شارەزایانی مێژوو لە جیاتی گرینگی پێدانی زیاتر بە لایەنی سیاسیی، ئەویش هەواڵ و سەربردەی پاشاکان، گرینگی یان بە لایەنی فەرهەنگیی دابا، باری کۆمەڵایەتیی و پێکهاتەی فەرهەنگی کوردەکانی ئەو سەردەمە، بۆ توێژەری ئەمڕۆ زیاتر روون دەبۆوە.

بە گەیشتنی هێزی پاڵپشتیی بۆ هێزی فەرەنگییەکان، سەلاحەددینیش خۆی بۆ بەرگریی تەیار کردو مەنجەنیقی لە سەر وارشی شار دابەست و ئەبولهیجا و مەشتووب و فەرماندە سەربازییەکانی دیکەی کۆ کردەوەو راوێژی پێکردن. بەهائەددین کوڕی شەدداد دەڵێ: (سەلاحەددین داوای لە من کرد لەوتارێك دا باسی بڕگەی هەستیارو هەل و مەرجی ناسکی شارو جەنگ و جیهاد بکەم بۆ ئامادەبوان و پاشان بۆخۆشی لەم بوارەدا کۆمەڵە وتەیەکی ورووژێنەری ئاراستەی ئامادەبووان کرد. مەشتووب هەکاریی لە نێو ئامادەبووان دا هەستایە سەر پێ و بە سەلاحەدینی گوت ئێمە رێزو گەورە یی خۆمان لە سایەی تۆدا دەبینین و تا گیان لە لەشمان دابێ لە پەنای ئاوزەنگی تۆوە شمشێر دەوەشێنین. ئیبنو شەدداد لە درێژەی قسەکانی دا دەڵێ: بەو هەڵوێستەی

---

[426] الفتح القسی...، ٥٨٨.

مەشتووب گوڵی روخساری سەڵاحەددین گەشایەوەو هەموویان بە گیانێکییەکگرتووانە گەڕانەوە سەنگەرەکانی خۆیان.[٤٢٧]

خۆشحاڵیی سەڵاحەددین زۆری نەخایاند. چونکە دوای ماوەیەك نامەیەکی ئەبولهەیجائوسسەمین ی بە دەست گەیشت کە تێیدا نووسیبوو کۆمەڵێك لە میرو فەرماندەکان لە ترسی تووشبوونی چارەنووسی عەکا، داوایان کردووە لە شار بڕۆنە دەرەوەو لە دەرەوەی شار رووبە ڕووی دوژمن ببنەوەو لە لایەکی تریشەوە ناتەبایی و گرفتی نێوان تورك و کوردەکانی سوپا تەشەنەی کردووەو پێویستە سەلاحەدین بۆخۆی یان کەسێك لە بنەماڵەکەی بە مەبەستی نەهێشتنی ئەو گرفتەو چارەسەری ئەو قەیرانە، بۆ ئەو شوێنە رەوانەبکات. سەلاحەدینیش بۆ داکوژاندنی گڕی ناکۆکییەکان، مەلیك ئەمجەدی ئەییوبیی فەرمانڕەوای بەعلەبەك ی نارده ئەو شوێنەو ئەو شەوە تا بەیانی نەخەوت و لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر، پێشقەرەوڵانی سوپای موسڵمانان هەواڵیان هێنا کە بە هۆی ناکۆکیی و دووبەرەکیی، سوپای فەرەنگییەکان لە بەریەك هەڵوەشاوە.[٤٢٨]

بازنەی ناتەبایی نێوان کوردو تورکەکان لە دەڤەری جەزیرەدا کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی بۆ کرا،[٤٢٩] فراوان بوو و سوپای سەڵاحەددینیشی گرتەوەو دەشێ بگوترێ راگرتنی هاوسەنگیی نێوان ئەودوو نەتەوە تا ئەو کاتە نیشانەیەکی دیارو روونی زیرەکیی و لێهاتوویی سەڵاحەددین بوو. دەرکەوتنی تورکە سەلجووقییەکان و پتەوبوونی پایەی دەسەڵاتیان لە عێراق دا، سەری

---

427 النوادرالسلطانية, ٢١٦, هەروەها: ابن كثير, ١٢/٣٧١. سليمان, ٣٠٩.

428 بهاءالدين ابن شداد, ٢١٧. ابن كثير, ١٢/٣٧٢.

429 نك: ئەم لێکۆڵینەوەی بەر دەستت. ١١١.

کێشا بۆ نیشتەجێبوونی تورکەکان لە هەرێمی جەزیرەداو بە دەسەڵات گەیشتنی زەنگیی لە موسڵ، درێژەی بەو رەوتە دا. ئەومیوانە بانگهێشت نەکراوانە (پێکهاتەی نەتەوەیی) ناوچەکەو پێکەوەژیانی ئاشتییانەو لە مێژینەی رەگەزو نەتەوە جیاجیاکانی ئەو دەڤەرەیان شێواند. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە هیچ هەواڵ وزانیارییەکی مێژوویی لە مەڕ کێشەو ناکۆکیی نێوان کوردو دراوسێ ناموسڵمانەکانی دیکە، یان رەگەزە جیازوازەکانی تری وەك ئەرمەنییەکان کە لە دێر زەمانەوە لەگەڵ کوردەکان — بۆ نموونە لەناوچەی زۆزان — پێکەوەژیان و دراوسێیەتییان هەبووە، لە سەرچاوە مێژووییەکان دا نییەو ناکەوێتە بەر چاو. بەڵام بەشداریی تورکەکان لەو سەدەیەداو جێگیربوونیان لە ناوچەکەدا، چەندین جار کێشەو ئاڵۆزیی نەتەوەیی لەگەڵ کوردەکان بە دواوە بووەو شوێنەواری خراپ ونەرێنیی هەمەلایەنەی ئەوتۆی لە دوای خۆی بەجێ هێشت، کە تائێستاش درێژەی هەیە! نابێ لەو راستییە بێئاگا بین کە نووسەر بە هیچ شێوەیەك و لە ژێر هیچ ناو و سەردێڕێك دا ، نایەوێ پێناسە بۆ ململانێی رەگەزپەرستانەی ئەو چاخەدەربێنێ و مەبەست لە گێڕانەوەی ئەو رووداوانە، تەنیا نووسینەوەو تۆمارکردنی مێژوویە بۆ بەهێزکردنی ئاستی هوشیاریی و زانیارییەکانی مرۆڤ، لە پێناو ژیانێکی باشتردا، ئەگینا نووسەری ئەم دێڕانە لەگەڵ مەولانادا هاودەنگە کە دەڵێ:

دەشێ تورك و هیندییەك هازمان بن دەشێ دوو تورك وەك بیێگانان بــن.

دوای پاشەکشەی ریچارد لە بیت المقدس، تەواوی هەل و مەرج و بارودۆخەکە سەری کێشا بۆ ئاشتی ویستیی ناوبراو و دەستی لە قسە گەورەو داوا زلەکانی هەڵگرت و هێندێك ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆی گێڕایەوە بن دەستی سەلاحەدین. ئەویش وێڕای پەسندکردنی داوای ئاشتیی ریچارد، وەفدێکی ناردە

لای کە سیف الدین مەشتووب ئەندامی وەفدەکەی بوو، دوو لایەن لە شەعبانی ساڵی ٥٨٨ ك دا رێکەوتننامەی شەڕداکوژانێکی سێ ساڵەیان پێکەوە مۆر کرد.[430]

سەلاحەددین دوای ئەو رێکەوتنە مۆڵەتی بە سەردارو سەربازەکان داو بۆخۆشی لە قودس خەریکی رێك وپێك کردنی کاروبارەکان و دروستکردنی قوتابخانەو میوانخانە و نەخۆشخانەو... بوو و بەوپەڕی رێزەوە هەڵس وکەوتی لەگەڵ ئەو پاشا فەرەنگی یانە دەکرد کە دەهاتنە چاوپێکەوتنی. پاشان نیازی سەفەری حەجی کەوتە سەرو بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخەکە پاشگەز بۆوە. لە مانگی شەووالی ساڵی ٥٨٨ ك دا خەیاڵی سەفەری دیمەشقی کەوتە دڵ. بە پێی قسەکانی عیماد کاتب کە هاوڕێی ئەو گەشتەی سەلاحەددین بوو، لە رێگای گەشتەکەی دا جومعەیەك لە نابلۆس مانەوەو سەلاحەددین چاوی بە هێندێك سکالای خەڵك لە سیف الدین مەشتووب داخشاندو وەلامی دانەوەو دوانیوەڕۆی رۆژی شەممە بە مالاوایی پڕلە رێزی مەشتووب، ئەو شارە یان بە جێ هێشت.

لەو سەفەرەدا شەویان لەگەڵ سیف الدین رۆژ کردەوەو بەرەبەیانی رۆژی دواتر مالاواییان لێکرد[431] و ئەو چاوپێکەوتنە دوادیداری ئەو دوو جەنگاوەرە کوردە بوو کە شان بە شانییەکتر لەشی پاشاکانی فەرەنگی یان وەلەرزە خستبوو و خودای جەنگاوەریی و شەڕوانی بوون لە گۆڕەپانی شەڕداو خودانی جوامێریی و مێرخاسیی بوون لە مەیدانی مرۆڤدۆستیی و لێبووردەیی دا. سیف الدینیش لە بیست وشەشی شەووال دا خۆری تەمەنی لەخۆرنشینی مەرگ نیشتەوەو لاشەی بێ گیانی لە خۆڵستانی دنیا دا دانا. سیف الدین دوای هێرشی عیماد

430 ابن واصل, ٢/٤٠٤.

431 الفتح القسی.., ٦١٣.

زەنگییەکەم بۆ قەڵەمڕەوی هەکارییەکان، ئەو ناوچەی بە جێ هێشت و بە بڵاو بوونەوەی ناو و دەنگی ئەسەدەددین شێرکۆو گەورەبوونەوەی کارەکەی، رەگەڵی کەوت و بەردەوام لە پەنای بوو. تەرمەکەیان بردەوە بۆ بیت المقدس و لە ماڵەکەی خۆی دا ئەسپاردەی خاکیان کرد. ئیبنو خەلەکان لە پەسنی ئەو پیاوەدا دەلێ: (ئازاترین و پایەدارترین و ورەبەرزترین میرو فەرمانداەی سەلاحەددین بوو". [432] سەلاحەددین دوای مردنی سیف الدین سییەکی داهات و دارایی شاری نابلۆسی بۆ قودس تەرخان کردو باقییەکەشی بە عیمادەددین کوڕە سێزدە ساڵەکەی سپارد. [433]

دەتگوت سەلاحەددینیش توانای هەڵگرتنی باری گرانی خەمی لێکدابڕانی نەبوو و نەیدەتوانی لەو جەنگاوەرە ورەبەرزەی هاوشانی خۆی جیا بێتەوە و ماوەیەك دواتر لە بیست و حەوتی مانگی سەفەری ساڵی ٥٨٩ ك دا ئەویش کۆرپەی ساوای گیانی شیرینی لە شیری دونیا بڕیەوە. [434] بە مەرگی ئەو سەرداره بە کارە کە خوای شمشێر بوو لەمەیداناو بە سۆز بوو لەگەڵ هەمووانناو پشوودرێژ بوو لە کاراناو دادپەروەر بوو لە چارە سەری گرفتەکاناو .... تەمی خەمێکی قووڵ کەوتە سەر دڵی موسڵمانان.

لەو پێوەندییەدا ناشێ بە سەر ئەو خاڵە گرینگە دا باز بدەین و لە بەرچاوی نەگرین کە: سەلاحەددینیش یەکێك لەو کەسایەتییانەیە لە دادگای (پەیڕەوانی

[432] وفيات الاعيان, ١/١٨٣.

[433] اصفهاني, الفتح القسى..., ٣ ٦١. بهاءالدين ابن شداد, ٢٤٠. ابن خلكان, ١/١٨٢-١٨٣. ابن واصل, ٢/٤١٠-٤١١ ., ابوالفدا, ٣/٨٨.

[434] ابن اثير, الكامل, ١٠/١١٨-١٢١. قس: راوندي, ٣٣٧. ( درێژترین و روونترین و هەمەلایەنەترین نووسین سەبارەت بە سەلاحەددین لە لایەن ئیبنوخەلەکانەوە نووسراوەو لە نێو ئەو کەسایەتییانەدا کە باسی کردوون زۆرترین گرینگیی بەو داوە.) ((وفيات الاعيان ٧/ ١٣٩-٢١٩))

ئایدۆلۆژیا) دا کە لە تەڵەی هەڵەی ئاناکرۆنیسم دا گیریان خواردووە، بە ناڕەوا مەحکووم کراوە، بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییە گرینگە کە سەلاحەددین بۆخۆی (دەقێکە)[٤٣٥] و دەبێ لە (بواری)[٤٣٦] خۆیدا داوەریی و قەزاوەتی لە سەر بکرێ و کەسایەتییەکەی بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی خۆی هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێ، بەشێك لەکوردە نەتەوەخوازەکان کەتا ئێستاش نەیانتوانیوە (ئامانجەکانیان) لە (ئارەزووەکانیان) جیا بکەنەوە، بە بێ وەبەرچاوگرتنی هەورازو نشێو و گەوەو پێچەکانی مێژوو، بە سەر راستەهێڵێك دا بەرەو دوا گەڕاونەوەو بێئاکامیی مێژووی نەتەوەکەیان، بە سەر شانی کەسایەتییەکی وەك سەلاحەددین دابڕیوەو لە دژی دەدوێن و دەڵێن: بۆچی (کوڕی سەردەمی خۆی) بووە! و لە جیهانی پڕنهێنیی و نادیاری بەر لە مۆدێرنیتەو پێش شۆرشی پیشەسازیی و چەندین سەدە ململانێ و ئاڵ و گۆڕی فیکریی دا، ئالای نەتەوەپەرستیی و ناسیۆنالیستیی بەرزنەکردۆتەوەو بۆچی نەبۆتە (جەمال عبدالناصر) یان (کەمال ئەتاتورك) بۆ کوردەکان! وەك ئەوە کە لە کاتی کەم بایەخیی ئەم بابەتە بە لای سەلاحەددینەوە، تورك و عەرەبەکانی ناو سوپاکەی شمشێریان لەولا دانابێ و بە ئارخەیانیی خەریکی کێشانی هێڵی سنووری ئازەربایجان و عەرەبستانی گەورەی خۆیان بووبن!! لە لایەکی تریشەوە هێندێك بناژۆی توندڕە وی مەزهەبیی کە بەردەوام بۆ باوەشی گەرمی رابردوو، ناڵەو هاواریانەو سەرەڕای تایبەتمەند ییە تایبەتەکانی هەر قۆناغێکی مێژوویی، پێیان وایە کە رە وتی مێژوو دەبێ لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی ئەواندا هاوتەریب بێ و بۆخۆشیان وا دەزانن کە مێژوو گۆڕەپانی هۆکارەکانە، نەك مەیدانی هەڵ

---

[435] text
[436] context

و دەرفەتە هەڵکەوتووەکان و هیوادارن کە ڕێی سەد ساڵ بە شەوێك ببڕن– امسیت کردیا و اصبحت عربیا– ئێوارە کورد بووم بەیانی بوومە عەرەب– و شەڕی پەراوێز دژی دەق بە بەرگی دین دادەپۆشن، یان روخساری ئەو کەسایەتییە بەراوەژوو نیشان دەدەن و یان بە شێوەیەکی دزێو پارێزگاریی لە خۆی و هەڵوێستەکانی دەکەن و بەم هەڵس و کەوتەیان ئیمەنێکی نەخوازراوی لێ وێنا دەکەن و دەیکەنە نموونەی بەرچاوی توندو تیژییە کوێرکوێرانەکانی خۆیان و ئەو راستییە حاشاهەڵنەگرە لە بەرچاو ناگرن کە ئەو سەرکردە مرۆڤدۆستە، کەسایەتییەکە سەرەڕای ئەوە سێ هەزار سەربازی سوپاکەی بە ڕووتیی لە پێش چاوی تێکڕای خەڵك سەریان پەل دەدرێ، ڕێگای دژکردەوەییەکسان و تۆڵەسەندنەوە ناداو لەودیو روخساری راستەقینەی ئەو سەرکردە مێژووییە، سەنگەر دەگرن. هاوئاراستەیی ئەو دوو ڕەوتە بە رواڵەت جیاوازە کە دە ستی دۆستایەتییان لەملییەکتر کردووە، و بە وە ڕێخستنی ئەو ململا نێیەو کەمڕە نگ نیشاندانی لایەنی فەرهەنگیی ئەو سەردارە، کە پاڵپشتێکی بەهێزی مێژووی جیهانە نەك دیرۆکی نەتەوەو جیهانبینییەك، و ئێمەی "کورتەباڵا لە سەر شان و پیلی راوەستاوین"، بەم چەشنە دەیکەنە قوربانی ئایدیۆلۆژیاکانی خۆیان و ئەم کارەیان فرە بە ئێش و نەشیاوەو جێی سەرنج و تێڕامانە!

**١–٤–٢– کوردەکانی جەزیرە لە سەردەمی جێنشینەکانی صلاح الدین دا (٥٨٩–٦١٤ ك)**

مەلیك ئەفزەلی کوڕی سەلاحەدین کە بەخراپتر بوونی باری تەندروستی باوکی پەیمانی لە خەڵك و فەرماندە لەشکرییەکانی وەك میرخوشتەرین

هەکاریی و نەوشیروان زەرزاریی و ئیبنو مەشتووب هەکاری و...وەرگرتبوو،[٤٣٧] دوای کۆچی باوکی و رێو رەسمی ناشتن و ئازیەتباریی، جل و بەرگ و کەرە سەی جەنگیی سەلاحەددینی بە قازیی زیائەددین ئەبولقاسم شارەزووریی دا رەوانەی بەغدا کردو خەلیفە الناصر لدين اللەی لە هەواڵەکە ئاگادار کردەوە.[٤٣٨]

لە لایەکی ترەوە مەرگی سەلاحەددین بوو بە هۆی تەشەنەسەندنی بڵێسەی ئاگری دەسەلاتخوازیی عزالدين مسعودو مجدالدين ابوالسعادات جەزە ریی برای ئیبنو ئەسیری دیرۆکنووس، هەمیشە گڕی ئەو ئاگرەی خۆشتر دەکردو هانی دەدا هێرش بکاتە سەرقەڵەمڕەوی سەلاحەددین. سەرەنجام عزالدين رازی بوو و لە نوسەیبینەوە بەرەو شەنگار رۆیشت و بە سوپای عیمادەددینی برایەوە لەشکری هێنا بۆ سەر روها. بەلام لە نیوەی رێگادا بە هۆی سکچوونی خوێناویی ، زۆر لاواز بوو و لەگەڵ مجدالدين جەزەریی گەڕایەوەو ماوەیەك دواتر لە شەعبانی ساڵی ٥٨٩ ك دا لە موسڵ کۆچی دوایی کرد[٤٣٩] و نوورەدینی کوڕی بوو بە جێنشینی.

دوای مردنی سەلاحەددین گڕی ئاژاوەو ناتەبایی لە نێو بنەماڵەی سەلاحەددین هەڵگیرساو زەبرێکی قورسی لەدەسەلاتی ئەییوبییەکان داو رێگە خۆش بوو بۆ دووبارە بەدە سەلات گەیشتنەوەی ئەتابەکانی زەنگیی.

دوای سەرهەڵدانی ناکۆکیی لە نێوان مەلیك ئەفزەڵ فەرمانڕەوای دیمەشق و مەلیك عەزیز فەرمانڕەوای میسر،-کە هەردووکیان کوڕی سەلاحەددین بوون-

---

[437] ابن واصل, ٢/٤١٨-٤١٩.

[438] اصفهانی, الفتح القسی..., ٣/٦٠. ابوشامه, الروضتين, ٢/٢٥٥. ابن واصل, ٣/٨.

[439] ابن اثير, الكامل, ١٠/١٢١-١٢٣. هه روه ها نك: همو, التاريخ الباهر, ١٨٥. غندور, ١٤١.

میرو فەرماندەکانی میسر داوایان لە عەزیز کرد هێرش بکات بۆ شام. گرینگترین بەڵگەی رازیبوونی مەلیك عەزیز بەو داوایە، ئەوە بوو شاری جوبەیل کە لە سەر سنوور بوو لە لایەن فەرمانڕەوای کوردی ئەو شارەوە لە ساڵی ٥٩٠ك دا درابوو بە فەرەنگییەکان.[٤٤٠] بەڵام سەرەنجام لەگەڵ مەلیك ئەفزەڵ و هاوپەیمانەکانی پەیمانی ئاشتیی مۆر کردو گەڕایەوە بۆ قەڵەمڕەوی خۆی.

ساڵی دواتر ئاگری ئەو ناکۆکی یانە تەشەنەی سەندو میرو سەردارە سەربازییەکانی مەلیك عەزیز جارێکی تر هانیان دایەوە تا هێرش بکاتەوە بۆ دیمەشق[٤٤١] و بەڵگەی ئەمجارەیان ئەوەبوو کە بە هۆی بوونی کوردو پیاوەکانی ئەسەدەددین شێرکۆ لە ناو ریزی سوپای میسردا، ئەگەری هەڵگەڕانەوەی ئەوان لە پێناو بەرژەوەندیی مەلیك ئەفزەل دا، لە گۆڕێیە. مەلیك ئەفزەل فەرمانڕەوای دیمەشق دیسان پەنای بردەوە بەر مەلیك عادلی مامی و مەلیك زاهیری برای. بە نزیکبوونەوەی مەلیك عەزیز لەدیمەشق ابوالهیجاو السمین فەرماندەی کوردەکان و سیف الدین ئایازکوش فەرماندەی گرووپی ئەسەدییە – کە لە پیاوەکانی ئەسەدەددین شێرکۆ بوون– نامەیەکیان بۆ مەلیك عادل نووسی و گوێڕایەڵیی و فەرمانبەرداریی خۆیان بۆ مەلیك ئەفزەل راگەیاند. چونکە لە سیاسەت و هەڵوێستەکانی عەزیز لە مەڕ خۆیان رازی نەبوون. بەم جۆرە عادل و ئەفزەل بە مەبەستی شەڕ لە دیمەشق هاتنەدەرو ابوالهیجاو و ئایازکوشیش سوپای مەلیك عەزیزیان جێ هێشت و چوونە لای ئەوان.[٤٤٢]

---

[440] ابن واصل, ٢٦/٣.

[441] ابن اثير, الكامل, ١٣٧/١٠.

[442] همو, ١٣٨/١٠.

ئەو بارودۆخەی هاتبۆ ئاراوە مەلیك عەزیزی ناچار کرد بگەڕێتەوەبۆ میسر.عادل و ئەفزەل کاتێك هەستیان بەوە کردکە هەل و مەرجەکە لە بەرژەوەندیی ئەوان دایە، بڕیاریان دا هێرش بەرنە سەر میسر. لە ڕێگەدا قودسیان لە نوێنەری مەلیك عەزیز وەرگرتەوەو دایان بە ابولهیجاء السمین[٤٤٣] و لە پێشڤەچوونیان دا بەرەو میسر لە شوێنێك بە نێوی بەلبیس لەنزیکی فوستات دابەزین. بە گەیشتنیان بۆ ئەو شوێنە مەلیك عادل ترسی لێ نیشت لەوە ئەگەر بێت و ئەفزەل میسر بگرێ، دەسەڵاتێکی زیاتر پەیدا دەکاو زیرەکانە هەڵوێستی خۆی گۆڕی و لە لایەکەوە بە نهێنیی مەلیك عەزیزی هاندا کە بەرگریی بکات و لە لایەکی تریشەوە مەلیك ئەفزەلی دنە دەدا بە ئاشتیی رازی بێت! سەرەنجام توانی بە هۆی ئاشتییەك کە بۆخۆی رۆڵی سەرەکیی تێدا گێڕابوو، شارەکانی فەلەستین و تەبەرییەو... بداتە مەلیك ئەفزەل و بۆخۆشی بە داهات و دەسکەوتە پێشینەکانی خۆیەوە لە میسر لای مەلیك عەزیز بمێنێتەوە. ئاکام و دواهاتی ئەو بارودۆخەش پەرە سەندنی دەسەڵاتی مەلیك عادل بوو بە هۆی لایەنگریی کوردو فەرمانڕەوا ئەسەدییەکان لە ناوبراو و لە ڕێگەی کۆنترۆڵ و چاودێریی ئەو دوو برایە مەلیك ئەفزەل و عەزیز دەیتوانی جڵەوی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان بە دەستەوە بگرێ.[٤٤٤]

مەلیك عادل کە بە هۆی زە ینی روون و بیری تیژو پێگەی سیاسیی خۆی شارەزای کاکڵ و گەوهەری سیاسەت بوو و دەیزانی یارونەیارەکانی بە پێوەری بەرژەوە ندییەکانی هاوێر بکا، ئەمجارە یان لەگەڵ مەلیك عەزیز یەکی گرت و لە ساڵی ٥٩٢ ك دا لە دژی مەلیك ئەفزەل هاوپەیمانی پێشووی خۆی، هێرشی

---

443 ابن واصل، ٣/ ٥٢.

444 ابن اثیر، الکامل، ١٠/١٣٨-١٣٩. قس: ابن واصل، ٣/٥٣-٥٤.

کردە سەر دیمەشق و بە گرتنی شارەکە لە کورسی دەسەڵات دایبەزاندو قەڵەمڕەوەکەی سپاردە دستی مەلیك عەزیز! دوای ئاسایی بوونەوەی بارودۆخەکە عەزیزیش چوو بۆ قودس و فەرمانڕەوای ئەو شارە ابوالهیجاء السمین ی بە تۆڵەی جیابوونەوەکەی لە عەزیز لە ساڵی پێشووتردا، لە سەر دەسەڵات لابرد.[٤٤٥]

ابولهیجاء دوای ئەو رووداوە شامی بە جێ هێشت و رۆیشت بۆ موسڵ. لەوێشەوە خەلیفە الناصر بانگی کرد بۆ بەغداو لە ساڵی ٥٩٣ ك دا لە لایەن خەلیفە و یاوەرەکانییەوە بە گەرمیی پێشوازیی لێکراو هاتە ناو بەغدا. ناوبراو سەری بچووك و زگی گەورە بوو و هەر لەبەر ئەو هۆیە بوو کە بە السمین (زۆر قەڵەو، قەڵەوێکی ناڕێك) ناسرابوو. گۆزەکەرێك لە بازاڕ گۆزەیەکی لە سەر شێوەی ئەو دروست کردو لە بازاڕی شار هەڵیواسی. ئەبولهەیجاء بە بینینی دیمەنی گۆزەکە دڵخۆش بوو و پێکەنی. وەستاکارەکانی تریش لاسای ئەو گۆزەیان کردە وە و ژمارەیەکی زۆری لێ دروستکراو لە بازاڕ بە ناوی ابوالهیجاو السمین ناوی دەرکردو رێژەیەکی زۆری لێ دەفرۆشرا. لە ماوەی مانەوەی ابوالهیجاء لە بەغدا، خەلیفە بە شانازیی ئەو چەندین ئاهەنگ و رێ و رەسمی وەڕێخست و پاشان ناردی بۆ هەمەدان بۆ ئەوەی بچێتە ریزی هاوپەیمانە تازەکانی دەزگای خەلافەت لەو شارە. بە گەیشتنی ابوالهیجاء بۆ هەمەدان، بارودۆخ لە بەرژە وە ندیی ئەو و بە گوێرەی ویستەکانی نەبوو وهاوپەیمانەکانی خەلیفە لێی جیا بوونەوە. السمین کە مانەوەی لەهەمەدان بەو بارە نالەبارە وە بە باش نەدەزانی و بەم حاڵەشەوە شەرمی دەکرد بگەڕێتەوە بۆ بەغدا، لە ساڵی ٥٩٤ك دا بڕیاری دا بگەڕێتەوە بێشکەی لە دایکبوونی خۆی

[445] همو, ٣/٧٠.

بۆ هەولێر. بەڵام بەر لەوەی بگاتەوە شار کۆچی دوایی کرد.[٤٤٦] دیارە چارەنوسی بەو چەشنە بووە. ئەو سەردارە شاسوارە نێودارە کە سەردەمێك فەرماندەی ئازاو زیت و چالاکی سەر گۆڕەپانی شەڕی خاچهەلچگرەکان بوو و ناو و دەنگی دڵی دوژمنی دەخستە لەرزەو ماوەی دوو ساڵیش بە توندیی پارێزگاریی لە عەکا کردبوو، قەدەر وای بۆ دانابوو کە ئاکام و دوارۆژی ژیانی بەم جۆرە بێت.

نوورەدین ئەرسەلانشا کە فەرمانڕەوای شاری موسڵ بوو، بە هۆی ناکۆکییەك کە لەگەڵ قوتبەددین موحەممەدی ئامۆزای دا هەیبوو، لە ساڵی ٥٩٤ ك دا، سوپای هێنایە سەر نوسەیبین و بە هۆی ئازایەتییەکێك لە میرە کوردەکانی کە ناوی میر فەخرەددین عبدالله میهرانیی بوو، توانی دەست بە سەر شارەکەدا بگرێ. قوتبەددینیش هانای بردە بەر مەلیك عادلی مامی. هەر لەو کاتەدا نەخۆشییەك لە نێو سوپای نوورەدین دا بڵاو بۆوەو زیانی گیانی زۆری لێدان و ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ موسڵ. میر فخرالدین عبدالله میهرانیی و شمس الدین عبدالله میهرانیی لە ریزی ئەو کەسانەدا بوون کە بەو نەخۆشییە گیانیان لە دەستدا.[٤٤٧]

مەلیك عادل کە بۆ یارمەتیی و پاڵپشتیی قوتبەددین موحەممەد چووبوو بۆ دەڤەری جەزیرە، سوپای هێنایە سەر ماردین کە ساڵانێکی دوورو درێژ لە بەر دەستی ئورتوقییەکان دابوو و لەو کاتەدا "یولەق ئەرسەلان" فەرمانڕەوای شارەکە بوو. بە هۆی خیانەتی هاوولاتییەك دەستی بە سەر رۆخی شارەکەدا

---

[446] ابن اثير, الكامل, ١٠/١٤٤. ابوشامة, الذيل علي الروضتين, ١١/١٤-١٥. ابن كثير,١٣/١٧. ابن تغري بردي, ٦, ١٤٥,١٤١.

[447] ابن اثير, الكامل, ١٠/١٥١-١٥٢. التاريخ الباهر, ١٩٢-١٩٣.

گرت و بە زەبرو توندو تیژیی خەڵکی ئەو دەوروبەرەی تالان کردو پێوەندی قەلای شارەکەی لەگەڵ دەرەوەی خۆی دابڕی.[٤٤٨] توندیی ئابلۆوقەکە و برسییەتی خەڵك لە ژێر سایەی ئەو گەمارۆیەدا، توانای خۆڕاگرییان لێ زەوت کردبوو. هەر لەو کات و بارودۆخەو لە سالی ٥٩٥ك دا مەلیك عەزیز فەرمانڕەوای میسر کۆچی دوایی کردو بە هەوڵ و پشتیوانیی "ئایازکوش" و سەردارانی کورد، مەلیك ئەفزەل جێگەی گرتەوەو دوای سەقامگیر بوونی باری میسرو رێکوپێك کردنی کاروبارەکانی ئەو ناوچەیە، سوپای هێنایە سەر دیمەشق. مەلیك عادل بە بیستنی هەواڵی ئەو لە شکرکێشییە، مەلیك کامیلی کوڕی بۆ سەرپەرستیی گەمارۆی ماردین داناو خێرا خۆی گەیاندە دیمەشق.[٤٤٩]

بە گەیشتنی ئەفزەڵ بۆ دیمەشق و گەمارۆدانی شارەکە، میر مجدالدین هەکاریی برای فەقێ زیائەددین عیسا هەکاریی هاوڕێ لەگەڵ کوردێکی تر بە نێوی شجاع الدین یونس توانیان لە رێگەییەکێك لە دەروازەکانەوە بچنە ناو شار. خەڵکی دیمەشق بە بینینی ئەوان دروشمی پشتیوانیی لە مەلیك ئەفزەلیان بەرز کردەوە، بەلام چونکە ژمارەیان کەم بوو سوپای مەلیك ئەفزەل راوی نان و پاشەکشەی پێکردن.[٤٥٠]

بە درێژبوونەوەی ئابلۆوقەکە توغرول میهرانیی کە میرێکی کورد بوو لە ریزی سوپای ئەفزەل دا، لێی جیا بۆوەو چوو بۆ لای سوپای مەلیك عادل. مەلیك عادلیش لە لای خۆیەوە دەستی کرد بە پیلان دانان — کە لەو بوارەدا دەستێکی بالای هەبوو — و دەستی کرد بە پەلکێشکردنی میرو فەرماندەکانی

---

448 همو, الکامل, ١٥٦/١٠. ابن واصل, ٨٠/٣.

449 ابن اثیر, الکامل, ١٥٧/١٠-١٥٩. ابن واصل,٩٥/٣. ابن تغري بردي, ١٤٧/٦.

450 ابن اثیر, الکامل, ١٦٠/١٠. ابن واصل, ٩٦/٣.

دیکەی سوپای ئەفزەل بۆ لای خۆی و پێوەندی بە عزالدین دیرباسی میهرانییەوە کردو پارەیەکی زۆری پێداو داوای لێکرد مەلیك ئەفزەل هان بدات بۆ ئاشتەوایی. کارەکە سەری گرت و ئەفزەل رازی بوو و ماوەیەکی کەم ئاشتیی جێگیر بوو و مەلیك عادل کەڵکی لە ودەرفەتە وەرگرت و لە لایەکەوە توانی ژمارەیەکی تری فەرماندەو میرە کوردەکانی مەلیك ئەفزەل وەك سیف الدین علی میهرانیی و حسام الدین عیسا کوڕی خوشتەرین هەکاریی و سیف الدین ی برای، بۆ لای خۆی رابکێشێ[٤٥١] و لە لایەکی تریشەوە هاوپەیمانەکانی خۆی لە قودس و.... بێنێت بۆ پشتیوانیی خۆی و سەرەنجام بە هێنانەوەی مەلیك کامیل لە گەمارۆی ماردین، توانی هۆکارەکانی لاوازیی مەلیك ئەفزەل و پاشگەزبوونەوەی لە گەمارۆی دیمەشق، ئامادە بکات.[٤٥٢]

لە ساڵی ٥٩٧ ك دا مەلیك زاهیرو مەلیك ئەفزەل داوایان لە نوورەدین ئەرسەلانشا کرد هێرش بکاتە سەر قەڵەمڕەوی مەلیك عادل و هەروەها ناکۆکیی کەوتە نێوان مەلیك ئەفزەل و مەلیك ئەوحەدی کوڕی مەلیك عادل لە میافارقین و لە ژێر کاریگەریی ئەو بارودۆخەدا، شڵەژاویی و نائارامیی زۆربەی دەڤەری جەزیرەی گرتەوە. بەڵام سەرەنجام بە هۆی ئاشتەوایی نێوان نوورەدین و مەلیك فائیز کوڕەکەی تری مەلیك عادل و رازژیبوونی مەلیك ئەفزەل بە دەسەڵاتی مەلیك ئەوحەد، تا رادەیەك هێمنایەتیی گەڕایەوە ناوچەکە.[٤٥٣]

هەر لەو کاتەدا کە کوردەکانی جەزیرە ببوونە قووربانیی ململانێی نێوان ئەییوبییەکان و ناتەباییان لەگەڵ فەرمانڕەواکانی تری ناوچەکە، ئەو کوردانەی

---

[451] ابن واصل, ٩٨/٣. قس:ابن اثیر, الکامل, ١٦٠/١٠.

[452] همو, ١٠/ ١٦٠-١٦١

[453] همو, ١٧٩/١٠. ابن واصل, ١١٦/٣.

کە بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەییوبیی لە یەمەن لە ساڵی ٥٦٩ك دا ڕێیان کەوتبۆ ئەو وڵاتە، لە ساڵی ٥٨٨ ك دا لە پێناوی پاراستنی ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان دا، هەستانە سەر پێ. مەلیك موعیز ئیسماعیل کە بوو بە جێنشینی زەهیروددین تۆغتگین ی باوکی، هەر لەو ساڵەدا دوای سەرکوتکردنی یاخییەکان، ڕێگەی نەدا خوتبە بە ناوی عەبباسییەکانەوە بخوێندرێتەوە و بانگەشەی خەلافەتی خۆی کردو خوتبەی بە ناوی خۆی جاڕ داو بە مەبەستی دابینکردنی پشتیوانیی فیکریی و ڕەوایی دان بەو داوایەی خۆی لە هەڵوێستێکی سەرسوڕهێنەردا، ڕایگەیاند کە لە بنەماڵەی بەنی ئەییوبییە! مەلیك عادلی مامی گوێ بیستی ئەو هەواڵە بوو و وێڕای بە درێودانانی ئەو داوایە، وەدرۆی خستەوە. ئەو هەڵوێستەی مەلیك موعیز بۆ کوردەکانی ریزی سوپاش گران و ناخۆش بوو و لە دژی مەلیك موعیز شۆڕشیان وەڕێخست و سەرەڕای کوشتنی مەلیك سەرە بڕاوەکەشیان بە سەرانسەرییەمەن دا گێڕا. پاشان لە ساڵی ٥٩٩ ك دا مەلیك ناسری برای مەلیك موعیزیان لە جێگەی دانا. ئەویش کە بە چاوی خۆی نواندنی دەسەڵاتی کوردەکانی بینیبوو، و دەیزانی ئەو دەسەڵاتە وەك (شمشێری داموکلێس) بەردەوام لە سەر سەری هەڵداوەسرێ و بێگومان ڕۆژێك یەخەی ئەویش دەگرێ، دوای ئاسایی بووونەوەی بارودۆخەکە، ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و ئەوانەش کە مابوون بە زنجیر بەندی کردن.[٤٥٤]

هێرشی دووبارەی مەلیك عادل بۆ سەر ماردین هەر لەو ساڵەداو ململانێ و کەڵەوەکێشیی لەگەڵ فەرمانڕەوای ئەو شارە، تەنگی بە خەڵکی ناوچەکە هەڵچنی و سەرەنجام لە سەر بنەمای گوێڕایەڵیی و پەیڕەویی فەرمانڕەوای ماردین بۆ مەلیك عادل و خوێندنەوەی خوتبە بە ناوی ئەو، ئاشتەوایی لە

[454] ابن واصل, ٣/١٣٦-١٣٧.

نێوانیان دا جێگیر بوو و بەم جۆرە ماردین بوو بە بەشێك لە قەڵەمڕەوی ئەییوبییەکان.[455]

لە ساڵەکانی دەیەییەکەمی سەدەی حەوتەمی کۆچیی دا، ململانێی نێوان ئەتابەکانی زەنگی لە لایەك و شەڕەکانیان لەگەڵ رکابەرە سیاسییەکانی تری وەك کەوکەبووری فەرمانڕەای هەولێر لەلایەکی دیکەوە،هەرێمی جەزیرەی کردە گۆڕە پانی رایەڵکە و هاتوچۆ و سوارسوارێنیی ئەسپان و ئەو هێرش و لەشکرکێشییە زۆرانە، سێبەری نائارامیی و چەقبەستوویی بە سەر ناوچەکەدا زاڵ کرد.[456]

دوای کۆچی دوایی مەلیك زاهیر فەرمانڕەوای حەڵەب لە ساڵی ٦١٣ ك دا، کوڕە منداڵکارەکەی کە ناوی مەلیك عەزیز بوو جێی باوکی گرتەوە. شهاب الدین توغرول ئەتابەکی مەلیك عەزیز، لە ترسی دەستدرێژیی کەسانی تر بۆ سەر مەلیکی نوێ بە هۆی ئەوە کە منداڵ بوو، بانگی مەلیك ئەشرەف کردەوە بۆ حەڵەب. بە هاتنی ئەشرەف و بە دەستەوەگرتنی جڵەوی کاروبارەکان، میرەکانی مەلیك زاهیر ترسیان لێ نیشت. میر عیسامەددین عیسا کوڕی خوشتەرین هەکاریی کە یەکێك لەمیرە ناودارەکانی مەلیك زاهیر بوو، داوای لە میرەکانی تر کرد چارەسەری گرفتەکە بۆ ئەو لێگەڕێن. رۆژێك کە مەلیك ئەشرەف هاوڕێ لەگەڵ مەلیك عەزیزو سەردارو فەرماندەکانی تر بە مەبەستی گەشت و گەڕان لە شار دەرچووبوو، حیسامەددین خۆی گەیاندێ و بە بیانوی ئەوە کە بە بوونی خۆی لە حەڵەب دا مافی مەلیك عەزیزی زەوت کردووە،

455 ابن اثیر, الکامل, ١٠/١٨٨-١٨٩. ابن واصل, ٣/١٩٣. ابن وردی, ٢/١٧٩.

456 بۆ زانینی درێژەی باسی هێندێك لەو ململانێ یانە بڕوانە(نك: ابن اثیر, الکامل, ١٠/١٩٨-٢٠٠. ٢٧٣-٢٧٤. ابن واصل, ٣/١٩٣-١٩٦.

ڕێگەی پێنەدا بگەڕێتەوە ناو شار. ئەشرەف چونکە دەیزانی کاربەدەست و سەردارنی تریش لە پشت پەردەی ئەو کێشەیەن، ناچار بوو دان بە خۆدا بگرێ. بەڵام رق و قینی قووڵی حیسامەددین لە دڵی دا چەکەرەی کرد.[٤٥٧]

**بەندی پێنجەم: کوردەکانی جەزیرە و ڕووبەڕووبوونەوەی خوارەزمشاهیی و مەغۆلەکان (٦١٤– ٦٥٦ ك)**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژە کرا بە ناتەبایی و ململانێی نێوخۆیی ئەییوبییەکان لە لایەك و ناوەندە خاوەن دەسەڵاتەکانی تر لە لایەکی دیکەوەو ئەوەندەی پێوەندی بە بابەتی توێژینەوەکە هەبوو، گۆشەو قوژبنەکانی ئەو باسە شی کرانەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەویارودۆخەدا لە ڕۆژهەڵات – ماوراء النهر خوراسان – خوارەزمشاهییەکان تاقەسواری سەر گۆڕەپان بوون[٤٥٨] و سوڵتان محمد خوارەزمشا (٥٩٦–٦١٨ ك.م) خەیاڵی داگیر کردنی بەغداو پێچانەوەی

457 یونینی, ٢/٢٢٣-٢٢٤.

458 ( بە هۆی ناوی حکومەت و دەسەڵاتی سوڵتان محمد خوارەزمشا, بە ناوی ((خوارەزمشاهیەکان)) نێوبانگیان بڵاو بۆوە. سوڵتانە سەلجووقییەکان بە هۆی دووریی ئەو هەرێمەو ئەگەری هەڵگیرسانی شۆرش لەو شوێنە, وایان بە باش دەزانی کە حکومەتی خوارەزمییەکان بدەنە دەستی فەرماندەو پیاوەکانی خۆیان,نەك کەسانێك کە سەر بە بنەماڵەی سەلجووقییەکان بن! یەکەمین کەس کە خۆی خزاندە نێو پێکهاتەی سیاسی سەلجووقییەکان و پێگەی خۆی قایم کرد, "ئەنووشتەگین غەرچە" بوو کە لە نیوەی دووهەمی ماوەی فەرمانڕەوایی مەلیکشای سەلجوقیی دا, هاتە مەیدانی پێکهاتەی دەسەڵاتەوە. نەوەکانی ئەو پیاوە بە تایبەتی "ئەتسیز" هەوڵی زۆریان دا بۆ پتەو و سەقامگیرکردنی حکومەتی خوارەزمشاهییەکان و سەرەنجام لەساڵی ٥٩٠ ك دا "تەکەش" ی خوارەزمشا, توغرولی سێهەمی سەلجووقیی تێکشکاندو بە ناردنی سەرە براوەکەی بۆ بەغدا کۆتایی بە تەمەنی زنجیرەی سەلجووقییەکان هێنا کە بە هەوڵ و تێکۆشانی "توغرول" ناوێك دامەزراو بە کوژرانی "توغرول" ناوێك کۆتایی هات.) ((خلعتبری, ١٥-٢٨))

خەلافەتی عەبباسیی لەسەر دابوو. هەر بەو مەبەستەو بۆ هێنانەدی ئەو خەون و خەیاڵە، لە ساڵی ٦١٤ ك دا بە سوپایەکی گەورەو گرانەوە بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ. بەڵام هەر کە لە هەمەدان تێپەڕی و گەیشتە گەردەنەی ئەسەداباد، کەوتە داوی لە ناکاوی بەفرو بارانێکی بە خوڕو زۆربەی سوپاکەی تێدا چوو و ئەوەندەش کە مابوون لە لایەن تورك و کوردە هەکارییەکانەوە ، تاڵان کران. سوڵتان ئەم ڕووداوەی بە جادووی شووم دەزانی و لە ترسی هێرشی مەغۆلەکان (دراوسێ تازەکانی)، خێرا گەڕایەوە بۆ خوراسان.[459]

لەو لاشەو هێزی پشتیوان گەیشتە هێرشبەرانی خاچهەڵگرو بەرەی ئەوانیش هێزو پێزێکی نوێی پەیدا کرد. هەر بۆیە مەلیك عادل ئەیبوبیی لەمیسرە وە هات بۆ شام و فەرەنگییەکانیش دوای چەند شەڕێکی پەرش و بڵاو لە دەوروبەری عەکا، قەڵای قایمی (توور) یان ئابڵوقە دا. لە مەودای ئەو گەمارۆیەدا میر بدرالدین محمد هەکارییەکێ لە سەردارانی گەورەی مەلیك موعەززەم عیسا ئەیبووبیی، شەهید بوو. میر بدرالدین بە درێژایی ماوەی بەشداریی لە شەڕی خاچهەڵگرەکاندا، گەلێك ئازایەتیی و لێهاتوویی نواندو بەردوەام ئارەزووی شەهیدبوون، هەوێنی هەوڵ و بەشدارییەکانی بوو. لە شاری قودس قوتابخانەیەکی بۆ شافیعییەکان دروستکردو مزگەوتێکیشی لە تەنیشت مەزارگەی ئیبراهیم خەلیل دروستکرد. تەرمی پیرۆزی ئەو شەهیدەیان هێنایەوە بۆ بیت المقدس و لەوێ سپاردەی خاکیان کرد.[460]

---

[459] ابن اثير, الكامل, ١٠/ ٣٠٠. آشتياني, تاريخ مفصل ايران,٤٠٢. , Minorsky "kurds,kurdistan" EI,2, V. V ,p , 455.

[460] ابوشامة,الذيل علي الروضتين, ١٠٨. صفدى, ٤/ ٣٥٠-٣٥١. ابن تغرى بردي, ٦/ ٢٢١.

سوپای خاچهەڵگرەکان نەیتوانی قەڵای " توور " بگرێ. ناچار ئەوێیان بە جێ هێشت و هێزکانیان کۆ کردەوەو شاری " دیمیات " یان گەمارۆ دا. موسڵمانەکان بە رێبەرایەتیی مەلیك کامیلی ئەییووبیی سەنگەری بەربەرەکانییان گرت و پارێزگارییان لە شارەکە دەکرد. بەڵام بڵاوبوونەوەی هەواڵی کۆچی دوایی مەلیك عادل لە مانگی جمادی الاخرەی ساڵی ٦١٥ ك دا، باری سوپای موسڵمانانی شڵەژاند.میرعیمادەددین کوڕی مەشتوب هەکاریی کە بەهێزترین فەرماندەی سوپابوو، بەمەبەستی پشتیوانیی لەکوردەکان لەگەڵ سەردارانی دیکەی سوپا لەسەر ئەوە پێکهات کە بە کودەتایەك لەجیاتی مەلیك کامیل، مەلیك فائیز ئەییوبی لەشوێنی مەلیك عادل دابنێن.[٤٦١] مەلیك کامیل کەدەیزانی توانای بەربەرەکانی لەبەرامبەر ئەوی دانییە، بەمەستی ڕۆیشتن بۆیەمەن پاشەکشەی لەدیمیات کرد، و کت وپڕ مەلیك موعەززەمی برای کە لە دیمەشقەوەهاتبوو، گەیشتە جێ. مەلیك موعەززەم چونکە رادەی هێزو دەسەڵاتی ئیبنومەشتووب و کوردە لایەنگرەکانی دەزانی، خۆی لە هەموو چەشنە هەڵوێست و هەنگاوێکی ئەوتۆ پاراست کە ببێتە هۆی دژکردەوەی ئەوان. هەر بۆیە بۆخۆی چوو بۆ خێوەتی ئیبنو مەشتووب و داوای لێکرد وتووێژێکی تایبەت و دوو کەسییان پێکەوە هەبێ. کاتێك لە لەشکر دووری خستەوە، بە بیانووی ئەوە کە مەلیك ئەشرەف لە شام پێویستی پێیەتی، سپاردی بە گرووپێك لە سەربازەکانی و بەرەو شام بەڕێی کرد.[٤٦٢] کودەتاکەی

---

[461] ابن اثیر, الكامل, ٣٠٦/١٠. ابوشامه, الذیل علی الروضتین,١١٦. ابن واصل, ١٦/٤. رانسیسمان, ١٨٩/٣.

[462] ابوشامة, الذیل علی الروضتین, ١١٦. ابن واصل, ١٨/٤. صفدی, ٢٢٦/٧. هه روه ها(نك: ابن اثیر, الكامل, ٣٠٦/١٠.

ئیبنو مەشتووب هەرچەندە بە هۆی گەیشتنی مەلیك موعەززەم لە کاتی شیاودا نەگەیشتە ئاکام، رێگەی بۆ رووخان و لە دەستدانی "دیمیات" خۆش کرد.

دوای مردنی عیزەددین مەسعوود فەرمانڕەوای موسڵ لەو ساڵەدا، نوورەدین ئەرسەلانشا کوڕە منداڵکارەکەی عیزەددین بوو بە جێنشینی باوکی و جڵەوی کاروبارەکانی کەوتە دەستی ئەتابەکەکەی کە ناوی بەدرەددین لوئلو بوو. عیمادەددین زەنگی سێهەم کە لە ساڵی ٦٠٧وە قەڵاکانی عەقرو شووشی لە بندەست دابوو، کەڵکی لەو ئاڵ و گۆڕەی دەسەڵات وەرگرت و قەڵای عیمادییەی داگیر کردو بە یارمەتیی و پشتیوانیی موزەففەرەددین کەوکەبووری فەرمانڕەوای هەولێر توانی هەوڵ و هێرشی لوئلو بۆ ستاندەنەوەی قەڵاکە تێکبشکێنێ و پاشان قەڵاکانی زۆزان و هەکارییەشی خستە بن دەستی خۆی.[٤٦٣]

بەدرەددین لوئلو لەو بارە ناهەموارەدا دەستی داوای یارمەتیی بۆ لای مەلیك ئەشرەف لەشام درێژ کردو داوای لێکرد بە مەبەستی چارە سەری قەیرانەکە، نێوبژیوانیی بکات. بەڵام کەوکەبووریی وەڵامی داوای مەلیك ئەشرەفی نەدایەوە کە نابێ هاوکاریی زەنگی سێهەم بکات. عیمادەددینیش جڵەوی کاروباری عیمادییەی بە موزەففەرەددین سپاردو بۆخۆشی بە مەبەستی دەست بە سەراگرتنی دەوروبەری موسڵ، بەرەو قەڵای عەقری حومەیدییە رۆیشت. لوئلو کەڵکی لەو دەرفەتە وەرگرت و هێرشێکی توندی کردە سەرو زەنگی سێهەمی لە قەڵای عەقری حومەیدییەدا تێکشکاندو راوی نا بۆ هەولێر.

---

[463] ابن اثیر, الکامل, ١٠/٣١٤-٣١٦. ابن واصل,٤/٢٠. صائغ, ١/٢٠١-٢٠٢.

لەو بارودۆخەدا نوێنەرانی خلیفە الناصرو مەلیك ئەشرەف گەیشتنە جێ و هەموویان لە سەر ئاشتەوایی رێککەوتن.[٤٦٤]

ئەو ئاشتییە زۆری نەخایاند. چونکە بە هۆی مردنی ئەرسەلانشای دووهەم هەر لەو ساڵەداو جێگیربوونی ناصرالدین محمود کوڕە منداڵکارەکەی لە سەر تەختی دەسەڵاتی باوکی، عیمادەددین زەنگی سێهەم و کەوکەبووری چاوی تەمایان دەموسڵەوە بڕی و بە تێکشکاندنی سوپای لوئلو ، موسڵیان گەمارۆ دا. بەڵام لە کۆتایی دا ئەو هەوڵەیان یەکلا نەکردەوەو کەوکەبووریی پاشەکشەی کرد.[٤٦٥] لە لایەکی ترە وە کوردەکانی قەڵای کەواشی لە کاتی سپاردنی قەڵای عیمادییە بە زەنگی سێهەم دا، نوێنەرەکانی بدرالدین لوئلو یان لەو قەڵایە دە رکردن و بانگهێشتی زەنگی یان کرد بۆ قەڵاکە. کەوکەبووریش وەڵامی داوای موسڵی نەدایەوە کە داوایان لێکردبوو رێز لە ناوەرۆکی ئاشتینامەکە بگرێ و هەولێ بدا قەڵای کەواشی بداتەوە.[٤٦٦]

ئەو ململانێ و شەڕە لەرادەبەدەرانەو لەشکرکێشی وهێرشە بەرینانە، زەبرو زیانی زۆریان لە کوردەکانی ناوچەکە داو بە هۆی وێرانکردنی زە وییە کشت وکاڵییەکان و نەبوونی هێمنایەتیی لە رێگاکانی هاتوچۆدا، زیانی فراوانیان پێگەیاندن و ژیانی خەڵکیان تووشی قەیرانێکی قووڵ کردو بە راشکاویی و شەهامەتەوە دەشێ بلێین قوربانیی بەراستیی و دۆڕاو و زیانلێکەوتووی سەرەکیی لەو کێشەو کەڵەوەکێشی یانەدا، کوردەکانی ئەو هەرێمە بوون.

---

[464] ابن اثير, الكامل, ٣١٦/١٠-٣١٧. ابن واصل, ٢٢/٤-٢٥. صائغ, ٢٠٢/١.

[465] بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە :(ابن اثير,الكامل, ٣١٧/١٠-٣١٩. ابن عبرى, ٣٢٢-٣٢٣.

[466] ابن اثير, الكامل, ٣١٩/١٠-٣٢٠.

لەونێوەدا لایەنگرانی ئیبنومشتووب هەکاریی کە هاوڕێ لەگەڵ کوردەکانی ژێر فەرمانی خۆی گەیشتبۆ حومات، زیاتر ببوو. چونکەناو و دەنگی دلێریی و جوامێریی ئەو پیاوە لەو ناوچەدا دەنگی دابۆوە. هەر بۆیە کەوتە جموجۆڵ و وەڵامی خواستەکەی مەلیك ئەشرەفیشی نەدایەوە کە داوای لێکردبوو رەگەڵی بکەوێ و بە مەبەستییەکگرتن لەگەڵ مەلیك ئەفزەل نوورەدین فەرمانڕەوای "سومەیسات "،لە دژی مەلیك ئەشرەف، چاوپۆشی لە تاوانەکەی کردو شاری رەئسولعەین ی پێداو هەر لەو کات و بارو دۆخەدا بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی نێوان بدرالدین لوئلو و کەوکەبووریی لە سەر قەڵای کەواشی، بەرەو ناوچەی جەزیرە رۆیشت.[٤٦٧]

هاوکات لەگەڵ وەرێکەونی مەلیك ئەشرەف بەرەو موسڵ، کەوکەبووری دەستی کرد بە لاوازکردنی و میرو فەرماندەکانی بۆ لای خۆی پەلکێش دەکردن و دەیەویست لەم رێگایەوە، بەری پێ بگرێ. ئیبنومەشتووبیش، میر عزالدین محمد کوڕی حومەیدیی کە فەرماندەی کوردە حومەیدییەکان بوو، رەگەڵ خۆی خست و ویستی پێکەوە ببنە بەربەست لە بەردەم مەلیك ئەشرەف. بە گەیشتنی ئەشرەف دیسان زۆربەیان چوونە لای ئەو. بەڵام ئیبنو مەشتوب بە مەبەستی رۆیشتن بۆ هەولێر، بەرەو نووسەیبین کەوتە رێ و لە لایەن فەرمانڕەوای ئەو شارەوە تێکشکێنرا. ناچار رووی کردە شەنگارو هەرچەندە لە لایەن فەرروخشای زەنگی فەرمانڕەوای ئەو دیارەوە بە دیل گیرا، بەڵام ئەویش لەکۆتایی دا هانی دا تا لە دژی مەلیك ئەشرەف شۆرش بکات. ئەویش رازی بوو

---

467 ابن واصل, ٢٩/٤ -٣٠.

و داوای مەلیك ئەشرەف بۆ گێڕانەوەی ئبنومەشتووب لە لایەن فەرپروخشاوە رەت کرایەوەو لە زیندان ئازادی کرد.[٤٦٨]

دوای ئازادبوون ئیبنومەشتووب جارێکی تریش دەسەلاتی پەیدا کردەوە. هەر بۆیە لە دەوروبەری موسڵ کەوتە جموجۆل و کاتێك هێرشی کردە سەر تەلەعفەر،[٤٦٩] بدرلدین لوئلو شکستی پێ هێناو دوای چەند شەرێکی پەرش و بلاو لوئلو داوای ئاشتەوایی کردو بەڵینی دا کە پارێزراو بێ و ئاپۆرەی جەماوەر بە گەرمیی پێشوازی یان لێکرد. بەلام دوای ماوەیەك لوئلو خیانەتی پێ کردو بەندی کردو مەلیك ئەشرەف ی لە رووداوەکە ئاگادار کردەوەو ئەویش بە بیستنی سەرکوتکردنی کەسێکی ئاوا مەترسیدار، زۆر دڵخۆش بوو.[٤٧٠]

مەلیك ئەشرەف دوای کپ کردنی هەڵلاو هەنگامەی ئیبنومەشتووب، رۆیشت بۆ شەنگارو فەرمانڕەوای ئەو شارەش لە ئەشرەف دەترسا بە هۆی ئەوە کە ئیبنو مەشتووب ی حەواندبۆوە، داوای کرد شارەکە لەگەڵ "رەققە"دا بگۆڕێتەوە. مەلیك ئەشرەف داواکارییەکەی پەسند کردو لە مانگی جمادی الاخرەیساڵی ٦١٧ ك دا هاتە ناو شەنگارەوەو کۆتایی بە دەسەلاتی زەنگییەکان هێنا لەو شارەدا.[٤٧١]

دوای گرتنی شەنگار مەلیك ئەشرەف لە جمادی الاولی ئەو ساڵەدا، هاتە ناو موسڵ. هاتنی ئەشرەف بۆ موسڵ رۆژێکی لەبیرنەکراو بوو. نوێنەرانی خەلیفە

---

468 ابن اثیر, الکامل, ١٠/ ٣٢٠-٣٢١. ابن واصل, ٤/ ٧١-٧٢. شمیساني, مدینة سنجار..., ١٥٧.

469 ( تەلەعفەر قەلایەکە لە نێوان موسڵ و شەنگار و بەروبوومی خورمای زۆرەو هەناردەی موسڵ دەکرێ.) ((معجم البلدان ٢/ ٤٦ ))

470 ابن اثیر, الکامل, ١٠/٣٢١. ابن خلکان, ١/ ١٨٠-١٨٢. ابن واصل, ٤/٧٢. یونیني, ٢/ ٢٢٦.

471 ابن ثیر, الکامل, ١٠/٣٢٢. ابوشامة , الذیل علی الروضین, ١٢٢. ابن واصل, ٢/٧٣-٧٤. ابوالفداء, ١٣١٣.

الناصر لدين الله و موزەففەرەددین کەوکەبووریی لەوێ هاتنە چاوپێکەوتنی و لە مەڕ ئەو قەڵایانەی کە چەندین ساڵ بوو کێشەیان لە سەر بوو، وتووێژیان کردو رێك کەوتن. ئەشرەف دواتر بۆ تێپەڕکردنی کاتی زستانەی گەڕایەوە بۆ شەنگار.[٤٧٢]

مەلیك ئەشرەف دوابەدوای ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی شەنگارو سەقامگیر کردنی دەسەڵاتەکەی لەو شارەدا، لە بیری تۆڵەسەندنەوە لە رکابەرەکانی دابوو. هەر بۆیە یەکێك لە هاوکارە نزیکەکانی خۆی کە ناوی حاجب عەلی موسڵیی بوو، نارده موسڵ بۆ راگواستنی ئیبنو مەشتووب و حیسامەددین عیسای کوڕی خوشتەرین هەکاریی بردیانن بۆ حەڕڕان[٤٧٣] و لەوێ لە چاڵی تاریك دا بەندیان کردن.

ئیبنو خەلەکان دەڵێ: "ئەو کاتە من منداڵ بووم و هەواڵی دژوارو نالەباری ئەوانم لە ناو زیندان، لە گەورەکان دەبیست".[٤٧٤] ئیبنو مەشتووب دوو ساڵ لە بەرامبەر باری نالەبارو پڕکوێرەوەریی بەندیخانە تاریکەکەدا خۆی راگرت و پاشان لە ساڵی ٦١٩ ك دا پەردەی ژیانی دادایەوەو بەرەو مردن گەڕایەوە. کچەکەی تەرمەکەی گواستەوە بۆ رەئسولعەین و لەوێ لەو گۆڕەدا سپاردەی خاکی کرد کە بۆی ئامادە کردبوو.[٤٧٥] ئیبنومەشتووب قوتابخانەیەکی لە

---

[472] صائغ, ١/ ٢٠٥-٢٠٦. بۆزانینی درێژەی ئەم باسە بڕوانە نك:( ابن اثير, الكامل, ١٠/ ٣٢٢-٣٢٣. ابن واصل, ٤/ ٧٥-٧٦.

[473] ابن واصل, ٤/٧٦.

[474] وفيات الاعيان, ١/١٨٢.

[475] ابن اثير, الكامل, ١٠/٣٢١. ابن خلكان,١/ ١٨٠-١٨٢. ابن واصل, ٤/٧٦. صفدى, ٧/ ٢٢٥-٢٢٦.

ڕەئسولعەین دروست کردبوو کە بە ناوی خۆی نێوبانگی دەرکرد.[٤٧٦] دۆڕاندن و گیرانی دیمیات بە هۆی ئەو کوودەتایەی مەشتووب دژی مەلیك کامیل کردبووی،

چالاکییەکانی تریشی خستە ژێر چاودێریی کردنەوەو زۆربەی دیرۆکنووسان پێیان وایە کە مەرگی ناوبراو بەو حالە تالەوە لەو چالەدا، تۆڵەو سزای خودا بوو لەو هەلوێست و کوودەتایەی ئیبنومەشتووب.[٤٧٧]

توندوتیژیی و هەلوێستی دلڕەقانەی عیمادەددین زەنگی سێهەم دژی کوردەکانی قەڵاکانی هەکارییەو زۆزان ئاکامەکەی ئەوە بوو کە ئەوان لەساڵی ٦١٨ ك دا قەڵاکانیان سپاردە دەستی نوێنەرانی بدرالدین لوئلو .بەدرەددینیش دادپەروەرانە هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکردن و کۆتایی بە ڕێوشوێنی ستەمکارانەی زەنگیی هێنا.[٤٧٨] کوردەکانی جەزیرە هێشتا پشتی چەماوە یان لە ژێر باری گرانی هێرش و تالانی دەسەلاتەکانی ناوچەو ململانێ و پێکدادانی نێوانیان راست نەکردبۆوە کە هەواڵی هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان شەپۆلێکی ترس و دلەڕاوکێی بە سەر هەرێمەکەدا زاڵ کرد. ئەو نەتەوە خوێنرێژە کە بە هۆی سەرەڕۆیی و بێ راوێژیی محمد خوارەزمشا– و بە قسەی هێندێکان بە بانگهێشتی خەلیفە ناسر[٤٧٩]– بەرەو رۆژئاوا هاتبوون، دوای هێرش و وەڕێخستنی لافاوی مەرگ بۆ سەر خوراسان و پێشڕەویی لە ناو ئێران داو کۆمەلکوژیی گورجییەکان، لە ساڵی ٦١٨ ك دا شاری مەراغەیان قەتلۆعام کردو

---

[476] یونینی, ٦٦٣/٢.

[477] بۆ نموونە بڕوانە نك: ( ابن اثیر, الکامل, ٣٢١/١٠. ابن واصل, ٧٦/٤. ابن کثیر, ٩٧/١٣-٩٨).

[478] ابن اثیر,الکامل, ٣٢٢/١٠-٣٢٤. صائغ, ٢٠٦/١.

[479] ابن اثیر,الکامل, ٤٠٠/١٠.

لەوێوە بەرەو هەولێر وەڕێ کەوتن. بە پێی قسەی ئیبنو ئەسیر کە لەو کاتەدا بۆخۆی لە موسڵ بوو، "شەپۆلی ترس سەرانسەری شاری گرتەوە. موزەففەرەددین کەوکەبووریی و بەدرەددین لوئلو ناکۆکییەکانی پێشوویان وەلاناو سوپایەك بە سەرپەرستیی و فەرماندەیی کەکەبووریی بۆ رووبەڕووبوونەوەیان تەیارو ئامادە کراو لە سەر پێشنیاری خەلیفە لە دەقووقا سەنگەری گرت. هەرچەندە مەغۆلەکان بە بیستنی ئەو هەواڵە لە هێرشەکەیان پاشگەز بوونەوە، بە هۆی ئەوە کەس وەدوایان نەکەوتبوو، لە شوێنی خۆیان مانەوەو سوپاییەککگرتوو و دامەزراویش لە دەقووقا چونکە هیچ هێرشێك نەکرا، پەرتەوازە بوون و بڵاوەیان کرد".[٤٨٠]

لەو ساڵەدا کاتێك گورجییەکان داوای پشتیوانییان لە مەلیك ئەشرەف کرد لە بەرامبەر هێرشی مەغۆلەکان دا، بە هۆی ئەوە کە بۆخۆی خەریکی کۆکردنەوەی سوپا بوو بۆ یارمەتیدانیی براکەی لە دیمیات، شاری میافارقین ی بە مەلیك موزەففەر شەهابەددین ی برای سپارد، بۆ ئەوەی بۆخۆی لەگەڵ گورجییەکان وتووێژ بکات.[٤٨١]

لە ساڵی ٦١٩ ك دا عیمادەددین زەنگیی بە مەبەستی دەستەبەرکردنی پشتیوانیی ئوزبەك کوڕی پاڵەوان، رۆیشت بۆ ئازەربایجان. بەدرەددین لوئلو ئەو سەفەرەی بە دەرفەت زانی و قەڵای بەرزی شووش ی گەمارۆ دا. سەرەنجام کوردەکانی ئەو قەڵایە لە بەرامبەر چەند دەسکەوت و ئیمتیازێك دا قەڵاکەیان بە دەستەوە دا.[٤٨٢]

---

[480] همو, ١٠/٣٤٧-٣٤٩..

[481] همو, ١٠/٣٤٦-٣٦٥. ابن واصل, ٤/٩٠.

[482] ابن اثیر,الکامل, ١٠/٣٧٦. ابن واصل, ٤/١١٥. صائغ,١/١٠٨.

دوای مردنی محمد خوارەزمشا لە ساڵی ٦١٨ ك دا، جلال الدین ی کوڕی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی باوکی دانیشت و بە هۆی ئەوە دوای چەندین جار ڕووبەڕووبوونەوەی مەغۆلەکان، بەرەو هیندستان هەڵات، غیاث الدین تیرشای برای، ئیسفەهان و ڕەی و فارس و وڵاتی جیبالی گرت و خۆی بۆ هێرشکردنە سەر بەغدا تەیار کرد. خەلیفە الناصریش لە ساڵی ٦٢٠ ك دا خەڵکێکی زۆری لە هەولێرو شارەکانی تری هەرێمی جەزیرە کۆ کردەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ناوبراو. بەرلە دەستپێکردنی هێرشەکەو هەڵگیرسانی شەڕو بەگژیەکداچوون، خەلیفە داوای لە تیرشا کرد واز لەو بڕیارە بێنێ و ئەویش داواکەی پەسند کردو هێرشی نەکرد.[٤٨٣] کوردەکان کە پێکهاتەی بەشێکی گەورەی سوپای خەلیفە بوون بە گەڕانەوەی غیاث الدین لە مەترسی گەورە ڕزگار بوون. چونکە هەر لەو ساڵەدا بە هۆی هێرشی لافاوی کوللە بۆ سەر جەزیرەو شام، زۆربەی بەروبوومی کشتوکاڵیی ئەو ناوچانە لە ناو چوو[٤٨٤] و ئەگەر تیرشا لەو تەنگانەیەدا هێرشی کردبا، کارەساتێکی ئینسانی گەورەی لێ دەکەوتەوە.

کاتێك سوپای موسڵ چوونە پاڵ لەشکری ئەشرەف لە خەلات، موزەففەرەددین کەوکەبووریی لە ساڵی ٦٢١ ك دا، هێرشی کردە سەر ئەو شارە. کاریگەریی نەرێنیی فەوتانی بەروبوومی کشتوکاڵیی لە ساڵی ڕابردوو دا لەو ناوچەیە، هیوای سەرکەوتنی موزەففەرەددینی زیاتر کردبوو. بەڵام بەربەرەکانی توندی لوئلو لە شارداو بڵاوبوونەوەی هەواڵی زاڵبوونی مەلیك ئەشرەف بە سەر خەلات دا، کەوکەبووری یان ناچار کرد پاشەکشە بکات.[٤٨٥]

483 نسوی, ١٠٥.

484 ابن اثیر,الكامل, ٣٨٢/١٠. ابن واصل, ١٣٣/٤.

485 ابن اثیر, الكامل, ٣٨٦/١٠-٣٨٧.

ناکۆکیی نێوخۆیی فەرمانڕەواکانی جەزیرەو هێرشی هێرشبەرانی بێگانە وەك تیرشاو مەغۆلەکان، فرە زەبری لە کوردەکان دابوو. هەر لەو کاتەدا دەنگی زەنگی مەرگێکی تریش لە ساڵی ٦٢٢ ك دا لە تێکڕای دەڤەری جەزیرە دەنگی دایەوە. جلال الدین خوارەزمشا دوای گەڕانەوە لە هیندو گرتنی فارس و خوزستان، سوپای هێنایە سەر بەعقووبەو دوای تاڵان و بڕۆی بێ بەزەییانەی ئەو دەورویەرە، نیازی هەولێری کەوتە سەر. بەڵام سەرەنجام لەگەڵ کەوکەبووریی پێکهاتن و ڕۆیشت بۆ تەورێز.[٤٨٦]

ململانێ و کەڵەوەکێشیی مەلیك ئەشرەف لەگەڵ مەلیك موزەففەری برای لە سەر خەلات و هێرشی بێ ئاکامی کەوکەبووری بۆ سەر موسڵ، دەرووی بۆ بەشێك لە کوردەکانی ئەو دەورویەرە کردەوە لە قەڵای عیمادییەو "هەروز"، شۆرش بکەن و لە ساڵی ٦٢٢ ك دا پیاوەکانی بدرالدین لوئلوئیان دەرکرد. بەڵام لوئلو به سوپایەکی گەورەو گرانەوە هێرشی بۆ بردنەوەو قەڵاکانی گرتەوەو شۆرشەکەی کپ کرد.[٤٨٧]

کارەساتە سروشتییەکانیش لەوبارە هەستیارەدا کە هەرێمی جەزیرە لە قەیرانی ناتەبایی نێوخۆی و هێرشی نەیارانی نامۆدا گیری کردبوو، نێوەنێوە سەرێکیان بە ناوچەدا دەکردو ئاڵقەی زنجیری ئەو قەیران و وێرانییەیان تەنگتر دەکردەوە. ئیبنو ئەسیر کە بۆخۆی شایەتحاڵی ئەو ڕووداوانە بوو لەو ساڵانەدا، باسی نەبوونیی و قات و قڕیی تاقەت پڕووکێنی ناوچەکانی موسڵ و جەزیرە دەکا لە ساڵی ٦٢٢ ك داو دەڵێ خەڵك ناچار بوون گۆشتی سەگ و پشیلەیان دەخواردو ئەو کارەساتەش بوو بە هۆی ئەوە کە ئەو جۆرە گیانلەبەرانەش لە

---

486 همو, ١٠/٣٨٨-٣٩٠. همدانی, ١/٣٩٣-٣٩٤.

487 ابن اثیر, الکامل, ١٠/٤٠٣-٤٠٥. صائغ, ١/٢٠٨-٢٠٩.

ناوچەکەدا کەم ببنەوە.[٤٨٨] ئەو مێژوونووسە لە درێژەی باسی رووداوەکانی ئەو ساڵەدا ئاماژە بە وێران بوونی قەڵاکانی زەعفەران و جودە یدە دەکا کە دوو قەڵای گرینگی کوردەکانی ئەو هەرێمە بوون، بەڵام باسی هۆکاری وێران بوونیان ناکات.[٤٨٩]

موزەففەرەددین کەوکەبووریی لە شەعبانی ساڵی ٦٢٣ ک دا لەگەڵ جلال الدین خوارەزمشاو مەلیك موعەززەم فەرمانڕەوای دیمەشق و مەلیك مەسعوود فەرمانڕەوای ئامێد، لە دژی مەلیك ئەشرەف یەکیان گرت. هەرچەندە بە هۆی گەڕانەوەی جلال الدین بۆ کرمان ئەو هاوپەیمانییە هەڵوەشا، بەڵام کەوکەبووریی هێرشی کردە سەر موسڵ و بە بێ گەیشتن بە ئەنجامێك گەڕایەوە بۆ هەولێر. دەوروبەری موسڵ و ماردین کە ساڵی پێشوو بە هۆی قات و قڕیی ونەبوونیی چۆڵ کرابوون، لە ژێر تەوژمی ئەو هێرشانەدا زیاتر کاول بوون.[٤٩٠]
دوای ئەوە کەمەلیك مەسعوود پاڵی دا بە نەیارانی ئەشرەفەوەو رۆیشتە ناو هاوپەیمانییەکەیانەوە، ئەشرەف داوای لە علا الدین کەیقوبادی سەلجووقیی کرد هێرش بکاتە سەر شارەکەی. بە پێشڤەچوونی علا الدین لە سنوورەکانی ئامێد، مەلیك مەسعوود قاسیدێکی ناردە لای مەلیك ئەشرەف و گوێڕایەڵیی و پەیڕەویی دووبارەی خۆی پێڕاگەیاند. هەر بۆیە ئەشرەف داوای لە کەیقوباد کرد کە زیاتر پێشڕەویی نەکا، بەڵام ئەو رازی نەبوو. مەلیك ئەشرەف کە بۆخۆی لە ڕێی دیمەشق دابوو، پاشماوەی سوپاکەی کە لە جەزیرە بوو، نارد

488 الکامل, ١٠/ ٤٠٥.
489 همان, ١٠/٤٠٧.
490 ابن اثیر, الکامل, ١٠/ ٤١٠-٤١١. طقوش, ٣٠٩.

بۆ پشتیوانیی مەسعوودو بە پاڵپشتییەکتر توانیان پاشەکشە بە کەیقوباد بکەن.[٤٩١]

سەرەڕای هێرشەکانی خوارەزمشاو مەغۆڵەکان بۆ سەر ناوچەکانی دراوسێی جەزیرە وەك ناوچەکانی ویلایەتی جیبال و... لەو ساڵانەدا، فەرمانڕەواکانی جەزیرە نەك هەر هەستیان بە مەترسیی نەکرد، بەڵکو بەردەوام شاڵاویان بۆ یەکتر دەبرد. هەر لەو هەڵاّو هەنگامەداو بە کوژرانی معزالدین محمود فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبنوعومەر لە ساڵی ٦٢٤ ك دا ژمارەیەکی زۆری کوردەکانی دیاربەکر هێرشیان کردە سەر ئەو شارە. بەڵام خەڵکی دەوروبەری شار بەربەرەکانییەکی توندیان لە بەرامبەریان دا کردو بەرگریکاران توانیان شاڵاوەکانیان تێکبشکێنن و وێڕای تاڵان و گرتنی تێکڕای دارایی و کەرەسەکانیان، ژمارەیەکی زۆرو بەرچاویشیان لێ کوشتن.[٤٩٢]

دوای کوشت وبڕو کۆمەڵکوژی بێبەزەییانەی خەڵکی دەوروبەری خەلات بە دەستی جلال الدین لە ساڵی ٦٢٥ ك دا، شەپۆلی ترس و نیگەرانی جەزیرەی ئیبنوعومەری گرتەوەو بەشێکی خەڵك بەرەو شام رایان کردو بەڵام سەرەنجام بارینی بەفرێکی زۆر، جلال الدین ی ناچار کرد لەو شوێنە پاشەکشە بکات.[٤٩٣]

دوابەدوای کوشتاری دڕندانەی دووبارەی جلال الدین خوارەزمشا لە شاری خەلات لە ساڵی ٦٢٥ ك دا، ساڵێك دواتر علا الدین کەیقوباد سەلجووقیی و مەلیك ئەشرەف دژی ئەو یەکیان گرت. رێبەرایەتیی و فەرماندەی هێزی سەربازیی مەلیك ئەشرەف لە سەر شانی عزالدین عومەری کوڕی عەلی هەکاریی

---

491 ابن اثير, الكامل, ١٠/٤١٤-٤١٥. زەکی بەگ, خلاصة تاريخ الكرد..., ١٥٨-١٥٩.

492 ابن اثير,الكامل, ١٠/٤٢٧. غندور,١٥٧.

493 ابن اثير,الكامل, ١٠/٤٣٢-٤٣٣.

بوو کە فەرماندەیەکی بوێرو مێرخاس و بە ناو و دەنگ بوو. جلال الدین لە خۆی رانەدەدی لە بەرامبەر هێرشی ئەودا خۆ بگرێ و سەرشۆڕانەو بە شێوەیەکی خراپ لە گۆڕەپانی شەڕ رایکردو پاشەکشەی کرد بۆ ئازەربایجان.[٤٩٤]

مەغۆلەکان کاتێك گوێبیستی هەواڵی شکستی جلال الدین بوون لە بەردەم عزالدین عومەر هەکاریی لە ساڵی ٦٢٨ ك دا، خێرا هێرشیان بردە سەر ئازەربایجان. ئەویش چونکە توانای بەرگریی نەبوو، بە لەشێکی داهێزاو و بێ هێزەوە رووی کردە خەلات —ئەو شوێنەی کە بە کۆمەڵ خەڵکەکەی کوشت و سووکایەتییان بە ژنەکانیان کرد — و کاتێك زانی مەغۆلەکان بە دوایەوەن، بەرەو ئامێد لایدا. شەو لە کاتێکدا کە سەرخۆش بوو و دونیا وێران و دوژمن لە پاش و پێشی بوو،[٤٩٥] مەغۆلەکان شالاویان بۆ هێناو بە دژوارییی توانی لە دەستیان رابکاو کوردەکانی ناوچەکەو خەڵکی تریش بە تۆڵەی رەفتارە دڕندانەکانی و کوشت و کوشتارەکانی، سوپاکەیان تالاَن کرد.[٤٩٦]

دوای ئەو رووداوانە جلال الدین بە تاقی تەنیاو بە هیوای خۆپەنادان لە پەنای مەلیك موزەففەر شەهابەددین غازی، فەرمانڕەوای میافارقین، رووی کردە ئەو

[494] ابن اثیر,الکامل, ١٠/ ٤٤٠-٤٤١. زەکی بەگ, خلاصه تاریخ الکرد..., ١٦١.

[495] نوورەدینی مونشی چەند هەڵبەستێکی سەبارەت بە سەرخۆشیی جلال الدین لە کاتیکی ئاوا ناسك دا,هەڵبەستووە, کە ئەمە واتاکەیانە:

ئەی شا میخۆرەوەکان چیان لـە دەست دێ — سەرخۆشیی بە بێ سنوور چی پێدەکرێ

شا مەست و دنیا وێران و دوژمن لە بەرودوا — روونـە کـە بەم حاڵـــە چ روو دەدا

نك: مستوفی, تاریخ گزیده, ٥٠٢-٥٠٣.

[496] ابن اثیر,الکامل, ١٠/٤٤٧-٤٤٨. بۆ شارەزای باسەکە بە درێژیی بڕوانە: (نك: نسوی, ٢٧٠-٢٧٦).

شارە. بەڵام لە ڕێگەدا کوردەکان دەستگیریان کردو ئەویش بە لێنی بە فەرماندەی کوردەکان دا ئەگەر بێت و لەو هەڵدێرگەی نەمانە رزگاری بکات، دەیکاتە فەرمانڕەواییەکێك لە شارەکانی خۆی! ! ئەو کوردەش قبووڵی کردو بردیەوە بۆ ماڵەوەو بۆخۆشی بە مەبەستی هێنانەوەی ئەسپەکانی بەرەو چیا ڕۆیشت. لەو نێوەدا کوردێکی دڵ پڕ لە قین و داخ لەدڵ، هاتە ماڵەکەیان و بە هاوسەری ئەو پیاوەی گوت بۆچی ئەو خوارەزمییە ناکوژی؟ ئەویش لە وەڵام دا گوتی ئەوە سوڵتانەو مێردەکەم پەنای داوە. ئەو پیاوەش گوتی برایەکم هەبوو زۆر لەو باشتر بوو و بە دەستی ئەو کوژرا. هەر بۆیە بەو نێزەی لە دەستی دابوو، جەلالەددینی کوشت.[٤٩٧]

سەرانسەری تەمەنی دەساڵەی (٦١٨-٦٢٨) دەسەڵاتی دەوڵەتی جلال الدین خوارەزمشا پڕ بوو لە شەڕ و راونان و راکردن و ئەو دە ساڵ لەشکرکێشیی و شەڕو کوشتارە، لە وێرانیی و پەلکێش کردنی مەغۆلەکان بۆ زۆر ناوچەی ئەوتۆ کە دەکرا نەکەونە دەستی ئەوانەوەو لە وەیشوومەی شەڕو شاڵاوەکانیان پارێزراو بن، ئاکامێکی دیکەی نەبوو. جلال الدین سەرەڕای ئەوە کە لە دژی مەغۆلەکان لە شەڕدابوو، ئەوەندە ستەمکارو دوور لە دادگەریی بوو کە لە کاتی تەنگانەدا، هیچ کەس فریای نەکەوت. ئەو دەیتوانی لە پەنای چیاو گردو لووتکە هەڵەمووتەکان و لە ناو دۆڵە قووڵەکانی ناوچەکانی جیبال و جەزیرەو لە سایەی یارمەتیی و پشتیوانیی کوردەکانی ئەو دەڤەرە، هەڵکوتێتەسەر مەغۆلەکان وئەوچیاو شیو ونشێوانە بکاتە گۆڕستانی مەغۆلەکان.

---

497 نسوی, ٢٧٩. ابن واصل, ٣٣٢/٤. مستوفی, تاریخ گزیده, ٥٠٣. ذهبی, العبرفی..., ١١٤/٥. قس: جوینی, ١١٣/٢-١١٤.

**بەڵام نەك هەر وای نەکرد بەڵکو بۆخۆشی دەستی کرد بە کوشتاری دژوارو نالەباری کوردەکان و بە دوای خۆیدا مەغۆلەکانیشی هێنایە سەر ئەو ناوچانەو سەرەنجام و لەکۆتایی دا ناچار بوو بەوپەڕی پەستیی و زەبوونیی داوای یارمەتی و پەنایان لێبکا! بەڵام بلێسەی گڕی تۆڵەی کوردەکان هەڵیلووشی و لەنێو دارو پەردووی کوشت وبڕو کۆمەڵکوژییەکانی دا بوو بە خۆڵەمێش.[٤٩٨]**

**مەغۆلەکان دوای کۆتایی هێنان بە کاری جلال الدین، بوونە سێ دەستە: دەستەیەکیان بۆ یەکەم جار لە فورات پەڕینەوەو دەوروبەری ئامێدو میافارقین یان تاڵان کردو دوای رەشەکوژیی و کۆمەڵکوژیی خەڵکی ئەسعردو تەنزە، گەیشتنە ناوچەی قورەیشییە کە دەڤەرێکی سەوزو دڵگیرو لە هەمان کات دا رێگاکەی تووش و دژوار بوو و تیرەیەکی کوردەکان هەر بەناوی قورەیشییە، لەوێ دەژیان. ئەو کوردانە ئازایانە لەمەغۆلەکان راپەڕین و بەربینگیان پیگرتن و دوای شەڕێکی سەخت، توانیان ببنە بەربەست لە بەردەم پێشڕەوییان دا.[٤٩٩]**

---

[498] سەیر ئەوەیە کە نووسەری کتێبی **سیری در تاریخ سیاسی کردو کردهای قم** کە لە راستیدا زۆربەی کتێبەکەی لاساکردنەوەی کتێبەکانی تر ە, لە کاتێك دا هەوڵی داوە بە پێی کەش و بارودۆخی ئەمڕۆ, بەرحەق بوونی ئەو کوردانە لە رێگەی گێڕانەوە و باسکردنی رۆڵی ئەوان لە مێژووی ئێران دا بسەلمێنیٚ, خۆی لە حاند بارودۆخی سەردەمی خوارەزمشاهییەکان گێل دەکاو لەو پەڕی بانەکەوە دەکەوێتە خوارەوەو بە تێڕوانین و بیرکردنەوەی ئەمڕۆیی سەبارەت بەو کاتە داوەریی دەکاو وێڕای ئەوە کە بەرگریی جەلالەددین بە بەرگرییەکی **پیاوانە** (!) باس دەکا, خەم و پەژارە دەخوا بە هۆی ئەوە کە بە دەستی ئەو کوردانە کوژراوە کە نووسەر بە لای خۆیەوە لە هەوڵی سەلماندنی مافەکانیان دایەو بەرگریی ئەو کوردانە لە بەرامبەر دوژمنێکی خوێنرێژی وەك جەلالەددین دا بە خەمهێنەر دەزانیٚ! نۆش کردنی شەرابی ئیدئۆلۆژیی لە مەیدانی داوەریی و قەزاوەت و هەڵسەنگاندنی رووداوەکان دا, جویٚ لە زیادکردنی ئەو نەخۆشیی و ئازارانە, ئاکامێکی دیکەی نابیٚ.) ((محمدی ٥٣))

[499] ابن واصل, ٣٢٦/٤ -٣٢٨.

مەغۆلەکانیش کاتێك دەرۆستی کوردەکان نەهاتن و لە بەرامبەر بەرگریی ئازایانەیاندا چیان پێنەکرا، ئاراستەی رێگای پێشڤەچوونی خۆیان گۆڕی و شاری ماردین یان تالآن کردو خەڵکی شارو دەوروبەرەکەی پەنایان برد بۆ قەڵا گەورەکەی شار. لە درێژەی ئەو هێرشەیان دا شالآویان بردە سەر نوسەیبین و خەڵکی شارەکە خۆیان پەناداو دەروازەکانیان داخستن و مەغۆلەکان ناچار بەرەو شەنگار وەڕێکەوتن و دوای تالآنکردنی ئەو ناوچانە، هەڵیانکوتایە سەر دەوروبەری ئامێدو ئاوەدانییەکانی سەر رێیی خۆیان بە تەواویی خاپوور کردن.[500]

گروپێکی دیکەی مەغۆلەکان لە ئازەربایجانەوە هێرشیان کردە سەر هەولێرو لە درێژەی رێگایان بەرەو ئەو شارەدا ژمارەیەکی زۆری کوردەکانیان بە کۆمەڵ کوشت وبڕ کردو دەوروبەری هەولێریان لە ژێر سمی ئەسپەکان و بە زەبری شمشێرەکانیان لەگەڵ زەوی تەخت کرد. موزەففەرەددین کەوکەبووریی بە پشتیوانی بەدرەددین لوئلو خۆی بۆ بەرگریی ئامادە کرد. بەڵام مەغۆلەکان هێرشیان نەکردە سەر شارەکەو گەڕانەوە.[501]

کاتێك بەرەبەرە هەڕەشەو مەترسیی مەغۆلەکان زیاتر دەبوو، خەلیفە المستنصر بالله هاوپەیمانەکانی بانگهێشت کردو لە ساڵی ٦٢٩ ك دا مەلیك کامیل فەرمانڕەوای میسر بۆ وەڵامدانەوەی خەلیفە، میسری بەجێهێشت و بەرەو جەزیرە رۆیشت و کاتێك گوێ بیستی هەواڵی پاشەکشەی مەغۆلەکان بوو، وای بە باش زانی لە جیاتی شوێن هەڵگرتنی ئەوان، کۆتایی بە ستەمکارییەکانی مەسعوود فەرمانڕەوای ئامێد بێنێ و رێگە بگرێ لە

500 ابن اثیر,الکامل, ١٠/٤٤٨-٤٤٩. ابن خلدون, ٣٢٨/٥.

501 ابن اثیر,الکامل, ١٠/٤٥٠. ابن واصل, ٣٢٨/٤. آشتیاني , تاریخ مغول, ١٤٣.

دەستدرێژییەکانی بۆ سەر هەرێمی تایبەتی ئامێدییەکان. هەر بەو مەبەستە لە ساڵی ٦٣٠ ك دا هێرشی بۆ کردو شارەکەی لە دەست دەرێناو بەم هەڵمەت و هەڵوێستە، کۆتایی بە دەسەڵاتی ئۆرتوقییەکان هێنا کە لە سەردەمی رزگارکردنی شارەکە لە لایەن سەلاحەددینەوە بۆ فەرمانڕەوای ئەو ناوچە دیاری کرابوون.[٥٠٢]

هێشتا تەمی ترسی هێرش و پەلاماری مەرگهێنی مەغۆلەکان لە سەر هەولێر نەڕەوییبۆوە کە بە مردنی موزەففەرەددین کەوکەبووریی فەرمانڕەوای ئەو شارە، بارودۆخەکە زیاتریش شلەژاو ئالۆزتر بوو. ئەو بە هۆی ئەوە کە هیچ وەچەی لە پاش بەجێ نەدەما، وەسیەتی کربوو دوای نەمانی خۆی شاری هەولێرو دەوروبەرەکەی بدرێتەوە بە خەلیفە المستنصر. کەوکەبووریی فەرمانڕەوایەکی بە ئیمان و رەوشت جوان بوو و لەماوەی دەسەڵاتی خۆی دا (٥٨٦–٦٣٠) چەندین پرۆژەی خزمەتگوزاری ئەنجام دابوو. وەك دروستکردنی نەخۆشخانە، قوتابخانە، تەکیە، خانەی هەتیوان و ..... لە هەولێرو هەولّی دا شارەکە بکاتە ناوەندێکی سەرنجڕاکێشی ئەوتۆ کە ئەدیب و زاناکان و ... رووی تێبکەن. لە ژێر کاریگەریی ئەو هەوڵانەدا ئاستی فەرهەنگیی و زانیاریی هەولێر گەشەی کردو لە هەموو لایەکەوە بیرمەندو زانایان روویان تێدەکرد.[٥٠٣] بە مردنی کەوکەبووریی تەمەنی بنەماڵەی بەنی بوگتگین کۆتایی هات. ئەو بنەماڵە لە ماوەی دەسەڵاتی نزیك بە یەك سەدەی خۆیان دا وەك زنجیرەی بەرەبابێك دەرنەکەوتن. بەڵام لە هەرێمی جوگرافی سیاسی ناوچەکەدا خاوەن دەسەڵاتێکی باڵا بوون.

---

502 ابن فوطی, ٢٧. ابن عبری, ٣٤٥. ابوالفداء,١٥٩/٣. ابن تغری بردی, ٢٧٨/٦-٢٨٠.

503 ابن خلکان, ١١٤/٤-١٢٠. ذهبی, العبر فی خبر من غبر, ١٢١/٥-١٢٢. عبارە, ١٢.

کاتێك هەواڵی مردنی کەوکەبووریی گەیشتە بەغدا، خەلیفە سوپایەکی زۆری بە سەرپەرستی سێ کەس لە فەرماندەکانی خۆی بەرەو هەولێر وەرێخست. دوو سەرداری سەر بە کەوکەبووریی رازی نەبوون شارەکەیان بدەنە دە ست و پێبەمل نەبوون. هەر بۆیە سوپای خەلیفە شارەکەی گەمارۆ داو دوای چەند شەرێکی پەرش و بڵاو و کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە سوپای هەردوولا، سەرەنجام دەستی بە سەر شارەکەدا گرت. سەربازانی سوپای خەلیفە کەوتنە تاڵان و بڕۆی شارو ماڵی خەڵکیان بە تاڵان برد. فەرماندەکانی خەلیفە هەواڵی ئەو رووداوانەیان بە کۆتری نامەبەردا بۆ خەلیفە نارد. خەلیفەش لە خۆشیان لە بەغدا جەژن و ئاهەنگی بەرپا کردو بەو بۆنەوە بەندییەکانی ئازاد کردو شاعیرەکان هاتنە بارەگاکەی و هەڵبەستیان بۆ پەسنی ئەم سەرکەوتنە هەڵبەست.[٥٠٤]

بە هۆی شەڕی نێوخۆیی فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانی جەزیرەو شام و میسر، مەغۆلەکان هەستیان بە هیچ مەترسییەکیان نەدەکردن و بە ئارخەیانیی دوای گرتنی گەنجەو هێرش بۆ سەر ئەرمەنستان، لە ساڵی ٦٣٣ ك دا بە مەبەستی گرتنی موسڵ سوپایان هێنایە سەر هەولێرو لە ژێر زەبری بەربەرەکانیی لێبڕاوانەی کوردەکان دا ناچار بوون واز لەوێ بێنن و هەڵیانکوتایە سەر دەوروبەری موسڵ و بە داسووی مەرگ کوردەکانی ئەو ناوەیان دروێنە کرد. خەلیفە لە ژێر فەرماندە یی قەشتەموور دا سوپایەکی نارد بۆ رووبەڕووبوونەوە یان، بەڵام دوای گەڕانەوەی مەغۆلەکان، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ بەغدا.[٥٠٥]

---

[504] ابن فوطی, ٤٤ -٤٧.

[505] ابن فوطی, ٤٧. ابن عبری, ٣٤٥. آشتیانی, تاریخ مغول, ١٤٥.

سەرەڕای هێرشی خوێناویی و پەیتاپەیتای کوردەکان بۆ سەر دەڤەری جەزیرە، خەلیفە بە کەیف و خۆشییەوە لە دارالخلافەی بەغدا دا رایدەبواردو لە بەرامبەر ئەو پەلامارانەدا دژکردەوەیەکی ئەوتۆی لە خۆی نیشان نەداو ئەو سوپایەش کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان دەچوو، هەر وەك خەلیفە کەمتەرخەم بوون و هەموو جارێ کە مەغۆلەکان دەگەڕانەوە، پێیان وابوو کە گرفتەکە کۆتایی هاتووەو بۆ گەشەپێدانی بەغدا دەگەڕانەوە بۆ دارالخلافە! کوردەکانی ئەو هەرێمەش کە لە شەڕی خاچهەڵگرەکاندا ڕۆڵی پاڵەوانانەیان هەبوو، لەم بڕگە هەستیارەدا چاوە ڕێی کۆتایی هاتنی ئەو بەڵایەیان دەکردو بە هۆی قەیرانی بەڕێوەبردن و سەرکردەیی لە نێو خۆیاندا، نەیانتوانی بە شێوەی شیاو و بە رادەی پێویست، بەرگریی بکەن. بەشداریی بەرچاو و کاریگەری ئەو کوردانە لە شەڕی دژی مەسیحییەکاندا، لە لایەکەوە گڕی رق و قینی مەغۆلەکانی بەرامبەر بەوان بلێسەدارتر کرد. چونکە پێوە ندی پتەویان لەگەڵ مەسیحییەکان هەبوو و لە لایەکی دیکەشەوە بەشداریی کوردەکان لەشەڕی دژی مەغۆلەکان و کوژرانی زۆربەی فەرماندەکانیان لەو شەڕانەدا، ناوچەکەی تووشی قەیرانی قووڵی ڕێبەریی کردو بێگومان ئەگەر پاڵەوان و شەڕوانانی وەك فەقێ زیائەددین عیسا هەکاریی، سیف الدین مشتوب هەکاریی، عمادالدین کوڕی مەشتووب هەکاریی، ابولهیجاء السمین و بدرالدین محمد هەکاریی، لەو قۆناغەدا زیندوو بان و لە ناوچەکە دا بان، دەیانتوانی بە هۆییەکخستن و پتەوکردنی برایەتیی نێوان کوردەکان، بەربەستێك لە بەردەم لافاوی شەڕخوازیی مەغۆلەکان دا دروست بکەن و لانی کەم بە هۆی ناچارکردنیان بۆ گۆڕینی ڕێگەی ئەو شەڕویستییەیان، سێبەری مەترسی ئەوانیان لە سەر ناوچەکە لادەبرد.بە تایبەت کە ئەوانەگیانی قارەمانپەروەریی و پاڵەواندۆستیی و ڕۆڵی

بەرچاویان لە ئامادەو تەیارکردنی لەشکرو بەهێزکردن و وورە بەرزکردنەوەی خەڵك و هاندانیان بۆ بوێریی نیشاندان، راستیی ئەم داوایە دەسەلمێنێ.

لە کاتێکدا کە لە ژێر زەبری هێرشی تاتارەکاندا سێبەری رەشی مەرگ و نەمان بە سەر ناوچەکەدا شۆر ببۆوە، لە ساڵی ٦٣٤ ك دا بە هۆی پەلاماری رۆمییەکان بۆ سەر ئامێد، کوردەکانی ئەو شارە کەوتنە تەنگانەیەکی سەخت و ئەگەر دەستێوەردان و نێوبژیوانیی خەلیفە ئاشتی جێگیرنەکردبا، بە زوویی تووشی چارەنووسی نەخوازراوی هەولێرییەکان دەبوون.[506] چونکە مەغۆلەکان لە مانگی شەووالی ئەو ساڵەدا بە چەك و تفاقێکی زیاترەوە هەولێریان ئابڵووقە دایەوە. خەڵکی شار دەروازەکانی شاریان داخست و خۆیان لە قەڵادا قایم کرد. زاناو شەرعزانانی بەغدا فەتوایان دا کە جیهاد لە حەج گرینگترەو دارالخلافە خۆی ئامادەو تەیار کرد. مەغۆلەکان بە مەنجەنیقی ئاگرپڕژێن بەشێکی شوورەی شاری هەولێریان رووخاندو چوونە ناو شارەکەوە. هەولێرییەکان کە لە قەڵادا خۆیان حەشاردابوو، ئازایانە لێیان وەدەست هاتن و دەستیان کرد بە بەرگریی. بەڵام زۆربەیان لە تینووان گیانیان لە دەست داو بە هۆی تەنگبەرایی و بچووکیی قەڵا، نەیاندەتوانی مردووەکان بنێژن و لە ترسی پڕبوونەوەی خەندەکی چواردەوری قەڵا بە لاشەی کوژراوەکان و ریگەخۆشبوون بۆ مەغۆلەکان، دوای بەربوونەوەیان لە قەڵا ناچاربوون بیانسووتێنن و خۆڵەکەیان لە سەر قەڵاوە بە با دا دەکرد. مەغۆلەکان شارەکەیان کردە کاولە وێرانەو دوای تێپەڕینی چل رۆژ بە سەر گەمارۆی قەڵادا، بە هۆی هاتنی سەرمای زستان و

---

[506] ابن فوطی, ٥ .

بیستنی هەواڵی وەرێکەوتنی سوپای خەلیفە لە بەغداوە، گەڕانەوە بۆ ئازەربایجان.[507]

لە مانگی سەفەری ساڵی ٦٣٥ ک دا دیسان مەغۆلەکان گەڕانەوە سەر هەولێر. ئەمجارە خەڵك شارەکەیان بەجێ هێشت و وێڕای خەڵکی دەوروبەری عێراق هانایان بردە بەر بەغدا. لە ژێر کاریگەریی ئەو بارودۆخەدا، نرخی خانوو خێرا بەرز بۆوە. خەلیفە شان بەشانی سوپا لە شار وەدەرکەوت و دوای فەتوای جیهاد لە لایەن زانایانەوە، ژمارەیەکی بەرچاو و زۆری جەماوەر بەرگی شەڕو جیهادیان پۆشی. مەغۆلەکان کاتێك بەمەیان زانی پاشەکشەیان کردو گەڕانەوە دواوە. سوپای بەغدا بە پێچەوانەی جارانی پێشووی ئەمجارەیان وەدوایان کەوتن و تووشی شکستێکی سەختیان کردن و دارایی و سامانیان بە تالآن بردن. دوای ئەو رووداوانە

٢- خەلیفە بە مەبەستی نۆژەن کردنەوەی قەڵاو ئاوەدانکردنەوەی شارەکە، محمدبن سەلایای عەلەویی رەوانەی هەولێر کرد.[508] کەیف و خۆشی دوای ئەو سەرکەوتنە زۆری نەخایاند. چونکە مەغۆلە هێرشبەرەکان لە مانگی رەجەبی ئەو ساڵەدا لە خانەقین نزیك شارەزوور، سوپای خەلیفەیان بە توندیی تێکشکاندو دوای تالآن کردنی ئەو ناوچە دیسان گەڕانەوە بۆ ئازەربایجان.[509]

شەڕی نێوخۆیی لە هەرێمی جەزیرە بە هۆی مانەوەی پاشماوەی هێزی سوپای خوارەزمییەکان لەو دەڤەرەدا، دوای کوژرانی جلال الدین و هاتنیان بۆ نێو کێشەکان و خۆتێوەردان لە هاوسەنگیی نێوان هێزەکان، زیاتر تەشەنەی

---

[507] ابن فوطی, ٥٤. ابن خلکان, ٤/١٥١. ابن عبری, ٣٤٦. ابن کثیر ,١٥٧/١٣ .

[508] ابن فوطی, ٥٩.

[509] همو, ٦٠-٦١. آشتیانی, تاریخ مغول, ١٤٥ .

کردو بارودۆخەکەی لە جاران زیاتر نالەبار کرد. هەر لەو ساڵەدا کە مەغۆلەکان کوشت و بڕیان دە سوپای خەلیفە خست لە خانەقین، بدرالدین لوئلو گەمارۆی مەلیك سالح ئەییوبیی دا لە شەنگارو مەلیك سالح داوای یارمەتیی لە خوارەزمییەکان کردو بە پاڵپشتیی ئەوان تێکی شکاند.[٥١٠] پاشان مەلیك سالح بۆخۆی رۆیشت بۆ دیمەشق و شەنگاری بە مەلیك جەوواد یونس سپارد.[٥١١] بدرالدین لوئلو سەرەنجام لە کاتی رۆیشتنی مەلیك جواد بۆ بەغدا لە ساڵی ٦٣٧ ك دا، رکن الدین ئیسماعیلی کوڕی ناردە سەر شەنگارو داگیری کرد.[٥١٢] ساڵێك دواتر لوئلو نوسەیبینیشی خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆی.[٥١٣] بە هۆی دەسەڵاتخوازییەکانی بدرالدین لوئلو و دژکردەوەی ئەییوبییەکانی جەزیرەو یارمەتی داواکردن لە خوارەزمییەکان و لەشکرکێشیی هەردوولا لە دژییەکتر، ناکۆکییە نێوخۆییەکان زۆرتر تەشەنەیان سەندو ئەوەندە ئاوەدانییەش کە لە چنگی مەغۆلەکان دەرباز ببوو، وێرانیان کردو سێبەری شڵەژان و نائارامیی و ترس و پەککەوتەیی ئابووریی بە سەردا زاڵ کردو ریگەی بۆ تەڕاتێن و لەشکرکێشیی زیاتری ئەو پەلاماردەرە دنیاخۆرانە، خۆش کرد.[٥١٤]

لە ساڵی ٦٤٢ ك دا مەغۆلەکان سوپایان هێنایە سەر میافارقین و شەهابەددین غازی فەرمانڕەوای شار، کە شەڕە نێوخۆییەکان بڕستیان لێبڕیبوو، لە شارەکە رای کرد. لەو بارودۆخەدا هێرشبەرەکان ناوچەی دیاربەکریان تالان کردو دوای

---

510 ابوالفداء, ٣/ ١٧٠. صائغ, ١/٢٢٣-٢٢٤.

511 ابن فوطی, ٦١.

512 همو, ٦٤-٦٥. صائغ, ١/٢٢٤.

513 ابن فوطی, ٧٥. ابن وردی, ٢/٢٤٩.

514 بۆ شارەزایی زیاتر لە مەڕ ئەو کێشانەو دەستاو دەست کردنی شارەکان, بڕوانە:( نك: ابن فوطی, ٧٩. عزالدین ابن شداد, ٣/١٣٦-١٣٧. ابوالفداء,٣/١٨٧.)

ئەوە بەرەو ماردین کەوتنە ڕێ.[٥١٥] بەم هێرشە ناوەندی دەسەڵاتی ئەییوبییەکان کەوتە دەستی مەغۆلەکان و ڕەوتی ڕوو لە لاوازییان خێراتر بوو.
لەگەرمەی ئەو هێرش و پەلامارە پەیتاپەیتاو خوێناوییانەی مەغۆلەکان لە لایەك و شەڕە نێوخۆییەکان لە لایەکی ترەوە کە هەرێمەکەی کردبوو بە (دوورگەی ترس و دڕندەیی)، ئاسمانیش باری ئەو دەردانەی گرانتر کردو لە شەووالی ساڵی ٦٤٤ ك دا بارانێکی بەخوڕ زۆربەی گوندەکانی دەوروبەری موسڵ و هەولێرو بەغدای نوقمی ژێر ئاو کردو قەڵای هەولێر بە تەواویی چۆل بوو و بەشێکی زۆری خانوبەرەی ئەو ناوچانەی خاپوور کرد.[٥١٦]
لە ساڵی ٦٤٧ ك دا سەرلەنوێ مەغۆلەکان هێرشیان کردە وە سەر خانەقین و دەوروبەرەکەی و تا نزیکی بەغدا بەرەو پێشەوە چوون و تەواوی مەودای ڕێگای خۆیان تاڵان کردو خەڵکیان قەڵاچۆ و کوشت و بڕ کردو ئەوانەش کە دەرووی دەربازبوونیان بۆ ڕەخسا، خۆیان لە بەغدا قایم کرد.[٥١٧]
بڵێسەدارتربوونی گڕی دەسەڵاتخوازیی بدرالدین لوئلو جارێکی تریش دۆخەکەی شڵەژاند و هەل و مەرجەکەی ئاڵۆزتر کرد. هێشتا هێزەکەی هێزی نەهاتبۆوە بەرو دوای هێرشە بەرینەکەیان بۆ سەر ماردین پشوویان نەدابوو، کە لە ساڵی ٦٤٨ ك دا، سوپای هێنایە سەر جەزیرەی ئیبنوعومەرو داگیری کرد.[٥١٨]
"مەنگوقائان خان" گەورەی مەغۆلەکان، لە ساڵی ٦٥٠ ك دا فەرمانی بە هۆلاکۆی برای دا، بە مەبەستی درێژەپێدانی پێشڕەویی مەغۆلەکان بڕوا بۆ

---

[515] ابن فوطی, ٩٨.
[516] ابن فوطی, ١١٤.
[517] همو, ١١٩.
[518] ابن عبری, ٣٦٠. زەکی بەگ, خلاصة تاریخ الکرد..., ١٦٤.

ناوچەکانی رۆژئاوا (وڵاتانی ئیسلامیی) و پێی گوت دە بێ ئیسماعیلییەکان بەر لە هەمووان کوشت و بڕو سەرکوت بکاو پاشان باداتەوە سەر کوردو لوڕەکان و سەرکوتیان بکات.[519] ئەو گرووپەی مەغۆلەکانیش کە هەر لە ناوچەکەدا بوون هەر لەوساڵەدا سەرلەنوێ شاڵاویان بردەوە سەر دیاربەکرو ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەو ناوچەیان وەبەر زەبری شمشێرەکانیان داو لەناویان بردن.[520]

سەرەڕای بەهێزبوونی هێرشی مەغۆلەکان دوای دانانی هۆلاکۆ بۆ فەرماندەیی ئەو پەلامارانەو گرینگیی و پێویستیی خۆئامادەکردن بۆ بەگژداچوونەوەو بەرگریکردن لە لایەن خەلیفە المستعصم بالله و فەرمانڕەواکانی جەزیرە، دووبەرەکیی و ناکۆکییەکان گەیشتنە چڵەپۆپەو کۆمەڵکوژیی شیعەکانی بەغدا لە ساڵی ٦٥٠ ک دا لە لایەن کوڕی خەلیفەوە، ململانێ و ناتەبایی ئایینیی زیاترو پەرەسەندووتر کرد لەو شارەدا. بدرالدین لوئلو هەر لە سەرەتای بە دەسەڵات گەیشتنییەوە لە موسڵ، بە شێوەی جیاجیا دەستیکرد بە ئازاردان و چەوساندنەوەی کوردە یەزیدییەکان، پەیڕەوانی کوڕی شێخ عودەی موسافیر و موریدەکانیان و کاری گران و پەستی پێ دەسپاردن. یەزیدییەکانیش جامی ئارامیی و دان بەخۆداگرتنیان پڕ بوو و خۆیان پێنەگیراو لە ساڵی ٦٥٢ ک دا بە راشکاویی و لە شەقام و کۆڵانەکان دا باسی خراپەی لوئلوئیان دەکرد. ئەویش بەوپەڕی دڵڕەقیی و بە شێوەیەکی بێبەزەییانە، شمشێری رق و تووڕەیی لە کالان دەرێناو بەشێکی زۆری وەبەر زەبری شمشێرەکانی داو ژمارەیەکی بەرچاوی دیلەکانی سەربڕی و موریدەکانی لەت و پەت کردو کوتەگۆشتەکانی

---

[519] ابن فضل الله عمری, ٣/٣٩-٤٠. بویل, (( تاریخ دودمانی و سیاسی ایلخانان)) تاریخ ایران پژوهش کامبریج, ٥/٣٢١. بیانی, ١٤٤.

[520] ابن فوطی, ١٢٨. ابن کثیر, ١٣/١٤٩. ابن تغری بردی, ٧/٢٥.

بە دەروازەکانی موسڵەوە هەڵواسی و تەنانەت قەبری شێخ عەدی هەڵدایەوەو ئێسك و پروسکەکەی سووتاند.[521]

هۆلاکۆ لەو ماوەیەدا خەریکی شەڕی ئیسماعیلییەکان بوو و دوای زاڵبوونی تەواو بە سەریاندا، خۆی بۆ هێرشکردنە سەر دارالخلافە ئامادە کرد. دوای هێرشی فەوجێکی مەغۆلەکان بۆ سەر قەڵەمڕەوی عزالدین کەیکاوس سەلجووقیی لە وڵاتی رۆم لە ساڵی ٦٥٥ ک دا، عزالدین سوپایەکی لە کوردو تورکمەن و عەرەبەکانی ناوچەکانی مەلەتییەو خەرتەبێرت پێکهێناو داوای لە شرف الدین ئەحمەدی کوڕی بەلاس هەکاریی کرد لە موسڵەوە بێتە لای و مەلەتییەی پێدا. بەڵام خەڵکی مەلەتییە ریگایان پینەدا بچێتە ئەوێ و بە ناچاریی روویکردە ئامێدو لە رێگەدا لە لایەن فەرمانڕەوای میافارقینەوە کوژراو هاورێکانیشی بە دیل گیران.[522]

هۆلاکۆ خان دوای ئەوە کە بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر بەغدا چەند وتووێژی لەگەڵ خەلیفە المستعصم کرد، بەڵام هیچیان ئاکامێکیان نەبوو. خەلیفەی لێنەهاتوو و لاوازی بەغدا تا دواساتەکان هەولێکی ئەوتۆی نەداو تەنانەت گوێی بۆ رینمایی و هوشیارکردنەوەی ئیبنوسەلایا فەرمانڕەوای هەولێریش رانەگرت و کاتێك دڵنیا بوو مەغۆلەکان بەرەو بەغدا پێشڕەویی دەکەن، نزیکەی سەد پیاوی بۆ هەواڵگریی ناردە دەربەند کە شوێنی نهێنیی هێندێکیان لە لایەن کوردەکانەوە ئاشکرا کراو مەغۆلەکان هەر هەموویان کوشتن.[523] ئەم هەوڵە

---

[521] ابن فوطی, ١٣٣.

[522] ابن عبری, ٣٦٧.

[523] یونینی, ٨٧/١. ابن شاكر,١٣٢/٢٠.

گەورەی(!) خەلیفە لە پێناوی بەرگریی لە قەوارەی موسڵمانان و جیهانی ئیسلام بەم جۆرە لە لایەن کوردەکانەوە پوچەڵ کرایەوە.

هۆلاکۆ گرووپێکی سوپاکەی لە لای هەولێرەوە نارد بۆ موسڵ بۆ ئەوەی لە رۆژاوای بەغدا بچنە سەنگەرو بۆخۆشی لە رێگای کرماشان و حولوانەوە بەرەو بەغدا کەوتە رێ[524] و یەکێك لە فەرماندەکانی خۆی بە نێوی" ئەرقوتۆ نۆیان " راسپارد کە قەڵای قایمی هەولێر بگرێ. هەر کە قەڵا گەمارۆ درا کوردەکانی ناو قەڵا ئازایانە بەرەنگاریان بوونەوەو بەرگریەکی توندیان کردو ئیبنوسەلایا کە چوو بۆ لای "ئەرقوتۆ" و گەڕابۆوە بۆ هەولێرو داوای بەچۆکداهاتنی لێدەکردن، رێگەی چوونەناو هەولێری پێنەدراو ئەویش چوو بۆ ناو ریزی سوپای هۆلاکۆ. فەرماندەی مەغۆل کاتێك لەگەڵ بەربەرەکانیی لێبڕاوانەی کوردەکان بەرەورووبۆوە، داوای یارمەتیی لە بدرالدین لوئلو کرد، کوردەکانی ناو قەڵاکە لە شەوێکی تاریك و ئەنگوستەچاودا هەڵیانکوتایە سەر سوپای مەغۆل و کتوپڕ بە سەریان دادان و وێڕای کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانیان، مەنجەنیقەکانیشیان کەوتە دەست و سووتاند یانن. لەگەڵ هێرشی پەیتاپەیتای کوردەکان، بدرالدین لوئلو پێشنیاری بە سەرداری مەغۆل کرد گرتنی شارەکە وەدوابخات بۆ هاوینی داهاتوو، بۆ ئەوەی کاتێك کوردەکان لە بەر گەرما دەڕۆن بۆ چیاکان، لەو دەرفەتە کەڵك وەرگرن و شارەکە بگیرێ و سەرەنجام لە ساڵی ٦٥٦ ك دا بە هۆی ئەو پشتیوانییە فکریی و چەك وتفاقەی لوئلو ، شارەکە کەوتە بن دەستی مەغۆلەکان.[٥٢٥]

---

524 ابن فوطی, ١٥٤. ابن عبری, ٣٧١.

525 همدانی, ٧١٦/٢. آشتیانی, تاریخ مغول, ١٩١.

لەولاشەوە هۆلاکۆخان دوای تێپەڕینی پەنجا ڕۆژ بە سەر گەمارۆی بەغدا دا لە مانگی سەفەری ساڵی ٦٥٦ ك دا ، ئەو شارەی گرت و لەشکری هۆلاکۆ دەستیان کرد بە تالآن و حەمامی خوێنیان تێدا وەڕێخست و بەغدای "درالسلام" (واری ئاشتیی)یان کرد بە "دارالالام" (واری ئازارەکان) و بە کوشتنی خەلیفە المستعصم بالله سی وحەوتەمین خەلیفەی عەبباسیی، کۆتاییان بە دەسەڵاتی خەلافەتی پینسەدوبیست و چوار ساڵەی ئەو بنەماڵە هێنا.

## بەشی دووهەم

## دۆخی فەرهەنگیی کوردەکانی جەزیرە (٤٤٧-٦٥٦ ك)

### بەندی شەشەم: بنەماڵەو زانا کوردە ناسراوەکانی جەزیرە

### بەندی شەشەم: بنەماڵەوزانا بەنێوبانگەکانی کوردەکانی جەزیرە

مێژووی ئیسلامیش وەك هەموو مێژوو و دیاردەیەکی تر دوو دیوی هەیە. ئەگەر دیوێکی ئەم مێژووە پێکهاتووە لە ململانێ و رق وقین، شەڕهەڵگیرساندن، زیندان ئەشکەنجەو ئازاردان و پێتەختی (ژێربێژیی هێزو دەسەڵات) کە جوێ لە دەنگی سمی ئەسپەکان و زرینگ و هۆڕی شمشێرە تیژەکان و نارەتەی شەڕوانە شەڕهەڵگیرسێنەکان لە گۆڕە پانەکانی شەڕدا، ئاوازێکی تر نایەتە بەر گوێ؛ دیوەکەی تری بریتییە لە: کۆڕی فیکریی، زانستخوازیی وگەڕان بە دوای نهێنییەکان داو باس و راوێژی زانستیی و ئەم دیوە خرۆشانێکی گەورەیەو بە دەسکەوت و بەرهەمی زانستیی ئەو زاناو پیتۆڵ و بیرمەندانە رازاەتەوە کە لەو وەرزی خەزەڵوەرەدا، گوڵیان کردووەو زولفی خاوی وێژەو ئەدەبیان شانە کردووەو بە زەبری (هێزی ژێربێژیی) شەپۆلی کلتوورو شارستانییەتی ئیسلامیان زیاتر خرۆشاندووەو ئەگەر شاسوارانی سەر

گۆڕەپانی خەبات و هەوڵدانی دەسەڵاتخوازانە (میوانی مێژوو بن) ئەمانەش (خانەخوێی خاوەن بەرهەمی ئەو مێژووەن) و ئێستاش لە لێکۆڵینەوەو گەشەسەندنی فەرهەنگ و کلتووری کۆمەڵگەدا بەشدارن و شیتەڵکارانی مەیدانی وێژەو فەرهەنگ و شارستانییەتی ئیسلامیی، ئەمڕۆش هەر لە سەرخوان و هونەری بەهرەی ئەوان دانیشتوون.

کوردەکانی ئەو بڕگە مێژووییەش کە بابەتی سەرەکی باسەکەمانن، وەك پەیکەری مێژوو، هەر لەو کاتەدا کە بەشداربوون لە پێکهاتەی سیاسی و سەربازیی- کە ئاماژەمان بە هێندێك لایەنی ئەم بوارە کرد- لە گۆڕەپانی زانست و وێژەو بیری ئیسلامیش دا، ڕۆڵی چالاکانەیان هەبووە. بەشێك لەو کوردانە لە قوتابخانە تازە دامەزراوەکانی نیزامییە -کە لە لایەن وەزیری زاناو بیرمەندی ئێرانی خواجە نیزامولمولك تووسیی (٤٥٨ ك) بنیات نرابوو- و قوتابخانەکانیتری ئەو سەردەمەدا،خەریکی فێربوون و فێرکردن بوون و بەو بەرهەمە بایەخدارانەی لە دوای خۆیان بەجێیان هێشتووە، ڕەوتی خێرای گەشەو پێشکەوتنی شارستانییەتی ئیسلامیان خێراتر کردووە. پێویستە ئاماژە بەو ڕاستییە بکەین کە بە هۆی زاڵبوونی بابەتە سیاسییەکان بە سەر نووسینەوەی مێژوو لەو بڕگەدا، بەداخەوە کەمیی سەرچاوەکانی زانیاریی لە مەڕ ژیانی کۆمەڵایەتیی و داب و نەریتی کوردەکانی جەزیرە، خستنەڕووی مێژووی فەرهەنگ و شارستانییەتی ئەو کوردانەی لەو قۆناغە مێژووییەدا، ڕووبەڕووی گرفتی سەرەکیی نەبوونی هەواڵ و زانیاریی پێویست لەو بوارانەدا، کردۆتەوە. نووسەری ئەم دێڕانە تێدەکۆشێ لە درێژەی باس و توێژینەوەکەدا، لە چوارچێوەی ناوەندە فەرهەنگیی و زانیارییەکانی هەرێمی جەزیرەدا، تیشك بخاتە سەر ڕووخساری پڕزانیاریی زاناو پیتۆڵە کوردەکانی ئەو ناوچانە.

**٢– ٦–١– شارەزوورییەكان**

**٢– ٦–١–١– قاسم شارەزووریی،** زانیارییەكی ئەوتۆمان لەبەردەست دا نییە سەبارەت بە ژیانی ئەبوئەحمەد قاسم كوڕی موزەففەری كوڕی عەلی كوڕی قاسم شارەزووریی و سەرچاوەكان تەنیا ئەوەندە یان باس كردووە كە ناوبراو ماوەیەك فەرمانڕەوای هەولێرو شەنگار بووە.[٥٢٦] ئەو زانایە ئەڵقەییەكەمی زنجیرەیەكی بەنێوبانگە كە لە مێژوودا بە خۆپارێزیی و لە خواترسان و زانایی و شكۆمەندیی ناسراون و سەرەڕای ئەوەش لە گۆڕەپانی چالاكی سیاسیشدا بوونە خاوەن پلەو پایەی بەرز، ماوەی چەندین ساڵ قەزاوەتی ناوچەكانی شارەزوور و موسڵ و شامیان بە دەستەوە بووەو بوونە خاوەن پێگەیەكی گەورەو گران لە لای مەزن و فەرمانڕەواكان. لە ساڵی ٤٨٩ك دا ئەبوئەحمەد لەموسڵ كۆچی دوایی كردو هەر لەوێش سپاردەی خاك كرا.[٥٢٧]

**٢– ٦–١–٢– مورتەزا شارەزووریی،** ئەبوموحەممەد عەبدوڵڵا كوڕی قاسم شارەزووری ناسراو بە مورتەزا، (٤٦٥–٦١١ ك)، لە شاری موسڵ چاوی بە ژیان هەڵێنا. ناوبراو كەسایەتییەكی نێودارو ناسراوی بنەماڵەی شارەزوورییەكانە لە سەردە می سەلجووقیەكاندا. لە پێناوی دەستەبەركردنی زانست دا گەشتێكی كرد بۆ بەغداو لە قوتابخانەی تازەدامەزراوی نیزامییەی ئەو شارەدا دەستی كرد بە خوێندن و خۆشارەزاكردن لە بواری شەرع و حەدیس دا. پاشان گەڕایەوە بۆ موسڵی زێدی خۆی و بوو بە قازیی ئەو شارە.[٥٢٨] ئەو زانایە دەستێكی باڵای لە هۆنینەوەی هەڵبەست و هۆنراوەدا هەبوو و هەڵبەستە

---

[526] ابن خلكان, ٦٨/٤. اسنوی, ٩٦/٢-٩٧. شمیسانی, مدینة سنجار من..., ٣٠٢.

[527] ابن خلكان, ٦٩/٤. ابن عماد, ٣٩٣/٥-٣٩٤. صائغ, ٧٩/٢. روحانی, ٣٢/١.

[528] ابن خلكان, ٤٩/٣-٥٠. اسنوی, ٩٧/٢-٩٨.

هەستبزوێن و دڵگیرەکانی مایەی پەسن و ڕەزامەندیی سۆفی و ئەهلی تەسەووفە.[٥٢٩] هۆنراوەیەکی سەبارەت بە ڕێچکەی سۆفیگەریی هۆنیوەتەوە کە بە (موصلیە) نێوبانگی دەرکردو پەیڕەوانی ئەو ڕێبازە زۆر پێی دڵخۆش بوون.[٥٣٠] ئەو لە ساڵی ٥١١ ك دا لە موسڵ چاوەکانی بۆ هەمیشە لێکناو لە گۆڕستانی تایبەتی بنەماڵەکەیان دا بە خاك سپێردرا.[٥٣١]

**٢–٦–١–٣– قازیی خافیقەین شارەزووریی**، ئەبوبەکر موحەممەد کوڕی قاسم شارەزووریی (٤٥٣– ٥٣٨ ك) لە هەولێر لەدایك بووە، قۆناغی منداڵیی لەوێ تێپەڕ کردووەو پاشان چوو بۆ بەغداو لە خزمەت شێخ ئەبوئیسحاق شیرازیی – یەکەمین قوتابخانەی نیزامییەی بەغدا – خەریکی خوێندن و کۆکردنەوەی زانیاریی بوو.[٥٣٢] ئەو لە مورتەزای برای زیاتر هۆگری خوێندن بوو و لە پێناوی وەدەستهێنانی زانست و زانیاریی دا، لە رادەبەدەر شارەو شاری کرد. ماوەیەك لە خوراسان لە لای زاناکانی ئەو دەڤەرە گوێگرو قوتابی حەدیس و فەرموودە بوو. خوێندن لە قوتابخانەی نیزامییەدا،کەبە مەبەستی پەرەپێدانی ڕێڕەوی شافیعیی و بەربەرەکانی لەگەڵ بیرو باوەڕی ئیسماعیلییەکان دامەزرابوو و هەر بەو هۆیەوە فێرخوازو دەرچووەکانیشی پلەوپایەی سیاسی و کۆمەڵایەتیان دەستەبەر دەکرد، ڕێگەی بۆ ئەبوبەکر شارەزووری خۆش کرد ببێتە قازیی چەندین شار[533] و هەر لەبەر ئەوەش بوو کە بە قازیی خافیقەین (ڕۆژهەڵات و

---

[529] بۆ خوێندنەوەی هێندێك لە شیعرەکانی بڕوانە :ابن خلكان, ٣/ ٤٩-٥٢.

[530] صائغ, ٢/ ٧٩. هێندێك لەم هەڵبەستە بلاو کراوەتەوە لە :( روحاني, ١/ ٣٣.

[531] ابن خلكان,٣/ ٥٢. ابن عماد, ٦/ ٢٠٣. مدرس, ٢٤٥-٢٤٦.

[532] ابن مستوفي, ١/ ٢٠٣. ابن خلكان, ٤/ ٦٩. اسنوي, ٢/ ٩٨. كسايي, ١٨٩.

[533] بۆ وەرگرتنی زانیاریی زیاتر سەبارەت بە کاریگەریی قوتابخانەکانی نظامیة لە بوارەکانی زانستیی و کۆمەڵایەتیی دا, بڕوانە: نك: كسايي, ٢٦٨-٢٨٩.

ڕۆژئاوا) نێوبانگی بڵاو بۆوە.[٥٣٤] لە ساڵی ٥١٢ ك دا کاتێك المسترشد بالله عەبباسیی بوو بە خەلیفە، وەك نوێنەری خۆی ناردی بۆ دیمەشق بۆ ئەوەی پەیمان لە دیمەشقییەکان وەربگرێ.[٥٣٥] کەسانێکی وەك سەمعانی، ئیبنوعەساکیر،و عومەری کوڕی تەبەرزەد، فەرموودە یان لە ئەبووبەکر شارەزووریی گواستۆتەوە.[٥٣٦] قازیی خافیقەین سەرەنجام لە ساڵی ٥٣٨ ك دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردو هەر لەوێش ئەسپاردەی خاك کرا.[٥٣٧]

**٢- ٦-١- ٤- کەمالەددین شارەزووریی،** ئەبولفەزل موحەممەد کوڕی مورتەزا شارەزووریی ناسراو بە کەمالەددین (٤٩١- ٥٧٢) لە شاری موسڵ هاتە دونیاوە. حەزی فێرخوازیی و زانست ویستیی لە هەرەتی لاویی دا هانی دا بەرەو بەغدا بڕواو لەوێ لە لای ئەسعەد مەیهەنیی وانەبێژیی بە ناو ودەنگی نیزامییە، دەرگای زانست و فێربوونی بەڕوودا کرایەوەو خەزێنەی کەم وێنەی بیروز زە ینی بە زانیاری بە بایەخ، ئاوەدان کردەوە. قازیی کەمالەددین فرە فەرموودە فێربوو لە لای ئەبوتالیب زەینەبیی، ئەبولبەرەکات ئیبنوخەمیس، و ئەحمەد کوڕی تەوق باپیری (باوکی دایکی).[٥٣٨] ماوەیەك قازیی موسڵ بوو و پلەو پایەیەکی بەرزی هەبوو لە لای عیمادەددین زەنگییەکەم فەرمانڕەوای ئەو شارەو بە نوێنەرایەتیی زەنگیی چەند سەفەرێکی بۆ بەغدا کرد. لە یەکێك لەو سەفەرانەی دا پەیمانی بە المقتفی ی خەلیفەی نوێ داو بڕیاری لادانی الراشد خەلیفەی پێشووی، بۆ موسڵ هێنایەوەو دای بە عیمادەددین و بە هۆی ئەوە

---

534 ابن خلكان,٤/٧٠. ابن عماد, ٢٠٢/٦. روحاني,١/٣٧-٣٨.

535 اسنوي, ٢/٩٨-٩٩.

536 سبكي, ٤/١٧٦.

537 ابن مستوفي, ١/ ٢٠٣. صفدي, ٤/٣٣٩. سبكي, ٤/١٧٥. مدر, ٣٢٦-٣٢٧.

538 ابن خلكان,٤/٢٤١. سبكي, ١١٧/٦. ابن قاضي شهبه , ١٧/٢.

کە لە شوێنی خۆی دا بە درێژیی باسی چالاکییە سیاسییەکانی ئەو زانایە کرا،[٥٣٩] تەنیا ئاماژەی بەم گەشتە گرینگە کردو لەم دەرفەتەدا لایەنەکانی تری ژیانی دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.
بە کوژرانی زەنگییەکەم لە ساڵی ٤٥١ ك دا ئەستێرەی بەخت و دەسەڵاتی کمال الدینیش لە کەل ئاوا بوو. چونکە سیف الدین غازییەکەم فەرمانڕەوای نوێی موسڵ هەرچەند لە سەرەتاوە رووی خۆش بوو لەگەڵ کەمالەددین، لە ساڵی ٥٤٢ ك دا رقی لێ هەلگرت و لە قەڵای شاردا بەندی کردو هەرچەند بە نێوبژیوانی خەلیفە المقتفی ئازادی کرد، لە دەرەوەش چاودێریی دەکردو لە جیاتی ئەو جلال الدین ی کوڕی و زیائەدینی برازای خستە زیندانەوە. بە مردنی سیف الدین لە ساڵی ٥٤٤ ك دا قۆناغی پاوانخوازیی بنەماڵەکەی کۆتایی هات. گوایە بیرەوەری شووم و بەدی ئەو سەردەمە هەمیشە وەك سێبەر بە دوایەوە بووە. هەر بۆیە لە ساڵی ٥٥٠ کۆچیی دا موسڵی زێدی خۆی بەجێهێشت و رۆیشت بۆ دیمەشق و جارێکی تر نەگەڕایەوە موسڵ.[٥٤٠]

هەر بە گەیشتنی کەمالەددین بۆ ناو شار لە لایەن نوورەدین زەنگییەوە بە گەرمیی پێشوازیی لێکرا. نوورەدین کە ئاگای لە شکۆمەندیی و پلەو پیاوەی ئەو پیاوە بوو و لێهاتوویی و لەکارزانیی کەمالەددینی لە حکومەتی عیمادەددینی باوکی دا دیبوو، کردی بە قازیی قازییەکانی خۆی و بڕیار درا لە

539 نك: هەر ئەم لێکۆڵینەوەی بەر دەستت, بەندی سێهەم.
540 ابن خلکان, ٤/٢٤٢-٢٤٣. صائغ, ٢/٩٥-٩٦. مدرس, ٣٣٨

کاتی پڕکاریی یان سەرهەڵدانی کۆسپ و گرفت دا، قازیی محی الدینی کوڕی،[٥٤١] جێنشینی باوکی بێت.[٥٤٢]

کەمالەددین لە دەوڵەتی نورەددین زەنگی دا (٥٤٤– ٥٦٨ ك) گەیشتە چڵەپۆپەی بەرەوسەرچوون و ماوەیەك دواتر بوو بە وەزیری ئەو و چاودێریی کاروباریی ئەوقاف و دارایی سولتانیش بەو سپێرابوو و تێکڕای کاروبارە گرینگەکانی دەوڵەت، وەك دانان و دیاریکردنی فەرمانڕەواو مەزن و فەرماندەکان و بەڕێوەبردنی دیوان و نووسینگە دەوڵەتییەکان، لە ژێر چاودێریی کەمالەددیندا جێبەجێ دەکران.[٥٤٣] ئەبوشامە لە زمان باوکییەوە دەگێڕێتەوە: (ڕۆژێك کۆمەڵێك لە میرو فەرماندە پایەبەرزەکانی نوورەدین پێیان گوت: کەمالەددین هەموو ساڵێك دەهەزار دینار زیاتر لە تۆ مووچە وەردەگرێ لە کاتێك دا بە بڕی پێنسەد دیناریش رازی دەبێ و بەسیەتیی! نوورەدین لە وەڵام دا گوتی بەم جۆرە حکومەتەکەم بەرەوپێشەوە دەبەن و گەشەی پێدەدەن؟! ئەم پارەیە کەمترین بڕی گونجاوە بۆ کەمالەددین و ئەو پێنسەد دینارەش زۆرترین رادەی شیاوە بۆ هاوکارەکانی، چونکە هەر کارێکی کەمالەددین زیاتر لە دەهەزار دینار بایەخی هەیە!"[٥٤٤] ئەبوشامە لە درێژەی ئەو باسەدا لە زمان ئیبنوئەسیرەوە دەڵێ: (بوونی قازیی کەمالەددین بایەخی لە دەهەزار سواری شەڕوان زۆرترە".[٥٤٥]

---

541 نك: بڕوانە درێژەی ئەم باسە.

542 ابن قلانسی, ٥٤٨. ابوشامه الروضتین, ١٢٤/١.

543 سبکی, ٦/ ١١٧ -١١٩. ابن قاضی شهبه , ٢/٩٩-١٠٠.

544 الروضتین, ٣٦/١.

545 هەر هەمان سەرچاوە.

مێژوونووسی بەنێوبانگ عیماد کاتب ئیسفەهانیی لەو گەشتەی دا کە لە ساڵی ٥٦٢ ك دا بۆ دیمەشق کردی، لە لایەن قازیی کەمالەددینەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکراو بە نوورەدین زنگیی ناسێنرا.[٥٤٦] دەڵێن جارێك بە نوێنەرایەتیی چووبوو بۆ بەغداو لەو نامەدا کە دای بە خەلیفە المقتفی نووسیبووی: لە موحەممەدی کوڕی عبداللەی نوێنەرەوە .....و خەلیفەش بە گاڵتە لە پەنای ناوەکە نووسی: ﷺ![٥٤٧]

صلاح الدین ئەییوبی لە ساڵی ٥٧٠ ك دا هەر کە گەیشتە دیمەشق، یەکسەر چوو بۆ چاوپێکەوتنی کمال الدین لەماڵەکەی خۆیداو ئەویش گورج پێشوازییەکی شایانی لێکردو پێی گوت:(خاترجەم بە دەسەڵات دەسەڵاتی خۆتەو شارەکەش هی خۆتە.)! کاتێك قەڵای شار چەند ڕۆژێك بەربەرەکانی کرد لە بەرامبەر صلاح الدین دا، قازیی کمال الدین چوو بۆ لای بەرگریکاران و وتو وێژی لەگەڵ کردن و ڕازی کردن دەستبەرداری ململانێ بن و قەڵاکەی بە سەڵاحەددین سپارد.[٥٤٨]

کمال الدین هەڵبەستوان و شەرعزان و ووتاربێژێکی بەزیپك و زۆرزان بوو، لە ڕەفتاروهەڵس وکەوت وزانیارییدا خۆبەکەمزان و دڵاوا نان بدە بوو و یارمەتی زۆری بە هەژارو داماوان دەکرد. چەند پرۆژەیەکی خزمەتگوزاریی و ئاوەدانکردنەوەی ئەنجام داوەو مێژوونووسان ئاماژە یان بۆ کردووە.[٥٤٩] وەك

---

546 ابوشامە الروضتین, ١/١٤٤ -١٤٨ .

547 ابن جوزی, ١٨/٢٣٣ -٢٣٤ .

548 ذهبی, العبرفی..., ١٤/ ٢١٥ -٢١٦. ابن عماد, ٦/٤٠٣. هە روە ها (نك: ابن اثیر, الکامل, ٩/٤٠٦).

549 ابن خلکان, ٤/٢٤٣ -٢٤٤. ابن قاضی شهبە , ١٧/٢. هەروەها بڕوانە(نك: ابوشامة , الروضتین, ١/١٢٤.

قوتابخانەیەك لە موسڵ و قوتابخانەیەك لە نوسەیبین و میوانخانەیەك لە مەدینەو باڵەخانەی کەمالیی لە دیمەشق کە سەرەتا وەك دادگای ئێستای شار کەڵکی لێ وەردەگیراو پاشان بوو بە مزگەوت. قازیی کمال الدین سەرەنجام لە موحەڕڕەمی ٥٧٢ ك دا لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد.[550] قازیی محی الدین ی کوڕی لە خەمی کۆچی باوکی دا هەڵبەستێکی گیان هەژێنی هۆنییەوەو تەرمەکەی هەر لەو شارەدا ئەسپاردەی خاك کرد.[551] قازیی کمال الدین بەر لە وەفاتی بە هۆی پێوەندیی و هۆگرییەکی زۆر کە لەگەڵ قازیی زیائەددین ی برازای دا هەیبوو، رایسپاردبوو کە دوای مەرگی خۆی ئەو بۆ قەزاوەتی دیمەشق دیاری بکرێ و صلاح الدینیش راسپاردەکەی بەجێ هێناو لەو پۆستە گرینگەدا داینا.[552]

٢– ٦–١– ٥– محی الدین شارەزوریی، ئەبوحامید موحەممەد کوڕی قازیی کمال الدین ناسراو بە محی الدین (٥١٧– ٥٨٦ ك) هەر لە سەرەتای منداڵییەوە بە مەبەستی خوێندن چوو بۆ بەغداو لە خزمەت شێخ ئەبومەنسووری کوڕی رەززاز، وانەبێژی گەورەی نیزامییە، زانیاریی و خوێندەواریی دەستەبەر کردو لە لای قازیی خافیقەین کە مامی باوکی بوو، زانستی فەرموودە فێر بوو.[553] ئەو دوای خوێندن چوو بۆ شام و بوو بە جێگری باوکی لە دیمەشق. هەر بەو بەرپرسیارییەوە رووی کردە حەڵەب. عیماد کاتب ئیسفەهانی کە لەساڵی ٥٦٢ ك دا لە لایەن کمال الدین ی باوکەوە لە دیمەشق پێشوازییەکی گەرمی لێکراو

550 ابن جوزی, ١٨/٢٣٤. ابن اثیر, الکامل, ٩/٤٢٧. سبکی, ٦/١٢١.
551 اسنوی, ٢/١٠١.
552 ابن خلکان, ٤/٢٤٤.
553 سبکی, ٦/٢٨٦. هەروەها بڕوانە ( نك:ابن دمیاطی, ١٩/٣٧.

چەندین تایبەتمەندی بەرزو مێرخاسانەی لەودا بەدی کردبوو، لە ساڵی ٥٦٥ ی کۆچی دا چوو بۆ شاری حەڵەب و بەم جۆرە باسی چاوپێکەوتنی خۆی دەکات لەگەڵ محی الدین: "بەگەیشتنم بۆ حەلەب پەسنی بنەماڵەی شارەزووریم کرد. قازیی محی الدین شارەزووریی بە نوێنەرایەتیی باوکی قەزاوەتی ئەو شارەی بە دەستەوە بوو. ئەو شاعیرێکی بە ئیمان و لە خواترس و هۆگری زانست و زانیاریی بوو کە لە سەردەمی خوێندنی لە بەغدا لە قوتابخانەی نیزامییەوە لە ساڵی ٥٣٥ ك دا ، ئاشنایەتیی و ناسیاویم لەگەڵ هەبوو. لە موولەرزە گەورەکەی ئەو ساڵەدا ماڵەکەی بە تەواوی خاپوور ببوو و بەو بۆنەوە هەڵبەستێکم بۆ هۆنییەوە".[٥٥٤] محی الدین دوای مردنی باوکی بە فەرمی بوو بە قازی حەڵەب. بەڵام زۆری نەخایاند چاوچنۆکانی دووزمان کە دوای مردنی باوکی بڵێسەی گڕی ئێرەییان زۆرتر کڵپەی سەندبوو، نێوانیان لەگەڵ فەرمانڕەوای شار شێواندو محی الدین بە مەبەستی چارە سەری ئەو گرفتە پێی وابوو دەبێ ئەو دەڤەرە بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی لە موسڵ. لەوێ کرا بە قازیی شارو لە قوتابخانەی نیزامییەی ئەو شارەو هەروەها لە قوتابخانەی باوکی دا دەستی کرد بە وانە وتنەوە بە فێرخوازان و لە لای عزالدین مەسعودییەکەم گەیشتە چڵەپۆپەی دەسەڵات و چەندین جار بە نوێنەرایەتی عزالدین مسعود گەشتی بۆ بەغداو شارەکانی دیکە کردووە.[٥٥٥] ئەو بە پێچەوانەی باوکی پێوەندی لەگەڵ سەلاحەددین خۆش نەبوو و هەروەك لە

---

554 وەرگیراوە لە: ابوشامة, الروضتين, ١/١٨٥.

555 ابن خلكان , ٤/٢٤٦. سبكي,٦/ ١٨٦-١٨٧.

شوێنی خۆی دا ئاماژەی بۆ کرا، جارێك زۆر بە زبریی قسەی لەگەڵ کردو هەڕەشەی هێرشی سەربازیی لێکرد.[556]

قازیی محی الدین پیاوێکی هێدی و لە سەرخۆ و دڵاواو نانبدە بوو و بە نهێنیی و بێ ئەوەی کەس پێ بزانێ یارمەتی زۆری هەژارانی دەدا. لەو گەشتانەدا کە دەیکرد بۆ بەغدا یان لەو نامانەدا کە بۆ ئەو شارەی دەناردن، بڕەپارەیەکی زۆری وەك یارمەتیی دەدا بە شاعیرو شەرعزان و بیرمەندو وێژەوانانی ئەو شارە. ئەو قازییەکی دادپەروەر بوو و لە ماوەی ئەو بەرپرسیارییەی لە موسڵدا هیچ قەرزدارێکی لە سەر قەرزێکی دوو دینار یان کەمتر لەوە نەدەخستە بەندیخانەو لە خەزێنەی دارایی خۆی ئەو قەرزەی بۆ دەدانەوە،[557] سەرەنجام لە جمادی الاولی ی ساڵی ٥٨٦ ك دا لە شاری موسڵ ماڵاوایی لە ژیان کردو چاوەکانی لێکناو پەڕتووکی ژیانی جیهانی وێکناو هەر لەوێش لە توێی خاکا بە خاك سپێردرا.[558]

**٢– ٦– ١– ٦– ضیاءالدین شارەزووریی**، ئەبولفەزائیل قاسم کوڕی تاج الدین یەحیا ناسراو بە زیائەددین (٥٣٤– ٥٩٩ ك) ئەویش هەروەك ئەندامانی تری بنەماڵەکەی بە مەبەستی خوێندن بەرەو بەغدا ڕۆیشت. کاتێك صلاح الدین دەسەڵاتی بەدەستەوەگرت لە شام دا، چوو بۆ لای ئەو. زیائەددین لە سەر بنەمای وەسیەتی کمال الدین ی مامی لە دوای مردنی مامی لە ساڵی ٥٧٢ ك دا، لە جێی ئەو بوو بە قازیی شام. بەڵام دوای ماوەیەك وازی لەو بەرپرسیارییە هێنا. دوای ئەوە چەند جارێك بە نوێنەرایەتیی سەلاحەددین چوو بۆ دارلخلافەی

---

[556] نك: بڕوانە ئەم لێکۆڵینەوەی بەردەستت، بەندی سێهەم.

[557] ابن خلكان ، ٤/٢٤٧–٢٤٨. صفدی، ٤/٢١٠–٢١١. اسنوی، ٢/١٠١.

[558] ابن اثیر، الکامل، ١٠/٩٠. ابوشامة، الروضتین، ٢/١٨٢. ابن کثیر، ١٢/٣٦٣. ابن عماد، ٦/٤٧٠.

بەغدا[559] و لە شوێنی خۆی دا باسمان کرد کە یەکێك لەو راسپاردانەی بۆ بەغدای بردن خاچی پیرۆز بوو لە ساڵی ٥٨٥ ك دا.[٥٦٠] ئەو لە ساڵی ٥٩٢ ك دا دوای گرتنی دیمەشق لە لایەن مەلیك عادلەوە، ماوەیەك گەڕایەوە بۆ موسڵ و ئەرکی قەزاوەتی ئەو شارەی وەرگرت تا لە ساڵی ٥٩٥ ك دا لە لایەن خەلیفە الناصر لدین الله و بانگ کرا بۆ بەغداو بڕیاری سپاردنی پلەی قازی قازییەکانی خەلیفە بە زیائەددین، لە مزگەوتی گەورەی ئەو شارەدا خوێنرایەوەو بوو بە قاضي القضات.[٥٦١] دوای دوو ساڵ داوای لە خەلیفە کرد رێگەی پێبدا واز لە کارەکەی بێنێ، بەڵام بە هۆی ئەوە کە لە لای خەلیفە زۆر خۆشەویست بوو، داواکەی رەت کرایەوە. هەربۆیە ناچار لە رێگای ستتولملوکی هاوسەرییەوە کە رێزێکی زۆری هەبوو لای دایکی خەلیفە، پەنای بردە بەر ئەو و لەم رێگایەوە بە ئاکام گەیشت.[٥٦٢] ساڵی ٥٩٩ ك لە کاتی گەڕانەوەی دا لە رێگا لەسەرداوای مەلیك مەنسوور فەرمانڕەوای حومات بە قەزاوەتی ئەوشارە ڕازی بوو. بەڵام ئەجەل ئەوە ندە مۆڵەتی نەداو هەر لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کرد.[٥٦٣]

بەم جۆرە نەوەو وەچەکانی ئەبوئەحمەد قاسم توانیان ناوی باپیرانیان وەك سەرزنجیرەیەکی گرینگ لەسەر گۆڕەپانی شارستانییەتی ئیسلامیی لەماوەی سەدەکانی پێنجەم تا حەوتەمی کۆچیدا بە زیندوویی بهێڵنەوەو گومانی تێدا نییە نووسەری ئەم دێڕانەش تەنیا پێناسەیەکی کورتی ئەوانەی خستۆتە ڕوو و ئەگینا نەك هەر دەشێ بەدرێژیی باسی ئەندامانی تری ئەم بنەماڵەیە بکرێ،

---

559 سبکي, ٢٧٢/٧. ابن کثیر, ٣٨/١٣.

560 نك: بڕوانە ئەم لێکۆڵینەوەی بەردەستت, بەندی چوارەم.

561 سبکی, ٢٧٢/٧ -٢٧٣.

562 ابن کثیر, ٣٨/١٣ -٣٩. هە روە ها(نك: سبکی, ٢٧٢ -٢٧٣).

563 ذهبی, العبر فی..., ٣٠٩/٤. سبکی,٢٧٣/٧. ابن کثیر,٣٩/١٣.

بەڵکو باس و توێژینەوە لەمەڕ ڕۆڵی بەرچاویان لەدەوڵەتەکانی زەنگی و ئەییوبیی داو هەروەها باسی زانا شارەزوورییەکانی تر وەك سەلاّحەددین شارەزووریی و ئیبنوسەلاحی کوڕی کەلە درێژەی ئەم باسەدا باسیان دەکەین، بۆخۆی شیاوی ئەوەیە کتێبێکی بۆ تەرخان بکرێ. کارێکی لەو چەشنەش هەر لەو کاتەدا کە یارمەتیدانی دەوڵەمەندترکردنی مێژووی وێژەو فەرهەنگ و شارستانییەتی ئیسلامییە، تیشکێکیش دەخاتە سەر رابردووی کوردەکان و رۆڵی کاریگەریان لە مێژووی ئیسلام دا، کە ئەگەر لە کارییەکەم گرینگتر نەبێ، بێگومان لەو کەمتر نییە! باشترین کۆتایی ئەم بەشە رەگەزنامەی ئەم بنەماڵەیە لە لاپەڕەی ئەودیودا کە بۆ راڤەی ژیانی ئەوان تەرخان کراوە. هیوادارین دەرگایەك بە رووی ئەوانەدا بکاتەوە کە دڵیان لە لای گرینگی پێدانی هەر دوو دیوی ئەم کارە گرینگەیە!

**٢– ٦– ١– ٧– صلاح الدین شارەزووریی،** عبدالرحمن کوڕی مووسا کوڕی ابونصر ناسراو بە صلاح الدین و بە ئەبولقاسم بانگ دەکرا (٥٣٧–٦١٨ ك)، لە تەمەنی لاویی دا رۆیشت بۆ بەغداو چەند چەپکە گوڵی لە خەرمانی زانیارییەکانی شەرەفەددین ئیبنوئەبی عەسروون چنییەوە. دواتر چوو بۆ حەڵەب لە قوتابخانەی ئەسەدییە[564] خەریکی وانەووتنەوە بوو و لە مانگی ذي القعدةی ساڵی ٦١٨ ك لەو شارەدا، کۆچی دوایی کرد.[٥٦٥]

---

[564] ئەسەدەددین شێرکۆ ئەم قوتابخانەی دروستکرد بۆ شافیعی و حەنەفییەکان. نعیمی دمشقی،(١/١١٤).

[565] ابن خلکان٣/ ٢٤٤ -٢٤٥.صفدی, ١٨/ ١٨٥. اسنوی, ٢/ ١٣٤. ابن قاضی شهبه , ٢/ ٦٦.

## رەگەزنامەی شارەزوورییەکان




566 زامباور , ٢٣.

٢- ٦- ١- ٨- **ئیبنوسەلاح شارەزووریی،** ئەبوعەمر عوسمانی کوڕی سەڵاحەددین شارەزووریی کە بە ئیبنوسەلاح ناوی دەرکردبوو (٥٧٧– ٦٤٣ ك)، شارەزای فەرموودە، راڤەزان، شەرعزانێکی شافیعیی بوو. ناوبراو لەگوندی "شەرەخان"ی سەر بە هەولێر هاتۆتە دنیاوە. زانستی شەرعی لای باوکی خوێند.[٥٦٧] ئیبنوسەلاح زۆر هۆگری خوێندن بوو و لە پێناوی ئەم مەبەستەدا چەندین گەشتی بە وڵاتاندا کردووە و لە شوێنە جیاجیاکان لە لای چەندین زانا دەرسی خوێندووەو خەزێنەی زانیارییەکانی خۆی دەوڵەمەند کردووە.[٥٦٨] دوای ئەوە چۆتە بيت المقدس و لە قوتابخانەی ناسرییە (سەلاحییە)[٥٦٩] خەریکی وانەووتنەوە بوو و لە ساڵی ٦١٦ ك دا کاتێك دیوارەکانی شار وێران کران لە لایەن مەلیك موعەززەمەوە، رۆیشت بۆ دیمەشق و دەستیکرد بە وانەبێژیی لە قوتابخانەی "رەواحییە".[٥٧٠] لە ساڵی ٦٣٠ کۆچیی دا کاتێك خانەی

---

[567] ابن خلكان, ٣/٢٤٤-٢٤٥. رابسون, (ابن صلاح), دانشنامه جهان اسلام, ٦٦٩/٣. عابدی, (( ابن صلاح )), دائرة المعارف بزرگ اسلامی,١١٦/٤ .

[568] بۆ شارەزایی سەبارەت بەو شوێنانە کە گەشتی بۆ کردووەو ناسینی مامۆستاکانی بڕوانە: (ذهبی, تذكرة الحفاظ, ٤/ ١٤٣٠ .

[569] (نوردەدین زەنگیی قوتابخانەی "سەلاحییە"ی دروستکرد بەڵام بە نێوی سەلاحەددین نێوبانگی دەرکردو لە نەخۆشخانەی "نووری" دیمەشق نزیك بوو.) ((نعیمی دمشقی ١٠/ ٢٥٠))

[570] (قوتابخانەی رەواحییە لە تەنیشت مزگەوتی ئەمەویی دیمەشق بوو و لە لایەن زەکیەددین ئەبولقاسمی بازرگان ناسراو بە ئیبنو رەواحیی دروست کرا.) (همو ١/ ١٩٩).

فەرموودەی ئەشرەفییە[571] لە لایەن مەلیك ئەشرەفەوە دروست کرا، مامۆستایەتیی و بەڕێوەبەرایەتیی ئەوێشی پێ سپێردراو ماوەیەك دواتر ئەرکی پەروەردەو فێرکردنی قوتابخانەی "شامییە"ی[572] بچووکیشی گرتە ئەستۆی خۆی و بە باشی ئەرکی وانەوتنەوەی لە هەر سێ قوتابخانەکەدا بەجێ دێنا.[٥٧٣] ئیبنوسەلاح بە هۆی تێڕوانینی سەلەفیانەی بۆ بابەتە ئایینییەکان، نەیاری تەئویل بوو[574] و سەرەڕای ئەوە کە ئەویش وەك غەزالیی شافیعی مەزهەب بوو، تەشەری لێدەدا، چونکە غەزالی زانستی فەلسەفەو مەنتیقی بە پێشەکی و سەرتۆپی هەموو زانستەکانی تر دەزانی و پێی وابوو فەلسەفە هۆکارێکە بۆ تێگەیشتن لە راستی (حقیقت) و شارەزووریی وێڕای ئەوە کە پەنجەی ئاماژەی بۆ چەند کەم وکوڕییەکی " **الوسیط**" درێژ کردو رەخنەی لێگرت، لەوەش زیاتر پێی لێ هەڵێناو بە مەبەستی کەمکردنەوەی بایەخی کارەکەی غەزالی، لە سەر بنەمایەکی دوور لە ژێریی گومان و دوودڵیی دروستکرد سەبارەت بە راستیی و دروستیی نووسینی کتێبی "**المضمون به علی غیر اهله**" و گوتی ئەو کتێبە هی غەزالیی نییە.[٥٧٥] ئیبنوسەلاح خاوەن پایە و رێزێکی زۆر بوو لە لای

---

[571] (قوتابخانەی ئەشرەفییە سەرەتا ماڵ و شوێنی نیشتەجێبوونی صارم الدین ی قایماز بوو. مەلیك ئەشرەف لێی کڕی و کردی بە ماڵی فەرموودە (دارالحدیث .) یەکەمین مامۆستاو وانەبێژی ئەو قوتابخانە ئیبنو سەلاح بوو.) ((همو ١/ ١٥)).

[572] ئەو قوتابخانەیە لە لایەن "ست الشام" ی خوشکی صلاح الدین دروست کرا.(همو, ٢٠٨/١).

[573] ابن خلکان, ٣/ ٢٤٤ -٢٤٥. ذهبی, تذکرة الحفاظ, ١٤٣٠/٤. عابدی, ((ابن صلاح)), دائرة المعارف بزرگ اسلامی, ١١٦/٤.

[574] ذهبی, تذکرة الحفاظ, ١٤٣١/٤.

[575] بۆ خوێندنەوەی چۆنییەتیی تێڕوانینی ئیبنوسەلاح بۆ غەزالی, بڕوانە(نك: زرین کوب, ١١٢. ١٤٠, ١٩٢. همایی, ٤٥٠-٤٥٣).

دەسەڵاتبەدەستان و کەڵکی لەو پێگەو کاریگەرییەی خۆی وەرگرت و ڕێگای گرت لە خوێندنی فەلسەفەو مەنتیق لە دیمەشق دا.[٥٧٦] لەوانەیە لە ژێر تیشکی ئەو هەڵوێستانەی ئیبنوسەلاح دا ، خوێنەری ئەم دێڕانە بەراوردی بکا لەگەڵ هێندێك لە زانایانی ئەم سەردەمە کە بۆ پینەکردنی کەم و کورتییەکانیان لە سەلماندنی هێندێك بواری زانستیی دا، کەڵك لە دەرزی دەسەڵات وەردەگرن بۆ درووماني ئەو پینەو پەڕۆیانەو دە بنە بەربەست لە بەردەم گەشەی ئەو زانستانەدا،و لە ڕاستیدا ئەوەش بەراوردێکی لاسەنگ و دوور لە ڕاستییە! دەشێ گلەیی ئەوە لە ئیبنوسەلاح بکرێ کە بۆچی لە پێناوی بابەتە زانستییەکاندا پەنای بۆ دەسەڵات بردووە؟. بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەو ڕاستییە بین نەیاریی ئیبنوسەلاح لەگەڵ ئەو زانستانە لە بەر ئەوە نەبووە کە تێیان نەگەیشتبێ، بەڵکو بە هۆی جیاوازیی مەکۆی سەرهەڵدان و گەشەی فیکریی خۆی بووە لەگەڵ ئەو زانستانەداو جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەو دووشێوە نەیاریی و ڕاجیاییەدا کەسێك هەر لەو کاتەدا کە چاودێرو سەرپەرستی بابەتێکە، ناتەبایی و ڕکابەریی لەگەڵ دەکاو یەکێکی تر بە مەبەستی پەردەپۆش کردنی تێگەیشتنی خۆی و دەست بەرنەدان لە پەتی دەسەڵات، مل بەملە لەگەڵ بابەتەکەدا دەکات!

ئیبنوسەلاح چەندین قوتابی لە قوتابخانەکەی دا پێگەیاندن. ئیبنو خەلەکان گوتوویەتی: "لە ساڵی ٦٣٢ ك داچوومە خزمەتی و ماوەی ساڵێك لە دیمەشق زانست و زانیاریی فێر بووم لە خزمەتی دا".[٥٧٧] یەکێکی تر لە قوتابییە

---

[576] ابن قاضي شهبه, ١٤٤/٢. اسنوی, ١٣٣/٢ -١٣٤.

[577] وفيات الاعيان, ٢٤٣/٣ -٢٤٤.

بەنێوبانگەکانی ئەبوشامەی مەقدیسییە.[٥٧٨] سەرەنجام ئیبنوسەلاح لە مانگی **ربيع الثاني** ساڵی ٦٣٢ ك لە **دارالحديث** ی ئەشرەفییە دا کۆچی دوایی کرد. لافاوی جەماوەری خرۆشاو بۆ بەشداریی لە رێورەسمی بە خاك سپاردنی دا، بە هۆی گەمارۆی شار لە لایەن خوارەزمییەکانەوە، لە نیوەی رێگادا گەڕایەوەو دە کەس لە هاوڕێکانی بە چەکەوە تەرمەکەیان بردە دەرەوەی شارو لە گوڕستانی سوفییە دا بە خاکیان سپارد.[٥٧٩]

**بەرهەمەکانی: ١- ادب المفتي والمستفتي ٢- حلية الامام الشافعي ٣- فتاوى ابن صلاح ٤- مقدمة في علوم الحديث** کە ئیبنوصلاح بۆخۆی ناوی لەو کتێبە ناوە **"كتاب معرفة انواع علم الحديث هذا"** چەندین شەرح و راڤەی لەسەر نووسراوە. هەروەها کتێبی **التقريب النووي** پوختەی ئەو کتێبەیە کە مارسە تەرجەمەی کردووەو لە گۆڤاری (**ئەنجومەنی سەڵتەنەتی ئاسیایی**) دا بڵاوی کردۆتەوە.[٥٨٠] ئیبنوسەلاح چەند بەرهەمێکی تریشی هەیە کە تائێستا چاپ نەکراوە.[٥٨١]

**٢- ٦- ٢-١- ئیبنوئەسیر، ابوالسعادات مبارك کوڕی ابوالكرم محمد شەیبانی:**

کە شۆرە تی مجدالدين بوو و بە ئیبنوئەسیر ناسراوە (٥٤٤–٦٠٦ ك)، راڤەزان و فەرموودەناس و شەرعزانێکی شافیعییەو لە جەزیرەی ئیبنوعومەر لە دایك بووە و قۆناغی منداڵیی و مێرمنداڵیی هەر لەوێ تێپەڕ کردووە. لە ساڵی ٥٧٩ ك

---

578 ابوشامە, الذيل على الروضتين, ١٦٠. ابن قاضي شهبە, ٢/١٤٤-١٤٥.

579 ابوشامە, الذيل على الروضتين, ١٧٠. ذهبي, تذكرة الحفاظ, ٤/١٤٣١. ابن كثير, ١٣/ ١٨٠.

580 رابسون, ابن صلاح, دانشنامە جهان اسلام, ٣/ ٦٧٠.

581 بۆ زانینی درێژەی ئەم باسە بڕوانە: ( نك: عابدي, ((ابن صلاح)) , دائرة المعارف بزرگ اسلامي, ٤/١١٧.

دا لەگەڵ باوك و براكانی تری دا چوونە موسڵ.[٥٨٢] ئەو لە ماوەی مانەوەی خۆی لە موسڵ رێزو پایەیەكی بەرزی پەیدا كرد لە لای فەرمانڕەوایانی زەنگیی و ماوەیەك چاودێرو بەڕێوەبەری دیوانی (انشا)ی مجاهدالدین قایماز بوو. (لە ٥٩٥ ك).[٥٨٣] كاتێك قایماز لە ساڵی ٥٨٩ ك دا خرایە بەندیخانەوە، بوو بە چاودێری دیوانی نامەكانی عزالدین مسعودییەكەم. بە مردنی عزالدین و دانانی نوورەدین ئەرسەلانشای كوڕی لە سەر تەختەكەی، لەگەڵ ئەویش بوو و لە حكومەتەكەی دا بوو بە خاوەن دەسەڵاتێكی زۆر.ئیبنوئەسیر لەكۆتا ساتەكانی تەمەنی دا دەست و پێی لەكاركەوتن و لە پەل و پۆ كەوت و خانەنشین كرا. لە گوندێكی سەر بە موسڵ میوانخانەیەكی دروستكرد بە ناوی (قصر حرب) و تەواوی سامان و دارایی خۆی بۆ تەرخان كرد. ماڵەكەی مەكۆی كۆبوونەوەی زانایان و شیتەڵكارانی زانستە ئایینییەكان بوو و بە هاوكاری بەشێك لەو زانایانە چەند بەرهەمێكی نووسی.[٥٨٤]

**بەرهەمەكانی:** ١- **جامع الاصول في احاديث الرسول:** كە پوختەو هەڵبژێراوی فەرموودە سەحیحەكانی هەر شەش لقی سوننییەكانە. بە ریزبەندیی ئەلف وبێ نوسیویەتی. ٢- **النهاية في غريب الحديث**، كتێبێكە تەرخان كراوە بۆ ووشەو واتا دەگمەنەكان لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا. ٣- **الانصاف فی الجمع بين الكشف والكشاف**، سەبارەت بە راڤەی قورئانەو وەرگیراوە لە سەعلەبی زمەخشەری ٤- **المصطفی والمختار فی الادعية والاذكار** ٥- **صنعة الكتابة** ٦-

[582] ابن خلكان, ٤/ ١٤٠-١٤١.

[583] همو, ٤/١٤١-١٤٢. ذهبی, العبر في..., ٥/١٩.

[584] ابن خلكان, ٤/١٤٢-١٤٣. اسنوي, ١/١٣١-١٣٢. يوسفی اشكوری, (( ابن اثير)), دائرةالمعارف بزرگ اسلامی, ٣/٧٠٤-٧٠٥.

**البديع في شرح الفصول فى النحو لابن دهّان ٧- الشافى فى شرح مسند الامام الشافعي ٨- ديوان رسائل و ....** [585]

**٢-٦-٢-٢- ئیبنوئەسیر، ابوالحسن علی کوڕی ابوالکرم شەیبانی:** شۆرەت عزالدین و ناسراو بە ئیبنو ئەسیری جەزەریی (٥٥٥- ٦٣٠ ک) دیرۆکنووس، ئەدیب و فەرموودەناس بوو و لە جەزیرەی ئیبنوعومەر لە دایك بووە و سەردەمی منداڵیی و مێرمنداڵیی لەوێ تەواو کرد. پاشان وێڕای ئەندامانی تری بنەماڵەکەیان رۆیشت بۆ موسڵ. [586] زانیارییەکی ئەوتۆ نییە سەبارەت بەژیانی منداڵیی و لاویی ئەو پیاوەو بە بەراورد لەگەڵ ناو و دەنگی ئەو گەورەپیاوە، زانیاریی ورد سەبارەت بە ژیانی زۆر کەمە. لە سەردەمی لاویی دا رەگەڵ سەلاحەددین کەوت و لە بەشێکی شەڕەکانی دا بەشداری کردووە. بەوجۆرە کە بۆخۆی باس دەکا، لەکاتی ململانێ و کەڵەوەکێشیی نێوان فەرەنگیی و موسڵمانەکان لە سەر قەڵای "بەرزییە" لە سەر لووتکەی چیایەك کە بەسەر قەڵادا دەیڕوانی، چاودێرو بینەری وەڵامی مەنجەنیقی فەرەنگییەکان بووە لە بەرامبەر موسڵمانەکان دا. [587] بە هۆی ئەم بەشدارییەی خۆی کە وەك شایەتحاڵێك راستەوخۆ بینەری رووداوەکان بووە، ئەو بەشەی نووسینەکانی لە کتێبی **الکامل** دا کە باسی رووداوەکانی هاوکاتی ژیانی خۆیەتی، گرینگییەکییەکجار زۆری هەیە.

ئیبنووئەسیر لە کۆتاییەکانی تەمەنی دا (٦٢٦- ٦٢٨ ک) ماوەیەك میوانی شەهابەددین توغرول ئەتابەگی حەڵەب بوو و لەو ماوەیەدائیبنوخەلەکان چەند

---

[585] ابن خلکان, ٤/ ١٤٠. ابن تغری بردی, ١٩٨/٦ -١٩٩. ابن عماد,٧/ ٤٤ -٤٥. صائغ, ٢/ ٩٧-٩٨.

[586] ابن خلکان, ٣/ ٣٤٨ -٣٤٩. لنگرودی, ((ابن اثیر)), دائرة المعارف بزرگ اسلامی, ٧٠٢/٢.

[587] الکامل, ١٠/ ٥٤.

رۆژێك لەلای بوو ودەڵێ: "کەسێکی خۆبەکەم زان بوو وهەڵگری هەموو بەها باڵاکان بوو".[588] ئەو مێژوونووسە گەورە لە کۆتایی تەمەنی دا گەڕایەوە بۆ موسڵ و لەوکاتەدا هێرشە خوێناوییەکانی جلال الدین خوارەزمشاو مەغۆلەکان کەشی ناوچەکەیان تووشی قەیرانێکی قووڵ کردبوو. ئەو ماوەیەك دوای گەڕانەوەی لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٣٠ کۆچییدا ماڵاوایی لە ژیان کرد.

**بەرهەمەکانی:** ١- **اللباب فی تهذیب الانساب**، کە نووسینەووەو کورتکردنەوەیەکی پسپۆڕانەی کتێبە بایەخدارەکەی عبدالکریم سەمعانییە. ٢- **اسدالغابة فی معرفة الصحابة**، کە ٧٥٠٠ ژیاننامەی تێدایە. ٣- **الکامل فی التاریخ**، کە رووداوە مێژووییەکان لە هاتنی ئادەمەوە تا ساڵی ٦٢٨ ی کۆچی مانگیی دەگرێتە خۆ. ٤- **التاریخ الباهر فی الدولةالاتابکیة**، کە راڤەی ژیانی بنەماڵەی زەنگییەکانە.[589] حاجی خەلیفە (١٠٦٧ ك) بە هەڵە چەند کتێبێکی تری بە نووسینی ناوبراو هەژمار کردووە. وەك (**تحفةالعجائب و طرفةالغرائب و هە روە ها الجامع الکبیر في علم البیان**.[590]

**٢- ٦ - ٢ - ٣- ئیبنو ئەسیر، ابوالفتح نصرالله ابی الکرم محمد شەیبانی:**

شۆرەت زیائەددین و ناسراو بە ئیبنوئەسیر (٥٥٨–٦٧٣ ك) ئەویش هەر لە جەزیرەی ئیبنوعومەر لە دایك بووەو قۆناغی منداڵیی و مێرمنداڵیی هەر لەوێ تێپەڕ کردو تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو کە لە گەڵ ئەندامانی تری بنەماڵەکەی دا کۆچیان کرد بۆ موسڵ. زیائەددین لە ماوەی مانەوەی لە موسڵ

---

[588] وفیات الاعیان, ٣/٣٤٩.

[589] ابن خلکان, ٣/ ٣٤٨-٣٤٩. صائغ, ٩٩/٢. بۆ شارەزایی سەبارەت بە بەرهەمەکانی بە درێژیی, بڕوانە: (لنگرودی, همان, ٢/٧٠٣-٧٠٤).

[590] کشف الظنون, ٧٠٦/٥.

دا دەستی کرد بە خوێندن و لە زانستەکانی سەرف و نەحوو و بەلاغەدا گەیشتە ئاستی پسپۆڕیی.[٥٩١] ئەو بە پێچەوانەی دوو براکەی تری حەزی لە سیاسەت بوو و ئیرادەیەکی دەسەڵاتخوازانەی هەبوو. تەمەنی نزیکەی سی ساڵ بوو کە پەڕی ژیانی زانستی هەڵدایەوەو بە مەبەستی ڕۆیشتن بۆ لای سەڵاحەددین ، موسڵی بەجێ هێشت. دوای ماوەیەکی کەم لە سەر داوای مەلیك ئەفزەلی میراتگر (وەلی عەهد) ی سەڵاحەددین چوو بۆ لای ئەو و دوای کۆچی دوایی سەڵاحەددین لە ساڵی ٥٨٩ ك دا و جیگیر بوونی ئەفزەل لە سەر کورسی دەسەڵاتی دیمەشق، بوو بە وەزیری مەلیك ئەفزەل.[٥٩٢] زیائەددین لە ماوەی وەزیرایەتیی خۆیدا هێندە ناو و دەنگێکی جوانی لە دوای خۆی بە جێ نەهێشت و ئەوەندە نادادپەروەرانە رەفتاری دەکرد کە ڕێژەی ئەو کەسانەی سکاڵایان لە رەفتارەکانی هەبوو رۆژ بە رۆژ لە زیادبوون دابوو.[٥٩٣] لە ساڵی ٥٩٢ ك دا کاتێك دیمەشق کەوتە دەستی مەلیك عەزیز، مەحاسین بن عەجەم حاجب لە ناو سندووقێکی داخراودا حەشاری داو دەربازی کرد.[٥٩٤] زیائەددین دڵی هەر لە لای مەلیك ئەفزەل بوو و چەند ساڵێك دواتر لە ساڵی ٥٩٦ ك دا جارێکی تر پێوەندی پێوە کردەوەو چووە بۆ لای و تا ساڵی ٦٠٧ ك هەر لەگەڵی بوو.[٥٩٥] لەو ساڵەدا پێوەندی کرد بە مەلیك زاهیر کە فەرمانڕەوای حەڵەب بوو و بەڵام لەوێش تا سەر نەمایەوەوگەڕایەوە بۆ موسڵ. لە ساڵی ٦١١ دا ڕۆیشت بۆ هەولێرو دواتر بەرەو شەنگار کەوتە ڕێ و سەرەنجام لە ٦١٨ ك دا لە موسڵ

591 ابن خلكان, ٥/٣٨٩.

592 ابن خلكان, ٥/٣٩٠. ابن واصل, ٣/١٠.

593 همو, ٣/٥٥.

594 ابن خلكان, ٥/٣٩٠.

595 ابن خلكان, ٥/٣٩١. ذهبي, العبر في..., ٥/١٥٦.

نیشتەجێ بوو و بوو بە سەرۆکی دیوانی ئینشای ناسرەددین مەحموود کە فەرمانڕەوای موسڵ بوو.[596] ناوبراو چەندین جار وەك وەفدی راسپێراوی موسڵ گەشتی کرد بۆ بەغداو لە کاتییەکێك لەو گەشت و کارانەی دا لە ساڵی ٦٣٧ ك دا لە بەغدا کۆچی دوایی کرد.[597]

**بەرهەمەکانی:** نووسینەکانی زیائەددین زۆرتر ڕەخنەی ئەدەبین و گرنگترینیان بریتین لە: ١- **المثل السائر في ادب الكاتب والشاعر** کە گرنگترین و ناسراوترین بەرهەمی زیائەددینە. ٢- **الوشى المرقوم في حلِ المنظوم** تایبەتە بەزانست و هونەری (حەل) شیکردنەوەی ئایات و حەدیس وشێعری عەرەبی.[598]

**٢-٦-٣- هەولێرییەکان**

**٢-٦-٣-١- ئەبولعەباس هەولێری،** خدری کوڕی نەسری کوڕی عەقیلی کوڕی نەسرئەڕبیلی (٤٧٨-٥٦٧ك) رووی کردە بەغداو لە قوتابخانەی نیزامیەی ئەوشارەدا لەلای چەند زانایەکی گەورەی وەك کیائەلهەراسی و ئیبنوشاشی، هەگبەی زانست و فێربونی هەڵاخنی و بەکۆمەڵێك عیلم و زانیاریەوە گەڕایەوە بۆهەولێری زێدی خۆی و لەوێ دەستی بە وانەوتنەوە کرد.[599]

---

[596] ابن خلكان, ٣٩٢/٥. ابن عماد, ٧/ ٣٢٨. روزنتال, ((ابن اپیر)) دانشنامه جهان اسلام, ٤٠٨/٣-٤٠٩.

[597] ابوشامة الذيل على الروضتين, ١٦٩. ابن دمياطى, ٣٢٨/١٩.

[598] بۆ شارەزایی زیاتر سەبارەت بە بەرهەمەکانی و راڤەیەکی کورت و بە کەڵکی ئەو بەرهەمانە, بڕوانە: (نك: لسانى فشاركى, ((ابن اثير)), دائرة المعارف بزرگ اسلامى, ٧٠٦/٢-٧٠٨.

[599] ابن خلكان, ٢/ ٢٠٧. ابن قاضى شهبه, ٧/٢. صائغ, ١٠٩/٢. هه روه ها نك: كسايي, ١٩١.

**لە ساڵی ٥٣٣ ك دا میر سەرەفتکین[600] قوتابخانەی "القلعه"ی بۆ دروست کردو ئەبولعەبباس بە تامەزرۆییەوە دەرسی تێدا دەوتەوە. ئەو زانایە یەکەم کەسە کە لەو شارەدا مامۆستاو وانەبێژ بووەو خەڵکێکی زۆر لە خزمەتی دا زانست و زانیارییان وەرگرتووە،[٦٠١] ئەبولقاسمی هەولێریی[602] برازای و زیائەددین هەزەبانیی[603] بەنێوبانگترینی ئەو زانایانەن کە لە سەر دەستی ئەو پێگەیشتوون.[٦٠٤]**

**ئەبولعەبباس کتێبێکی هەیە کە بیست و شەش وتاری بەڵگەداری پێغەمبەری سەرداری تێدا کۆ کردۆتەوە. ئەو زانایە لە کۆتایی تەمەنیدا تووشی قەیران و گۆڕانێکی دەروونیی هات و رۆیشتە ناو ئەشکەوتێك لە دەوروبەری دیمەشق و لەوێ تەنیایی و گۆشەنشینی کردە پیشە. پاشان گەڕایەوە بۆ زێدو نیشتمانی خۆی و لە مانگی جمادی الاخرەی ساڵی ٥٦٧ ك دا کۆچییەکجاریی کردو لە قوتابخانەیەکی کۆنی ئەو شارەدا کە بە ناوی ئەو ناسرابوو ئەسپاردەی خاك کرا.[٦٠٥]**

---

[600] (میر سەرەفتکین مەنسووری کوڕی عەبدوڵڵا زەینی، خزمەتکاریی زەینوددین عەلی کوجەك بوو. ناوبراو ئەرمەنیی بوو و رەفتاری جوان و نێوبانگی خۆش بوو. هەر بۆیە عەلی کوجەك ئازادی کردو لە لایەن خۆیەوە دەسەڵاتی هەولێری دایە دەستی و ئەویش بە سامان و دارایی خۆی چەندین پرۆژەی ئاوەدانکردنەوەو خزمەتگوزاریی پێشکەشی هەولێرو دەوروبەرەکەی کرد. ئەو میرە لە رەمەزانی ٥٧٧ ك دا ماڵاوایی لە ژیان کرد.) (( ابن خلکان ٢/٢٣٩،و محمد حسین، ٥٩".

[601] ابن خلکان، ٢/٢٣٧-٢٣٨. اسنوی، ١/١١٨.

[602] نك: هەر درێژەی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

[603] نك: هەر درێژەی ئەم توێژینەوەیە.

[604] ابن خلکان ، ٢/٣٣٨.

[605] هەمان سەرچاوەی پێشوو، محمد حسین، ٢٨٦-٢٨٧. ئیبنو عیماد مێژووی ساڵی مردنی ئەبولعەبباس لە گەڵ ساڵی مردنی برازاکەی لێ تیکچووە. (نك: شدرات الذهب، ٧/١٥٢).

**٢-٦-٣-٢- ئەبولقاسم هەولێریی،** (٥٣٤–٦١٩ ك) لە هەولێر لە دایك بووەو هەر لەوێ لە لای ئەبولعەبباسی مامی دەستی بە خوێندن کردووە. دوای مردنی مامی لە ساڵی ٥٦٧ ك دا ماوەیەك لە شوێنی ئەو لە قوتابخانەی "القلعە" دا دەرسی دەگوت، پاشان رۆیشت بۆبەغداو لە لای یوسف دیمەشقیی لە قوتابخانەی نیزامییەی ئەو شارەدا درێژەی بە خوێندن دا.[٦٠٦] دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندن گەڕایەوە شارەکەی خۆی و سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە وانە ووتنەوە. بەڵام لە ساڵی ٦٠٣ ك دا ڕووبەڕووی رق و تووڕەیی کەوکەبووریی فەرمانڕەوای شار بۆوەو ناچار بوو روو بکاتە موسڵ.[٦٠٧] نوورەدین ئەرسەلانشای دووهەمی فەرمانڕەوای ئەو شارە بە گەرمیی پێشوازیی لێکردو هەوڵی دا بەوپەڕی توانا رێزی بگرێ. ئەبولقاسم بە رێزێکی زۆرەوە درێژەی بە خوێندن دا لە موسڵ و لە ساڵی ٦١٩ ك دا، ماڵاوایی لە ژیان کرد.[٦٠٨]

**٢-٦-٣-٣- رضی الدین هەولێریی،** ئەبولفەزل یونس کوڕی محمد کە بە رەزییوددین ناسرابوو، "٥٠٨– ٥٧٦" هەردوو قۆناغی منداڵیی و تازەلاویی لە زێدی خۆی بە سەر برد. لە شاری موسڵ لە لای ئیبنوخەمیسی جوهەنی عیلم فێر بوو. دواتر چوو بۆ بەغداو لە خزمەت ئەبوومەنسووری رەززاز وانەبێژی ناوداری قوتابخانەی نیزامییە، درێژەی بەخوێندن دا.[٦٠٩] ئەو زانایە پاشان گەڕایەوە بۆ موسڵ و زەینوددین عەلی کوجەك گەلێك بەخێری هێنا. رەزیوددین لەو شارەدا خەریکی دەرس گوتن، فەتواو وتووێژی زانستیی بوو و لە هەمو

[606] ابن خلكان, ٢٣٨/٢. اسنوي, ١٣٤/١. كسايى, ١٩٦.

[607] ابن خلكان, ٢٣٨/٢.

[608] همو, ٢٣٩/٢. اسنوى, ١٣٤/١. ابن عماد, ١٥٣/٧. محمد حسين, ٢٨٧-٢٨٨.

[609] ابن خلكان, ٢٥٥/٧. ابن قاضى شهبه , ٢٥/١. صائغ,١٠٥/٢.

لایەکەوە زانستخوازان بە پەلە خۆیان دەگەیاندە خزمەتی، تا لە موحەڕڕەمی ساڵی ٥٧٦ك دا ، بارگەی ژیانی پێچایەوەو بەرەو مردن گەڕایەوە.[٦١٠]

**٢- ٦ - ٣- ٤- عیمادەددین هەولێریی،** ئەبوحامید محمد کوڕی رەزیوددین هەولێریی ناسراو بە عیمادەددین (٥٣٥–٦٠٨ ك) لە هەولێر چاوی بە ژیان هەڵێناوە و زانستی شەرعزانیی لە شاری موسڵ لە لای باوکی فێر بوو. پاشان چوو بۆ نیزامییەی بەغداو لە خزمەت گەورە وانەبێژی بەنێوبانگی ئەو قوتابخانەیە (یوسفی کوڕی بەندار دیمەشقیی) خەریکی خوێندن و کۆکردنەوەی زانیاریی بوو.[٦١١] ناوبراو دواتر گەڕایەوەو بۆ موسڵ و وێڕای وانەوتنەوە لە قوتابخانەکانی ئەو شارەدا، لە مزگەوتی موجاهیدی — کە بە هۆی مجاهدالدین قایمازەوە ئەو ناوەی لێنرابوو — خەریکی وتارو خوتبەدان بوو. لە ساڵی ٥٩٢ ك دا، بوو بە قازیی موسڵ و ساڵێك دواتر وازی لەو بەرپرسیارییە هێناو قازیی زیائەددین شارەزووریی جیگاکەی پڕ کردەوە[612] و نێوبانگی عیلم و زانیاری فرەی عیمادەددین لەو کاتەدا لە چڵەپۆپەدابوو، لافاوی فێرخوازان بە تامەزرۆییەوە روویان دەکردە موسڵ و تا لە ژیان دا مابوو دە ستی لە دەرس و وانەبێژیی هەڵنەگرت.[٦١٣]

سەرقاڵیی بە بابەت و کێشە عیلمییەکان نەبوونە رێگر لە بەردەم چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەبو حامیدو ئیبنوئەسیر کە هاوچەرخ و هاوسەردەمی ئەو زانایە بووە ، وێڕای پەردە لادان لە سەر ئەو راستییە حاشاهەڵنەگرەی کە لە

---

[610] ابن خلكان, ٧/ ٢٥٥. ابن قاضي شهبه, ٢٦/١. روحاني, ٤٩/١ .

[611] ابن خلكان, ٢٥٣/٤. ابن قاضي شهبه , ٨٤/٢-٨٥. ابن عماد, ٦٣/٧. صائغ, ١٠٥/٢ .

[612] ابن خلكان , ٢٥٤/٤ .

[613] ابن قاضي شهبه, ٨٥/٢. صائغ, ١٠٥/٢ -١٠٦. محمد حسين, ٢٨٣ -٢٨٤ .

بارێکی تایبەت و دەگمەن دا ژیاوە، ئاماژە بە چالاکی مرۆڤدۆستانەی ئەبوحامیدو پاڵپشتیی و دەستگرتنەوەی هەژاران لە لایەن ئەو زانایەوە دەکا.[٦١٤]

**بەرهەمەکانی: ١- المحيط فی الجمع بين المهذب والوسيط. ٢- شرح الوجيز ي ابو حامد غزالی.**[٦١٥]

٢- ٦- ٣- ٥- **کمال الدين هەولێریی،** ئەبولفەتح مووسا کوڕی رەزیەددین هەولێریی ناسراو بەکمال الدين (٥٥١– ٦٣٩ ک)، لە موسڵ لە دایك بووەو ئەویش هەروەك عیمادەددین ی برای لە لای باوکی دەستی بە خوێندن کردووە. لە ساڵی ٥٧١ ك دا چوو بۆ بەغداو لە نیزامییەی ئەو شارەدا کە مەکۆی زانستخوازو بیرمەندە موسڵمانەکان بوو، درێژەی بە رەوتی خوێندن و فێرخوازیی خۆی دا.[٦١٦]

کمال الدين لە دوای مردنی باوکی لە ساڵی ٥٧٦ ك دا، لە شوێنی ئەو لە مزگەوتی زەینوددین عەلی کوجەك دا دەستی بە دەرس گوتنەوە کردو هەر بەوهۆیەوە ناوی عەلی کوجەك لە مزگەوتەکە سڕایەوەو بە نێوی قوتابخانەی "کەمالییە" دەنگی دایەوە.[٦١٧] بە بڵاوبوونەوەی ناو و دەنگی ئەو زانایە شارەزاو شەرعزانان لە هەموو لایەکەوە روویان تێکرد. کمال الدين سەرەڕای زانستە ئایینییەکان، لە زانستی بیرکاریی و ریازیش دا بوو بە تاقە سواری سەردەمی خۆی. ئیبنوخەلەکان کە باوکی لەگەڵ کمال الدين دا ئاشنایەتیی و

---

614 الكامل , ٢٨٣/١٠.

615 ابن خلكان , ٢٥٣/٤, ابن قاضی شهبه , ٢/ ٨٥. صائغ, ١٠٦/٢.

616 ابن خلكان, ٣١١/٥. ابن قاضی شهبه, ١١٨/٢.

617 ابن خلكان, ٣٣١/٥.

تێکەڵاویی لەمێژینەیان پێکەوە هەبوو، لە ڕێگای گەشتەکەی خۆی دا بەرەو شام، لە مانگی رەمەزانی ٦٢٦ ك دا، چاوپێکەوتن و دیداری لەگەڵ کردووەو هەرچەندە بە هۆی کەمی کات نەیتوانی سوود لە دەریای زانیاریی ئەو زانا ناودارە وەربگرێ[618] بەڵام بە جۆرێك خۆشەویستیی ئەو پیاوە لە دڵی دا هێلانەی کرد کە لە بەر خۆیەوە بەڵێنی دا هەر کاتێك لە داهاتوودا کوڕێکی ببێ، ناوی دەنێ کمال الدین مووسا.[619]

زانست و شارەزایی کمال الدین تەنیا لە چەند بوارێکی تایبەت دا نەبوو. ئیبنو ئەبی ئوسەیبەعە لە ٦٢٦ ك دا گوتوویەتی: "عەللامەی سەردەم، تاقانەی رۆژگارو سەرتۆپی زانایانی سەردەمی خۆی بووە".[620] ئیبنو خەلەکانیش وێڕای باسکردنی پلەوپایەی ئەو گەورە پیاوە لە کۆڕە زانستییەکان و لە لای بیرمەندانی دیکە، ئاماژە بەوە دەکا کە لە زانستەکانی پزیشکیی، ئەندازیاریی و ئەستێرەناسیی و ....دا، نێوبانگی هەبووە.[621] مایەی سەرسامییە سەرەڕای ئەو هەموو زانیارییە فرەو هەمەچەشنەی ئەو زانایە، بەرهەمێکی لە دوای خۆی بە جێ نەهێشتووە. سەرەنجام ئەبولفەتح لە ساڵی ٦٣٩ ك دا لە موسڵی زێدی خۆی، پەڕاوی ژیانی بە کۆتا هانی و لە گۆڕستانی بنەماڵەکەیدا بە خاك سپێردرا.[622]

٢- ٦- ٣- ٦- **شەرەفوددین هەولێریی،** ئەبولفەزل ئەحمەدکوڕی کمال الدین هەولێریی کە بە شەرەفوددین بە نێوبانگ بوو (٥٧٥–٦٢٢ ك) لە شاری موسڵ

618 هەمان سەرچاوە.

619 همو, ٣١٧/٥. محمد حسين, ٢٨٥.

620 عيون الانباء فى طبقات الاطباء, ٣٠٦/٢.

621 وفيات الاعيان, ٣١٢/٥-٣١٦.

622 همو, ٣١٧/٥.

چاوی بە رووناکایی جیهان هەڵێناوەو هەر لەوێ لە لای باوکی دەستی بە خوێندن کردو لە لای باوکی مایەوەو بە پێچەوانەی ئەوانی دیکە، لە پێناوی خوێندن دا هیچ گەشتێکی نەکرد. بیرو زەینێکی بەهێزی هەبوو و توانی لەخزمەت باوکیدا لەچەند زانستێك دابیێتەپسپۆڕو ئەو زانستانەی پێشکەشی ژمارەیەکی زۆرو بەرچاوی قوتابیەکانی کردووە.[٦٢٣] لە سەرەتای ساڵی ٦٢٠ ك دا چوو بۆ هەولێرو لە شوێنی باوکی لە قوتابخانەی کەوکەبووریی خەریکی وانە ووتنەوە بوو.

لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا کە لە هەولێر دەرسی دەگوتەوە، ئیبنو خەلەکان لەو کاتەدا منداڵیی خۆی لەوێ تێپەڕ دەکردو بەشداریی کۆڕی وانەبێژیی ئەو زانایەی کردووە، سەبارەت بە شەرەفوددین دەڵێ: "لە شێوازی وانەووتنەوەدا بێ ێنە بوو و هەر کاتێك بیر لەو گەورەپیاوە دەکەمەوە، جیهان لە بەرچاوم کەم و پەست دەنوێنێ".[٦٢٤]

دواتر لە ساڵی ٦١٧ ك دا شەرەفوددین گەڕایەوە بۆ موسڵ خەریکی دەرس گوتنەوە بوو لە قوتابخانەی قاهیرییە داو تا دوا کاتی وەفاتی لەساڵی ٦٢٢ ك دا لەوێ درێژەی بە کارەکەی دا.تێکڕای ژیانی ئەوزانایە لە سەردەمی خەلیفە الناصر لدین الله دا بوو. چونکە ئەویش لە ساڵی ٥٧٥ ك دا ببوو بە خەلیفەو هەر لەو ساڵەش دا واتە ساڵی ٦٢٢ ك ، دنیای بە جێ هێشت.[٦٢٥]

---

623 ابن خلكان, ١/١٠٩. محمد حسين, ٢٨٥. مدرس, ٧٥-٧٦.

624 وفيات الاعيان, ١/١٠٨.

625 ابن خلكان, ١/١٠٨-١٠٩.

**بەرهەمەکانی: ١- شرح التنبيه‌في فروع الفقه** ی ئەبوئیسحاق شیرازی ٢- **تلخیص احیاء علوم الدین** ی غەزالی کە لە دوو بەرگ پێکهاتووە.[٦٢٦]

٢- ٦ - ٣- ٧- **زیائەددین هەزەبانی**، ئەبوعومەر عوسمانی کوڕی عیسا کوڕی درباس هەزەبانی مارانی ناسراو بە زیائەددین (٥١٢–٦٠٢ ک) شەرعزانێکی بە نێوبانگی شافیعی مەزهەب بوو، لە لای ئەبولعەبباس هەولێری لە زێدی خۆی دەستی بە خوێندن کرد. پاشان چوو بۆ دیمەشق و لە لای ئەبی عەسرون درێژەی بە خوێندن داو لە زانستەکانی ئوسوولی مەزهەب و ئوسولی فیقە دا نێوبانگی دەرکرد.[٦٢٧]

پاشان زیائەددین چوو بۆ لای سەدرەددینی برای کە **قاضی القضات** ی میسر بوو و بە نوێنەرایەتی ئەو بوو بە قازی قاهیرە. ماوەیەك بەر لە مردن سەدرەددین لە کار لادراو میر جمال الدین خوشتەرین هەکاریی قوتابخانەیەکی بۆ دروست کرد. زیائەددین تا کاتی مردنی لە ساڵی ٦٠٢ ک دا، لەوێ خەریکی وانەبێژیی بووە.[٦٢٨]

**بەرهەمەکانی: الاستقصاء لمذاهب الفقهاء**، شەرح و راڤەیەکی بە بایەخە لە سەر کتێبی **المهذب**کە لە بیست بەرگ دایە. دیارە تەواونەبوو و بە نیوەچڵیی مایەوە. ٢– راڤەیەکی دووبەرگیی لە سەر کتێبی **اللمع** ی ئەبوئیسحاق شیرازیی.[٦٢٩]

626 هەمان سەرچاوەی پێشوو. صائغ, ٢/١٠٦. حاجی خلیفه, ٥/٩١. محمد حسین, ٢٨٥-٢٨٦.

627 ابن خلکان, ٣/٢٤٢. ابن قاضی شهبه, ٢/٧٥.

628 ابن خلکان, همان. ابن قاضی شهبه, ٢/٧٥-٧٦. ابن عماد, ٧/١٤.

629 ابن خلکان, همان, ابن قاضی شهبه, ٢/٧٦. روحانی, ١/٥٧.

٢- ٦- ٣- ٨- **ئیبنوخەلەکان،** ئەبولعەبباس شەمسوددین ئەحمەد کوڕی شەهابەددین محمد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبووبەکری کوڕی خەلەکان(٦٠٨–٦٨١) قازیی و دیرۆکنووس و ئەدیبێکی ناسراو و بە نێوبانگی شافیعی مەزهەبە. بە ناوییەکێك لە گوندەکانی هەولێر کە بە نێوی خەلەکانی باپیرەگەورەی ناودێر کرابوو، و بنەماڵەیەکی کورد لەوێ دەژیان، ناونرابوو.[٦٣٠] شەمسەددین ئەحمەد لە مانگی ربیع الاخری ی ساڵی ٦٠٨ ك لە قوتابخانەی موزەففەریەی هەولێر – کە لە ناوی موزەففەرەددین کەوکەبوورییەوە ئەو ناوەی وەرگرتبوو –و شوێنی ژیان و نیشتەجێبوونی باوکی بوو، چاوی بە ژیان هەڵێنا.[٦٣١] بنەماڵەکەی بەرادەیەکی ئەوتۆ خاوەن پێگەی زانیاریی و سیاسی بوون، کە لە داهاتوودا رێگەی خۆش دەکرد بۆ گەشەو پێشکەوتنی شەمسەددین. ئەبوحەفس عومەری مامی، نوێنەری کەوکەبووریی لە مەککەو بەرپرسی پێڕاگەیشتنی ئەوقاف و دابەشکردنی خێرو بەخششەکانی بوو و ساڵی ٦٠٩ ك لە هەولێر کۆچی دوایی کرد.[٦٣٢] شەهابەددین محمدی باوکیشی دوای خوێندن لە شام، میسر، حیجازو عێراق، ماوەی چواردە ساڵ لە موسڵ مایەوە.[٦٣٣] دوای دانانی کەوکەبووریی بۆ دەسەڵاتداریی حکوومەتی هەولێر لە ساڵی ٥٨٦ ك دا، گەڕایەوە بۆ ئەو شارەو بوو بە خاوەن پلەو پێگەیەکی بەرزو لە لایەن کەوکەبوورییەوە راسپێردرا کە خەریکی وانەووتنەوە بێت لە

---

630 ابن مستوفی, ١/٢٨٤. قس:عبدالجلیل, ٢٥١. بۆ شارەزایی زیاتر سەبارەت بە وتەکانی و زانینی شوێنی لەدایکبوون و هۆی ناودێر کردنی بەو ناوە, بڕوانە: (نك: سجادی, ((ابن خلکان)), دائرەالمعارف بزرگ اسلامی ,٣/٤٥٩-٤٦٠.

631 ابن خلكان,٢/٣٤٤. محمد حسین, ٢٧٣.

632 ابن مستوفی, ١/٢٨٤. عباس,٢١. محمد حسین, ٢٧١.

633 اسنوی, ١/٤٩٦.

قوتابخانەی موزەففەرییەداو دوو ساڵ دوای لەدایكبوونی شەمسەددین، گەڕایەوە بۆ جیهانی هەرمان و بەر سێبەری بەزەییەزدان.[٦٣٤]

ئیبنو خەلەكان دوای مردنی باوكی هەرچەندە زۆر منداڵ بوو، بەشداریی كرد لە كۆڕی وانەبێژیی شەرەفەددین هەولێریی كە دوو مانگ دوای مەرگی شەهابەددین دەستیكرد بە وانەوتنەوە لە قوتابخانەی موزەففەرییەداو بەشداری لەو كۆڕانەدا — هەروەك لە دێڕەكانی پێشووشدا ئاماژەمان بۆ كرد— كاریگەریی قووڵی لە سەر ئیبنوخەلەكان دانا.[٦٣٥] دوای ئەوە كە شەرەفەددین لە ساڵی ٦١٧ ك دا هەولێری بەجێ هێشت، ئیبنو خەلەكان وازی نەهیناولە خزمەت ئەوزانایانەداكە بە هۆی سیاسەتەفەرهەنگیی و عیلمییەكانی كەوكەبووریی دەهاتنە شارەكە، بەهرەی پڕ بەرهەمی دەستەبەر كرد. باشترین كۆڕو مەكۆی زانست و زانیاریی بۆ ئیبنوخەلەكان، ماڵی ئیبنوموستەوفیی هەولێریی[636] بوو كە پێشوازیی لەو زانایانە دەكرد كە لە هەموو لایەكەوە دەهاتنە

هەولێرو بێجگە لە وەرگرتنی زانست لەئیبنوموستەوفیی و قوتابیەكانی، سوودێكی زۆری لەو "ناوەندە فەرهەنگییە" وەرگرت.[٦٣٧]

شەمسەددین ئیبنوخەلەكان لە تەمەنی هەژدەساڵیدا، كاتێك ئیبنوموستەوفی مامۆستای بوو بە سەرپەرست و بەڕێوەبەری دیوانی فەتوادانی كەوكەبوریی، بە هیوای پاڵپشتیی و یارمەتییەكانی كەوكەبووریی و یارانی باوكی، بە یەكجاریی هەولێری زێدی خۆی بەجێ هێشت.[٦٣٨] دوای چەند رۆژ گەیشتە موسڵ و

---

[634] ابن خلكان,١/١٠٨.

[635] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[636] نك: درێژەی ئەم لێكۆڵینەوەیە.

[637] ابن خلكان,٤/١٤٧-١٤٨.

[638] همو, ٤/١٤٩-١٥٠.

سەردانی کمال الدین هەولێریی زانای بەنێوبانگی ئەو شارەو باوکی شەرەفەددین کە مامۆستای پێشووی بوو، کردو بە جۆرێك خۆشەویستی ئەو پیاوە لە دڵی ئیبنوخەلەکان دا جێگیر بوو، کە بەڵێنی دا هەرکات کوڕێکی ببێ، ناوی بنێ کمال الدین و دوای چەندین ساڵ لە ٦٥١ ك دا هەر لە هەمان ڕۆژی لەدایکبوونی کمال الدین دا کوڕێکی بوو و ناوی کمال الدینی بۆ هەڵبژاردو بەڵێنیی خۆی بەجێ هێنا.[٦٣٩] مانەوەی لە موسڵ ماوەیەکی کەمی خایاندو دوای هەڵوەستەیەکی کورت ماوە لە حەڕان، ڕوویکردە حەڵەب و لەوێ سەردانی ئیبنوئەسیری دۆستی دێرینی باوکی کردو وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا،[٦٤٠] لە باسی ئەو پیاوەدا گوتی: "پیاوێکی خۆبەکەمزان بوو و هەموو ئاکارە بەرزەکانی تێدا کۆ ببوونەوە".[٦٤١] ئیبنوخەلەکان بە هاوڕێیەتیی بەهائەددینی برای (کە لە ٦٨٣ ك دا وەفاتی کردووە)، لە سەر ڕاسپاردەی کەوکەبووریی بۆ قازیی ئیبنوشەدداد (کە لە ٦٣٢ك دا کۆچی دوایی کرد) و کۆنەهاوڕێی باوکی بوو، کە دەبێ ڕێزیان بگرێ، چوونە لای و قازیش کە لەو کاتەدا قۆناغی پیریی تێدەپەڕاند، مافی ئاشنایەتیی جێبەجێ کردو بە گەرمیی وەریگرتن و درێغیی نەکرد لە ڕێزگرتنیان دا.[٦٤٢]

ئیبنو خەلەکان لە ساڵی ٦٣٢ ك دا دوای کۆکردنەوەی زانست و زانیاریەکی زۆر لە لای زانایانی حەڵەب، بارگەی تێکناو بەرەو دیمەشق کەوتە ڕێ و ناکرێ مەرگی ئیبنوشەدادی پاڵپشت و یارمەتیدەری ئیبنو خەلەکان، کاریگەریی

---

639 همو، ٣١٧/٥. محمد حسين، ٢٨٥.

640 نك: بڕوانە بەندی شەشەم لەم کتێبەی بەردەستت.

641 ابن خلكان،٣٤٩/٣.

642 همو، ٩٠/٥. محمد حسين، ٢٧٦.

نەبووبێ لەو گەشتەی دا. لە دیمەشق رەگەڵ كاروانی كۆڕی بەشدارانی وانەكانی ئیبنو سەلاح شارەزووریی كەوت و ساڵێك لەوێ دەرسی خوێند.[٦٤٣]

ئیبنوخەلەكان هەر لەو شارەدا چاوپێكەوتنی لەگەڵ مەلیك كامیل و مەلیك ئەشرەف ئەییوبیی كردو پێوەندی گەرم و رێزی بەرامبەری نێوان ئەو دوو پاشایە، كاری كردە سەر ئیبنوخەلەكان و لە هۆنراوەیەك دا پەسنی ئاكارە جوان و بەرزەكانی مەلیك كامیل دەكات.[٦٤٤]

وەك بۆخۆی باس دەكا، لە ساڵی ٦٣٣ ك دا شامی بەجێ هێشت و بەرەو میسر رۆیشت،[٦٤٥] لەوانەیە باری نالەباری عێراق و بە تایبەتی هەولێری زێدی خۆی لەو كاتەدا كە چەند ساڵێك بوو هێرشەكانی جلال الدین خوارەزمشاو مەغۆلەكان سێبەری رەشی مەرگی بە سەردا زاڵ كردبوو، ئەوی ناچار كردبێ بۆ ئەو گەشتە. ئەگەر پێگەی عیلمی و خۆشەویستیی و رێزی لە لای خەڵك، تارادەیەك كوێرەوەریی و ئازارەكانی سەفەرو باری گران و تاڵی دوور وڵاتیی سووك نەكردبا، نەیدەتوانی ئەو هەموو گەشت و گەڕانە بكات. لە ساڵی ٦٣٧ ك دا چاوپێكەوتنی لەگەڵ شاعیری بەنێوبانگ بەهائەددین كاتب كردو داوای لێكرد مۆڵەتی بداتێ هۆنراوەكانی بگوازێتەوە.[٦٤٦]

پێوەندی لەگەڵ كەسانێكی لەو چەشنە كە لە میرە ناودارەكانی بارەگای ئەیوبییەكانی میسر بوون، وێڕای پلەوپایەی عیلمی ئەو و هاونەتەوەیی لەگەڵ قازییە قازییەكان بەدرەددین شەنگاریی (كۆچكردووی ٦٦٣ ك)، سەری كێشا بۆ

643 همو,٣/٢٤٤. ابن قاضی شهبه, ٢/٢١٢. عباس, ٣٢.

644 عباس, ٣٢.

645 وفیات الاعیان, ٥/٣١٧.

646 ابن خلکان, ٣م٣٣٦.

دانان ودیاریکردنی ئیبنوخەلەکان وەك جێگری بەدرەددین لە ساڵی ٦٤٥ ك دا. هەر لەو کاتەداو بە مەبەستی رزگاربوون لە ژیانی رەبەنیی و تەنیایی، هاوسەرو هاوبەشی ژیانی بۆخۆی هەڵبژارد.[٦٤٧] ئیبنوخەلەکان وێڕای ئەو چالاکی یانەش دەستی لە فێربوون و فێرکردن هەڵنەگرت و لە ساڵی ٦٥٤ ی ك دا دەستیکرد بە نووسینی بەرهەمی بەنێوبانگ و پڕبایەخی خۆی **الاعيان وانباء ابناءالزمان مما ثبت بالنقل اوالسماع او اثبته العيان**.[٦٤٨]

دوو ساڵ دواتر نەخۆشییەکی گشتگیر لە میسر بڵاو بۆوەو هاوڕێ ئەدیبەکەی (بەهائەددین کاتب)ی لە ناو برد. شەمسەددین بۆخۆشی بە هۆی گیرۆدەبوون بەو نەخۆشییە، نەیتوانی بەشداریی بکات لە رێورەسمی سپاردەکردنی داو کاتێك لە نەخۆشییەکە رزگاری بوو، سەردانی گۆڕەکەی کردو رێزێکی شایانی لێگرت.[٦٤٩]

بە کوژرانی سیف الدين قوتوز لە ساڵی ٦٥٨ ك داو بە دەسەڵات گەیشتنی "بەیبەرەس" وەرزێکی نوێ لە ژیانی ئیبنو خەلەکان دەستی پێکردو بە فەرمانی بەیبەرەس و هاوڕێ لەگەڵ ئەو گەڕایەوە بۆ شام و چەند ئەرك و بەرپرسیاریی پێ سپێردرا. وەك قازیی قازییەکان و وانەبێژی قوتابخانە بەنێوبانگەکان و چاودێرو بەڕێوەبەری دارایی و ئەوقافی ئەو وارە. ئەو قۆناغ و بارودۆخە تازە بوو بە هۆی ئەوە نووسینی کتێبەکەی کە گەیشتبۆ ژیاننامەییەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك، بەنیوەچڵیی بە جێ بێڵێ.[٦٥٠] ئەم

[647] صفدی, ٣٠٨/٧-٣٠٩.
[648] ابن خلکان, ٢١/١.
[649] همو, ٣٣٨/٢.
[650] ابن خلکان, ٢٥٨/٢.

هەڵوەستەو راوەستانە ماوەی دە ساڵی خایاندو دوای لادانی شەمسەددین لەو ئەرك و بەرپرسیارییە، لە ساڵی ٦٦٩ ك دا، گەڕایەوە بۆ قاهیرەو دەستیکردەوە بە نووسینی کتێبەکەی.[٦٥١] دەسکورتیی و گوشاری باری گرانی ژیان لەو ماوەدا قورساییەکی زۆری خستە سەرو بەرزیی گیانیی و مێرخاسیی ئەو پیاوەش رێگەی نەدا یارمەتی دارایی بەدرەددین بەیلەبەگی خەزێنەداری قاهیرەش وەربگرێ.[٦٥٢] ئەم قۆناغە دژوارە زۆری نەبردو لە ساڵی ٦٧٧ ك دا دیسان ئیبنوخەلەکان کرایەوە بە قازیی دیمەشق و هەر کە گەیشتە شار لە لایەن جەماوەرو زانایانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکراو هۆنەران چەندین هۆنراوەیان لە پەسنی ئەو گەورە پیاوەدا هەڵبەست.[٦٥٣] هێشتا دوو ساڵ بە سەر ئەو مێژووەدا تێنەپەڕیبوو کە بە هۆی هاتنەسەرکاری مەنسوور قەلاوون، بۆ سەر کورسی دەسەڵاتی شام و میسر، دۆخی سیاسی ئەو دوو ناوچەیە تێکچوو. "سونقور ئەشقەر" بۆ دەسەڵاتی قەلاون پێبەمل نەبوو و گوێڕایەڵیی نەکرد. قەلاوون لە دژکردەوەی ئەم هەڵوێستەی سونقور دا، سوپایەکی بە سەرپەرشتیی عەلەموددین سەنجەر ناردە سەر دیمەشق و گوایە ئیبنوخەلەکان فەتوای شەڕی دژی میسرییەکان داوە. بەڵام سەرەنجام سەنجەر سەرکەوت و لە تۆڵەی ئەو فەتوایەدا ئیبنوخەلەکان ی بەند کردو پاشان فەرمانی راگواستن و دوورخستنەوەی دا. بەڵام گەیشتنی فەرمانی لێبوردنی گشتی قەلاون و جەخت

---

651 همو,٢٥٩/٧ .

652 عباس, ٤٨ .

653 صفدی,٣١٠/٧. عباس,٤٩ .

کردنەوەی ناوبراو سەبارەت بە ئیبنوخەلەکان، ئاوێکی بە گڕی ئاگری ئەو قەیرانەدا کرد.[٦٥٤]

دوای ئەو ڕووداوە ئیبنوخەلەکان بوو بە قازیی حەڵەب. بەڵام زۆری پێنەچوو کە لەساڵی ٦٨٠ ك دا، لە سەر کارەکەی لابرا.[٦٥٥] دوای ئەوە لە قوتابخانەی نەجیبییە[656] کە لە لایەن کمال الدینی کوڕیەوە بەڕێوەدەبرا، نیشتەجی بوو و ماڵەکەی بوو بە مەکۆی کۆڕی زاناو گەورەپیاوان و ناوەندی باس و وتووێژو توێژینەوە زانستییەکان. بۆخۆشی لە مانگی سەفەری ساڵی ٦٨١ ك دا دەستی کرد بە دەرس گوتنەوە لە قوتابخانەی ئەمینییە[657] و سەرەنجام دوای چەند مانگێك بە نەخۆشیی لە جێگەدا کەوت و لە کۆتایی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦٨١ ك دا لە ماڵەکەی خۆی لە قوتابخانەی نەجیبییەدا کۆچی دوایی کرد.[٦٥٨] ئەوە کۆتایی ژیانی زانایانەی گەورەپیاوێك بوو کە لە قوتابخانە لە دایك بوو و ژیانی خۆی کردە قوربانیی فێرکردن و لە باوەشی گەرمی ماڵاوایی قوتابخانەی نەجیبییەدا، ماڵاوایی لە ژیان کردو بەرەو جیهانی هەرمان باری کرد.

**بەرهەمەکانی:** ئیبنوخەلەکان سەرەڕای ئەوە کە هۆگری مێژوو و مێژوونوسیی بوو، حەزی بە شیعریش دەکردو حەڤدە دیوانی شاعیرانی لەبەر بوو[659] و

---

654 ابن کثیر, ١٣/ ٢٩٠-٢٩١. عباس, ٥١-٥٢.

655 ابن کثیر,٩٢/١٣. ابن قاضی شهبه, ٢١٣/٢.

656 ئەو قوتابخانە لە لایەن جمال الدین ئاقوش نەجیبی کە یەکێك لە گەورەپیاوانی مەلیك ساڵح بوو, دروستکرا.(نعیمی دمشقی, ٣٨٥/١.

657 قوتابخانەی ئەمینییە یەکەمین قوتابخانە بوو کە بۆ شافیعییەکان دروستکرا بە دەستی (ربیع الدولة امین الاسلام) (همو ١٣٢/١).

658 صفدی, ٧/ ٣١٠. اسنوی, ٤٩٧/١. نعیمی دمشقی, ٣٥٩/١.

659 ابن قاضی شهبه, ٢١٤/٢.

بۆخۆشی شیعری هەبوون. هەرچەندە کەسانێکی وەك "سەفەدیی" (ك. ٧٦٤ ك) گوتوویانە ئیبنوخەلەکان بەرهەمی ئەدەبیی و شیعریشی هەیە،[٦٦٠] بەڵام جوێ لە کتێبی بە بایەخی **وفيات الاعيان** هیچ بەرهەمێکی تری ئەو لە بەردەست دا نییە. نوسخەی دەسخەتی ئەو کتێبەی ئیبنوخەلەکان بە ژمارەی کەتەلۆگی١٥٠٥ ئێستا لە ئەنتیکەخانەی نەتەوەیی بریتانیادا هەیە.[٦٦١]

٢- ٦- ٣- ٩- **ئیبنوموستەوفی هەولێریی،** ئەبولبەرەکات موبارەك کوڕی ئەبولفەتح ئەحمەد شۆرەت شەرەفەددین، ناسراو بە ئیبنوموستەوفیی(٥٦٤-٦٣٧ ك) لە بنەماڵەیەکی بەنێوبانگ و زانست پەروەر لە هەولێر لەدایك بووە. باوکی ماوەی چەند ساڵێك بەڕێوەبەری دیوانی فتوادانی هەولێری لە بەردەست دابووە. صفی الدين ی مامیشی ماوەیەك ئەو ئەرك و بەرپرسیارییەی بە ئەستۆوە بوو و کتێبی (**نصيحة الملوك**)ی غەزالیی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبیی.[٦٦٢]

ئیبنوموستەوفی پیاویکی دڵاواو نان بدەو خۆبەکەمگر بوو و جیا لە زانستەکانی فەرموودەو ریجال و... شاسواری پسپۆڕی سەر گۆڕەپانی هونەرەکانی ئەدەب و زانستی دیوان و حیساب بوو. بە گەرمیی پێشوازیی لە هەموو ئەو بیرمەندە پایەبەرزانە دەکرد کە تازە دەهاتنە هەولێرو ماڵەکەی جێ ژوان و مەکۆی کۆڕی زانایان و (ناوەندی زانستیی) هەولێر بوو و رۆڵێکی بێ وێنەی لە گەشەپێدان و بەرەوسەربردنی ئاستی فەرهەنگیی و زانیاریی ئەو شارەدا هەبوو.[٦٦٣] ئەو زانایە

---

660 الوافي بالوفيات, ٣٠٨/٧.

661 فوك,(( ابن خلكان)), دانشنامه جهان اسلام, ٥٥١/٣.

662 ابن خلكان, ١٥١/٤.

663 همو, ١٤٧/٤.

بەهرەی هەراوی لە خزمەت کۆڕی وانەی بیرمەندان وە رگرت کە ئەبولعەباس زەرزارییەکێك لەو بیرمەندە کوردانە بوو. ئیبنو موستەوفی بۆخۆی دەڵێ: "هەرکات زەرزاریی هاتبایە هەولێر دەچوومە خزمەتی و سوودم لە دەریای زانیارییەکانی وەردەگرت".[٦٦٤] دوای بنیاتنانی دارالحدیث ی هەولێر لە لایەن کەوکەبووریی و نەبوونی وانەبێژیکی شیاو بۆ ئەو قوتابخانەیە، رایسپارد تا بانگهێشتی گەورەزانایانی بەغدا بکەن بۆ راپەڕاندنی ئەو ئەرکە گرینگەو لە وەڵامی ئەو بانگهێشتەدا لە ساڵی ٦٥٢ ك دا، هاتە هەولێرو ژمارەیەکی بەرچاوی فێرخوازان لە خزمەتی دا زانیارییان دەستەبەر کرد.[٦٦٥] یاقووت حەمەویی (ك. ٦٢٦ ك) کە لە بەرەبەری شالاوی مەغۆلەکان دا خوارەزم ی بەجێ هێشتبوو، لە ساڵی ٦١٧ ك دا هاتە هەولێرو یەکسەر چوو بۆ ماڵی ئیبنوموستەوفی. ئەو دوو پیاوە زانایە بە گەرمیی کەوتنە وتووێژی زانستیی و ئیبنوموستەوفی چەند هەڵبەسیتکی بە دەسخەتی خۆی بۆ یاقووت نووسی.[٦٦٦]

---

ئیبنو موستەوفی ساڵێك دواتر لە کاتی هاتنەدەر لە مزگەوت، گیانی بە سەلامەتیی لە تیرۆرێکی بێ ئاکام دەرباز بوو و لە چەند هەڵبەستێکی رەوانبێژانەدا رووداوەکەی بە ئاگاداریی کەوکەبووریی گەیاند.[٦٦٧] ئەو لە کاتی رۆیشتنی ئیبنوخەلەکان هاوشارییەکەی خۆی لە هەولێر لە ساڵی ٦٢٦ ك دا بەڕێوەبەری دیوانی فەتوای ئەو شارە بوو و ساڵێك دواتر بوو بە وەزیری

---

[664] تاریخ ا ربل, ٣٩/١.
[665] ابن مستوفی, ٢٥٩/١.
[666] یاقوت ,١٦٧/١. محمد حسین, ٢٧٩.
[667] ابن خلکان, ١٤٩/٤.

کەوکەبووریی و تا کاتی مردنی کەوکەبووریی لە ساڵی ٦٣٠ ك دا هەر لەو پۆست و بەرپرسیارییەدا مایەوە.[٦٦٨] دوای ئەو مێژووە ئیبنوموستەوفیی وای بە باش زانی کە خەریکی کارە عیلمییەکان بێ. هەربۆیە لە ماڵەوە گۆشەنشینن بوو و خەڵك وەك جاران بەهرەی زانستی یان لێ وەردەگرت. لە کاتی شاڵاوی لە ناکاوی مەغۆلەکان بۆ سەر هەولێر لە ساڵی ٦٣٤ ك دا یەکێك لەو کەسانە بوو کە خۆیان لە قەڵای شاردا قایم کردو دوای ڕۆیشتنی مەغۆلەکان ڕۆیشت بۆ موسڵ و دوای سێ ساڵ لەوێ گیانی بە گیان ئافەرین سپارد. ئێستا بە مەبەستی ڕێزگرتن لەو پیاوە زانایە پەیکەرێکی گەورەیان بۆ چێ کردووەو لە دەروازەی هاتنەژوورەوەی قەڵا دانراوە.[٦٦٩]

**بەرهەمەکانی:** چەندین بەرهەمی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە کە گرینگترینەکانیان بریتین لە: **نباهة البلد الحافل ومن ورد عليه من الاماثيل** (**مێژووی هەولێر**)، کتێبی (**مێژووی بەغدا**)، ڕاڤەی ژیان و بارودۆخی ئەو پیاوە بەنێوبانگانەیە کە لە هەولێر سەریان هەڵداوە، یان ماوەیەك لەوێ ژیاون یان بەوێدا تێپەڕیون. ٢- **اثبات المحصل في نسبة ابيات المفصل**، لە دوو بەرگ پێکهاتووەو ڕاڤەی ئەو بەیتە شیعرانەیە کە زمەخشەری لە کتێبی **المفصل** دا، بەڵگەی پێ هێناونەوە. ٣- **النظام في شرح شعرالمتنبي وابي تمام**، (دە بەرگە) هەروەها کتێبی **اباقماش** ڕاڤەی دەقە دەگمەنە ئەدەبییەکان و ....[٦٧٠]

**٢-٦-٤- ناودارانی تر**

[668] همو, ٤/١٥٠-١٥١.

[669] همو,١٥١. ذهبی, العبر فی..., ١٥٦/٥. ابن کثیر,١٥٠/١٣.

[670] ابن خلکان, ١٤٧/٤. صائغ, ١٠٨٨/٢. محمد حسین, ٢٧٨-٢٧٩.

**٢- ٦- ٤-١- سیف الدین ئامێدیی**، ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ئەبوعەلی، ناسراو بە سیف الدین (٥٥١–٦٣١)، خویندنی بەرایی لە ئامێدیی زێدی خۆی دەست پێکرد. پاشان روویکردە بەغداو دوای فێربوونی رێڕەوی شافیعی لە لای کوڕی فەزلان، بوو بە پەیڕەوی ئەو مەزهەبەو وازی لە مەزهەبی حەنەفی هێنا. بوو بە شاسوارو سەرتۆپی پسپۆر لە زانستی ئەخلاق داو تامەزرۆیی فێربوون، پەلکێشی کرد بۆ میسر. لەوێ قوتابی و فێرخوازی فرەی لێ کۆبوونەوەو هەر کە نێوبانگی دەنگی دایەوە، گڕی ئێرە یی زاناو شەرعزانانی ئەو ولاتە کلّپەی سەند. ئەو تۆمەتەیانان بە سەردا سەپاند کە بیرو باوەڕێکی گەندەڵی هەیەو پەیڕەوی رێڕەوی فەلاسیفەیەو فتوای کافرکردنیان دا. ئەویش لە ژێر کاریگەریی ئەو بارە نالەبارەدا بارگەو بنەی پێچایەوەو بەرەو شام گەڕایەوە.[٦٧١]

سیف الدین لە ساڵی ٦١٥ ك دا هاتە شاری حومات و مەلیك مەنسوور ئەییوبیی رێزی زۆری لێناو لە ژێر سایەی پشتیوانیی ئەو پیاوەدا ماوەی دوو ساڵ بەوپەڕی سەربەرزیی لەوشارەدا ژیا. دوای مەرگی مەنسوور لە ساڵی ٦١٧ ك دا حومات ی بە جێ هێشت و بەرەو دیمەشق کەوتە رێ. مەلیك موعەززەم فەرمانڕەوای دیمەشق گەلێك بە خێری هێناو فرە رێزی لێگرت و وانەبێژیی و مامۆستایەتیی چەند قوتابخانەیەکی دیمەشقی پێ سپارد. بەشدارانی کۆڕی وانەکانی سەریان سوڕمابوو لە شێوەی فێرکردن و توانای دەربڕین و قسەکردنی لە وتووێژە زانستییەکان دا.[٦٧٢] ئیبنو ئەبی سوبەیعە هەر لەو قۆناغەدا هاوڕێ

---

[671] ابن خلکان, ٢٤٩/٣. ذهبی , العبر فی..., ١٢٤/٥. ابن قاضی شهبه, ٩٩/٢.

[672] ابن ابی اصیبعه, ١٧٤/٢.

لەگەڵ باوکی کە هاوڕێی کۆنی سیف الدین بوو، چوو بۆ ماڵەکەی و بە پێی قسەکانی خۆی ماوەیەك دەرسی لە لای ئەو خوێند.[٦٧٣]

دوای گرتنی دیمەشق لە لایەن مەلیك ئەشرەف لە ساڵی ٦٣٠ ك دا، بابەتی دەرسی قوتابخانەکانی سنووردار کردوو تەنیا ڕێگەی بە ووتنەوەی وانەکانی تەفسیر، فیقهو فەرموودە داو فێربوون و فێرکردنی وانەی بابەتە زانستییەکانی تری قەدەغە کرد. هەربۆیە سیف الدینیش گۆشەنشینیی هەڵبژاردو وازی لە دەرس گوتنەوە هێناو هەر لەو گۆشەنشینییەشدا مەرگ یەخەی گرت و لە گۆشەی گۆڕدا جێگەی گرت.[٦٧٤]

**بەرهەمەکانی: ابکارالافکار،** لە پێنج بەرگ دایەو دواتر لە کتێبێکییەك بەرگیی دا بە نێوی **منائح القرائح** کورت و پوختی کردەوە. ٢- **دقائق الحقائق** ٣- **رموزالکنوز** ٤- **لباب الالباب** ٥- **منتهى السوال فى علم الاصول** ٦- **غايه المرام فى علم الكلام** و.....[675]

٢- ٦- ٤- ٢- **بەهاء شەنگاریی،** ابوالسعادات اسعد کوڕی یەحیا ناسراو بە بەهائ (٥٣٣–٦٢٢ ك) شاعیرو شەرعزانێکی شافیعی بوو، ئەوجوێ لە فیقه شارەزایی لە عیلمی خیلافیش دا هەبوو. بەڵام لایەنی شاعیرییەکەی لە هەردووکیان بەهێزتر بوو و هەر بە شاعیریش نێوبانگی دەرکردو لە لای پاشاکان بەڕێزو خاوەن پایە بوو.[٦٧٦] ئەو شاعیرێکی عاشقە گەشت و گەڕان بوو و لەو گەشتانەی دا چاوپێکەوتنی لەگەڵ بیرمەندو گەورەپیاوان دەکردو

---

[673] عیون الانباء فی طبقات الاطباء، ٢/١٧٤-١٧٥.

[674] ابن کثیر، ١٥١/١٣. ابن قاضی شهبه، ٢/١٠٠-١٠١.

[675] ابن ابی اصیبعة، ١٧٥/٢. ابن خلکان، ٢٩٤/٣.

[676] همو، ٢١٤/١.

هەڵبەستی پەسن و پیاهەڵدانی ئاکارە جوانەکانی بۆ هۆنینەوە. یەکێك لەوکەسایەتییە ناسراوانەی کە بەهاء شەنگاریی شیعری بۆ نووسیوە، قازیی کمال الدین شارەزوورییە کە هەڵبەستێکی بەنێوبانگی بۆ پەسنی ئەو گەورەپیاوە هەڵبەستووە.[٦٧٧]

ئیبنوخەلەکان دەڵێ: لە ماوەی مانەوەم لە دیمەشق دا دیوانی گەورەی شیعرەکانی ئەو شاعیرەم لە کتێبخانەی ئەشرەفییەی ئەو شارەدا دیوە.[٦٧٨] بەهاء هەر لە شەنگاری زێدی خۆی چاوەکانی لێکناو بارگەی ژیانی دونیای تێکنا.[٦٧٩]

## سەرچاوەکانی ئەم توێژینەوە

١. **تاریخ مغول**، نووسینی عباس اقبال ئاشتیانی. تاران زانکۆی ئەمیر کەبیر، ١٣٦٥ی کۆچیی هەتاویی.

٢. **تاریخ مفصل ایران از صدر اسلام تا انقراض قاجاریه**،بە هەوڵ وکۆششی محمد دبیر سیاقی، تاران : کتێبخانەی خەیام، بی تا.

٣. **وزارت درعهد سلاطین بزرگ سلجوقی** ، بە هەوڵ و ماندووبوونی محمد تقی دانش پژوە و یەحیا زەکا ، تاران: زانکۆی تاران ، ١٣٧٨ کۆچیی هەتاویی.

٤. **ماو مدرنیت**، داریوش ئاشووری، تاران، ١٣٨٤ کۆچیی هەتاویی.

---

677 هەمان سەرچاوەی پێشوو. بۆ خوێندنەوەی هێندێك لە هەڵبەستەکانی بڕوانە: ابن عماد همان جا, ١٨٢/٧.

678 وفیات الاعیان, ١/ ٢١٥-٢١٦.

679 ابن خلکان, ٢١٦/١-٢١٧. ابن عماد, ١٨٢/٧-١٨٣. صائغ, ١١٠/٢.

٥- **مسامرة الاخبار و مسايرةالاخيار**، محمود ئاقسەرایی، بە کۆششی عوسمان تووران ، تاران ئەساتیر، ١٣٦٢ ك.ه.

٦- **ذيل سلجوقنامه** ، نووسینی ابو حامد ابن ابراهیم، بی جا نشریات گلالەی خاور، ١٣٣٢ ك.ه.

٧- **عيون الانباء في طبقات الاطبا** ، ابن ابی صبیعه، موفق الدین. بی جا. **مطبعةالوهبية**، ١٢٩٩ کۆچیی مانگیی.

٨- **التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية**، نووسینی عزالدین،ئیبنو ئەسیر، بە هەوڵ و تێکۆشانی عبدالقادر احمد تولەیمات، قاهیره، **دار مكتبة الحديث، ١٣٨٢** کۆچیی مانگیی.

٩- **الكامل في التاريخ**، بە هەوڵی عومەر عبدالسلام تدمری، بەیرووت: دارالکتب العربی ١٤٢٢ کۆچیی مانگیی.

١٠- **تاريخ الفارقی**، احمد بن یوسف، ابن ازرق، بە هەوڵی بەدەوی عەبدوللەتیف عیوەز، قاهیره: **الهيئةالعامة لشؤن المطابع الاميريه،١٣٧١** کۆچیی مانگیی.

١١- **رحلة ابن بطوطة**، ئەبو عەبدووڵڵا موحەممەد ئیبنو بەتووتە، بیروت: داربیروت، ١٤٠٥ کۆچیی مانگیی.

١٢- **النجوم الظاهرة في ملوك مصر والقاهرة**، جمال الدین ابوالمحاسن، ابن تغری بردی، **وزارةالثقافة والارشادالقومي ، بي تا**.

١٣- **سفرنامه ابن جبير**، محمد ابن احمد، ابن جبیر، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی پرویز اتابکی، مەشهەد: ١٣٧٠ کۆچی هەتاویی.

١٤- **المنتظم في تاريخ الملوك والامم**، ابن جوزى، ابوالفرج، بە تێکۆشان و ماندووبوونی محمد عبدالقادر عەتا و موستەفا عبدالقادر عەتا، بيروت: دارالكتب العلميه، ١٤١٢ ك . م.

١٥- **صورة الارض: ابن حوقل، ابوالقاسم، بيروت: دار ومكتبة الحيات، ١٢٩٢**.

١٦- **المسالك والممالك**، ابن خردادبه، عبيدالله بن عبدالله، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی دوکتۆر حوسین قەرەچانلوو، تاران، ١٣٧٠ ك . هـ.

١٧- **تاريخ ابن خلدون**، (**العبرو**...) ابن خلدون، عبدالرحمن بن محمد، بيروت دارالكتب العلميه، ١٤١٣ ك. م.

١٨- **وفيات الاعيان وانبئا ابنئا الزمان**، شمس الدين احمد، ابن خەلەکان، بە کۆششی عباس احسان، قوم، منشورا شريف **رضا:** ١٣٦٤ ك. هـ.

١٩- **المستفاد من ذيل تاريخ بغداد**، احمد بن ايبك، ابن دمي**اطى** ، بە هەوڵ و تێکۆشانی دوکتۆر قەیسەر ئەبو فەرەح، بيروت: دارالكتب العلميه، بی تا.

٢٠- **عيون التواريخ**، بە هەوڵی دوکتۆر فەیسەڵ سامرو نەبیلە عبدالمنعم، بەغدا، دارالرشيد، ١٩٨٠ زايينيى.

٢١- **النوادر السلطانيية والمحاسن اليوسفية** (**سيرة صلاح الدين الايوبي**)، بهئا الدين، ابن شداد، بە هەوڵی جمال الدين شيال، قاهيرە: **مؤسسةالخانجى، ١٩٦٢** زايينيى.

٢٢- **الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة**، بە هەوڵییەحیا عیبارە، دیمەشق: **وزارةالثقافة والارشادالقومي، ١٩٧٨زايينى**.

٢٣- **مختصر تاريخ الدول**، عبدالحميد ئايەتيى كردوويەتە فارسى، تاران: علمى و فرهنگى، ١٣٧٧ ك. هـ.

**٢٤- بغية الطلب في تاريخ حلب (التراجم الخاصة بتاريخ سلاجقة)** نووسینی کمال الدين ابوالقاسم، ابن عديم، بە هەوڵی علی سويم، ئەنقەرە: **مطبعةالجمعيةالتاريخية التركية، ١٩٧٦ زايينی**.

**٢٥- شذرات الذهب في اخبار من ذهب،** نووسینی شهاب الدين، ابن عماد، بە هەوڵ و ماندووبوونی عبدالقادر ارناوو**ط و محمود ارناووط، بيروت،دار ابن كثير،** ١٤١٠ک.م.

**٢٦- الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المأة السابعة،** بيروت: دارالفكر، ١٤٠٧ ک.

**٢٧- طبقات الشافعية، نووسينی ابوبكر بن محمد، ابن قاضي شبهه،** بە هەوڵ و کۆششی دوکتۆر حا**فظ عبدالعليم خان، حيدر اباد دكن، مطبعة مجلس دائرةالمعارف الاسلامية، ١٣٩٨ك**.

**٢٨- تاريخ دمشق،** نووسینی حمزه بن اسد، ابن قلانسی، بە کۆششی سوهەیل زەکار، دیمەشق: دارالاحسان، ١٤٠٣ک.

**٢٩- البدايه والنهايه،** نووسینی ئەبولفیدا حافز، ئیبنوکەسیر، بە هەوڵی فوئاد سەید و کەسانی تر، بیروت: دارالكتب العلميه، ١٤٠٧ک.

**٣٠- تاريخ اربيل (نباهةالبلد....)** نووسینی شرف الدين ابوالبركات، ابن مستوفی، بە هەوڵ و کۆششی سامی بن سيد خماش صقار، بی جا: دارالرشيد، ١٩٨٠ زايينيی.

**٣١- مفرج الكروب في اخبار بني ايوب،** بەرگییەک تا سێهەم، نووسینی جمال الدين محمد، ابن واصل، بە کۆششی جمال الدين شيال، بەرگی چوارەم بە تێکۆشانی محمد حەسەنەین رفیع، مصر: **مطبعة فؤادالاول، ١٩٥٣ زايينی**.

٣٢- **تتمة المختصر في اخبارالبشر**، نووسینی زین الدین عمر، ابن وردی، بە هەوڵی ئەحمەد رەفعەت بەدراوی، بیروت: دارالمعرفەو ١٣٨٩ك.

٣٣- **الذیل علي الروضتین** (**تراجم رجال**...) نووسینی شهاب الدین ابومحمد، ابوشامە، بە کۆششی عزت **عطار حسینی، بیروت: دارالجلیل، ١٩٧٤ زایینی**.

**٣٤- الروضتین في اخبار الدولتین النوریة والصلاحیة، بیروت: دارالجلیل، بي تا.**

**٣٥- المختصر في اخبارالبشر، نووسینی ابولفداء عمادالدین، مصر: مطبعةالحسینیة، بي تا.**

٣٦- **تقویم البلدان**، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی عبدالحمید ئایەتی، تاران: بنیاد فرهنگ ایران، ١٣٤٩ ك. ه.

٣٧- **نزهةالمشتاق فی اختراق الافاق**، نووسینی ابو عبدالله محمد، ئیدریسی، بیروت: عالم الکتب، ١٤٠٩ ك.

٣٨- **طبقات الشافعیة**، نووسینی جمال الدین عبدالرحیم، اسنوی، بە هەوڵی عبدالله الجبوری، بەغدا: **مطبعةالارشاد، ١٣٩٠ك**.

٣٩- **المسالك والممالك**، نووسینی ابواسحاق ابراهیم، ئیستەخری، بە هەوڵی ایرج فشار، تاران: بنگاه ترجمه و نشر کتاب،١٣٤٧ ك.ه.

٤٠- **تاریخ دولة السلجوقي**، نووسینی عیماد کاتب ئیسفەهانیی، بە هەوڵ و تێکۆشانی **لجنة احیاءالتراث العربي، بیروت: دارلافاق الجدیدة، ١٤٠٠ك**.

٤١- **الفتح القسی فی فتح القدسی**، بە کۆششی محمد محمودصبح، بی جا، بی تا.

**٤٢- تاریخ العراق فی العصرالسلجوقی، بغداد: مطبعةالارشاد، ١٣٨٥.**

٤٣- **تاریخ سیاسی و جغرافیایی مردم کرد**، تاران: ارمغان، ١٣٧٩ك.ه.

٤٤- (**ایران شرقی در استانه تهاجمات ترکان**)، **تاریخ ایران پژوهش کمبریج**، نووسینی **باسورث**، **کلیفور دادموند**، بەرگی پێنجەم، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی حسن انوشه، تاران: زانکۆی ئەمیر کەبیر،١٣٨١ک.ھ.

٤٥- **سلجوقیان**، وەرگێڕان و ئامادەکردنی یعقوب ئاژەند، تاران: مولی، ١٣٨٠ک.ھ.

٤٦- **سلسلەهای اسلامی جدید**، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی فەرە یدون بەدرەیی، تاران: مرکز بازشناسی اسلام و ایران، ١٣٨١ ک.ھ.

٤٧- **شەرەفنامە**، نووسینی شەرەفخان بدلیسی، بە هەوڵ و گرینگیی پێدانی ڤیلادیمیر ڤیلیامینۆف، تاران: اسا**طیر، ١٣٧٢ک**.ە.

٤٨- **روشنفکران ایرانی و غرب**، نووسینی مهرزاد بروجردی، وەرگێڕانی جەمشید شیرازیی، تاران: فرزان روز، ١٣٧٨ ک.ھ.

٤٩- **مراصدالاطلاع علي اسماءالامکنة والبقاع**، نووسینی **صفي الدین بغدادی** بە هەوڵ و کۆششی علی محمد بجاوی، بیروت: دارالجلیل، ١٤١٢ک.

٥٠- **تاریخ ایران پژوهش کمبریج**، (**تاریخ دودمانی وسیاسی ایلخانان**)، نوسینی جان ئاندرو بویل،بەرگی پێنجەم وەرگێڕانی حەسەن ئەنووشە، تاران: ئەمیر کەبیر، ١٣٨١.

٥١- **دیوانی عبدالله پەشێو**، بەرهەمی عبدالله پەشێو، سوئێد، ٢٠٠٢ زاییینی.

٥٢- **مغولان و حکومت ایلخانان در ایران**، نووسینی شیرین بەیانی، تاران: سەمت، ١٣٧٩ک.ھ.

٥٣- **تاریخ جهانگشای**، نووسینی عەتا مولك جوینی، بە یارمەتیی موحەممەد رەمەزانیی، تاران، چاپخانە خاور، ١٣٣٧ک.ھ.

٥٤- **كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون**، نووسینی حاجی خەلیفە، بیروت: دارالفكر، ١٤٠٢ك.

٥٥- **تاريخ عرب**، نووسینی فیلیپ حیتتی، وەرگێڕانی ابوالقاسم پایەندە، تاران: اگاە، ١٣٨٠ ك. ھ.

٥٦- **اخبارالامراء وملوك السلجوقية (زبدةالتواريخ)**، نووسینی صدرالدین حسینی، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی رەمەزان روحوڵلاهی، تاران: ایل شاهسون بغدادی، ١٣٨٠ك.ھ.

٥٧- **کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا**، نووسینی حەسەن مەحمود حەمەکەریم، سلیمانی، ٢٠٠٢ زایینی.

٥٨- **تاريخ خوارزمشاهيان**، نووسینی الهیار و محبوبەی شەرەفی، خەلعەتبەری، تاران: سەمت،١٣٨١ك.ھ.

٥٩- **تاريخ الاسلام**، نووسینی شمس الدین زەھەبی، بە ھەوڵ و کۆششی عمر عبدالسلام تدمری، بیروت: دارالكتب العربی، ١٤١٧ ك.

٦٠- **تذكرة الحفاظ**، بیروت: دارالكتب العلمیه، بی تا.

٦١- **العبر خبر من غبر**، بە هەوڵی فوئاد سەید، کوەیت: **مطبعة حكومةالكويت، ١٩٨٤زایینی**.

٦٢- **دانشنامه جهان اسلام**، نووسینی جی، رابسون، (صلاح لدين) بەرگی سێهەم، لە ژێر چاودێریی ئیحسان یار شاتر، تاران: بنگاه ترجمه ونشر کتاب، ٢٥٣٥ شاهنشاهیی.

٦٣- **تاريخ جنگهای صلیبی**، نووسینی ئەستیۆن، رانسینمان، وەرگێڕانی منوچهر کاشف، تاران: علمی و فرهنگی، ١٣٨٠.

٦٤- **راحة الصدور و اية السرور در تاريخ ال سلجوق،** تاران: کتابفروشی علی اکبر علمی، ١٣٣٣ک.ه.

٦٥- **کردو پیوستگی نژادی وتاریخی او،** نووسینی غولامرەزا رەشید یاسمی، تاران: نشريات مجمع ناشر كتاب، بی تا.

٦٦- **دائرەالمعارف بزرگ اسلامی،(ابن اثیر)** بەرگی دووهەم، نووسینی رەزا رەزازادە لەنگرودی، لە ژێر چاودێریی کازم مووسەوی بجنوردی، تاران: مرکز دائرەالمعارف بزرگ اسلامی، ١٣٧٤ک.ه.

٦٧- **تاريخ مشاهیر کرد،** نووسینی بابا مەردوخ رووحانی، تاران: سروش، ١٣٧١ ک.ه.

٦٨- **دانشنامه جهان اسلام،** (ئیبنوئەسیر) نووسینی فرانس رۆزنتال، بەرگی سێهەم، لە ژێر چاودێریی احسان یارشاتر، تاران: بنگاه ترجمه ونشر کتاب، ٢٥٣٥ شاهنشاهی.

٦٩- **نسب نامه خلفا و شهریاران و سیر تاريخ حوادث اسلام،** نووسینی ئیدواردفن زامباور، وەرگێڕانی محمد جواد مشکور، تاران: کتابفروشی خیام، ٢٥٣٦ شاهنشاهی.

٧٠- **فرار از مدرسه،** نووسینی عبدالحسين زرين كوب، تاران: زانکۆی ئەمیر کەبیر، ١٣٧٩ ک.ه.

٧١- **تاريخ الدول والامارات الكردية في العهدالاسلامی ،** وەرگێڕانی محمد عەلی عەونی، بی جا، ١٣٦٤ ک.ه.

٧٢- **خلاصة تاريخ الكرد والكردستان من اقدم العصورالتاريخية حتي الان،** وەرگێڕانی محمد علی عەونی، مصر : **مطبعةالسعادة، ١٩٣٩ زایینی.**

٧٣- **دولت حمدانیان،** نوسینی فیصل سامر، وەرگێڕانی عەلیرەزا زەکاوەتی قەراگوزلو، قم: پژوهشکده حوزه ودانشگاه، ١٣٨٠ ک.هـ.

٧٤– **مراة الزمان فی التاریخ الاعیان،** نووسینی یوسف ابن قەزاوغەلی، سەبت ئیبنو جەوزی، بە هەوڵی عەلی سەویم، **انقرة: مطبعة الجمعیة التاریخیة الترکیة، ١٩٦٨ زایینی.**

٧٥- **طبقات الشافعیة الکبری،** نووسینی تاج الدین ابو نصر، سەبوکی، بە هەوڵی عبدالفتاح محمد حەلوو و محمود محمد تەناحی، قاهیره: **مطبعة عیسی الباجي حلبی وشرکاه، ١٣٨٣ک.**

٧٦- **دائرةالمعارف بزرگ سلامی،** (**ابن خلکان**)، نووسینی سادق سەجادی، بەرگی سێهەم، لە ژێر چاودێریی کازم مووسەوی بجنوردی، تاران: مرکز دائرەالمعارف بزرگ اسلامی، ١٣٧٤ ک.هـ.

٧٧– **منهج صلاح الدین الایوبي فی الحکم والقیادة،** نووسینی لوقمان تەییب سلیمان، **قاهرة، مطبعة الحسین الاسلامیة، ١٤١١ک.**

٧٨- **اطلس عراق در نقشەهای قدیم،** نووسینی احمد سووسە، وەرگێڕانی محمد گازرانی، تاران: کتێبی سەحاب سەر بە دامەزراوەی جوگرافیی و کارتوگرافی سەحاب، ١٣٦٤ ک.هـ.

٧٩– **الاکراد فی عهد عماد الدین زنکي،** نووسینی محمد فەتحی شاعر، مصر: المکتبات الکبری، بی تا.

٨٠– **صلاح الدین ناب ترین قهرمان اسلام،** نووسینی ئالبێر شاندوور، وەرگێڕانی روح بخشان، تاران: حروفیه، ١٣٧٨ ک.هـ.

٨١– **تعطیلات در تاریخ، وتووێژ، داریوش شایگان،** زستانی ١٣٧٣ک.هـ، لاپەڕە ٧–٢١.

٨٢- **مدينة سنجار من الفتح العربي الاسلامي حتى الفتح العثماني**، نووسینی حەسەن شەمیسانی، بیروت: دارلافاق الجدید ە، ١٤٠٣ ك.

٨٣- **مدينة ماردين من الفتح العربي الى سنة ٩٢١ زایینی**، بیروت: عالم الکتب، ١٤٠٧ ك.

٨٤- **تاريخ الموصل**، نووسینی سلیمان سائغ، بیروت: **مطبعةالکاثولوجیة، ١٩٨٢ زایینی**.

٨٥- **الوافي بالوفيات**، نووسینی صلاح الدین صفدی، بە هەوڵی عباس احسان و محمد یوسف نەجم و کەسانی تر، بیروت: دار صادر، ١٤١١ ك.

٨٦- **تاریخ فرق اسلامی**، نووسینی حسین صابری، تاران، سمت ١٣٨٣ ك .هـ.

٨٧- **جدال قدیم و جدید**، نووسینی سەید جەواد تەباتەبایی، تاران: نگاه معاصر، ١٣٨٣ ك.هـ.

٨٨- **دولت ایوبیان**، نووسینی سوهەیل تەقووش، وەرگێڕانی عبدالله ناصر تاهیری، قوم: پژوهشکده حوزه ودانشگاه، ١٣٨٠ ك.هـ.

٨٩- **دائرەالمعارف بزرگ اسلامی (ابن صلاح)، بەرگی چوارەم**، نووسینی محسن عابدی، لە ژێر چاودێریی کازم مووسەوی بجنوردی، تاران: مرکز دائرەالمعارف بزرگ اسلامی، ١٣٧٧ك.هـ..

٩٠- **تاریخ نگاری در اسلام**، نووسینی هادی عالمزاده و صادق سجادی، تاران : ١٣٨٠ ك.هـ.

٩١- **مقدمەی بر الاعلاق الخطیرة**، بەرگی سێهەم، نووسینییەحیا عبارە، نك: عزالدین ابن شداد.

٩٢- مقدمەای بر **وفیات الاعیان، نووسینی احسان عباس**، بەرگی حەوتەم، نك: ابن خلکان.

٩٣– **تاریخ ادبیات عرب،** نووسینی ج.م، عبدالجلیل، وەرگێڕانی ئازەرتاش ئازەرنووش، تاران: ئەمیر کەبیر، ١٣٨١ ك. هـ.

٩٤– **تاريخ جزيرة ابن عمر منذ تأسيسها حتي الفتح العثماني،** نووسینی محمد یوسف غندور، بیروت: دارالفکر اللبنانی، ١٩٩٠ زایینی.

٩٥– **دانشنامه جهان اسلام،** (ابن خلکان)، بەرگی سێهەم، نووسینی جی، و، فوك، لە ژێر چاودێری احسان یار شاتر، تاران: بنگاه ترجمه و نشر کتاب، ٢٥٣٥ شاهنشاهی.

٩٦– **قدرت، دانش و مشروعیت در اسلام،** نووسینی داود فیرحی، تاران: نی، ١٣٧٨ ك. هـ.

٩٧– **سفرنامه،** نووسینی ناسر خوسرەو قوبادیانی، بە هەوڵ و کۆششی جەعفەر شیعار، تاران: **قطرة، ١٣٧١ ك. ه.**

٩٨- **جغرافیای تاریخی کشورهای اسلامی،** نووسینی حوسین قەرەچانلوو، تاران: سەمت، ١٣٨٠ ك.هـ.

٩٩– **اثارالبلاد واخبارالعباد،** نووسینی زەکەریا بن محمد قەزوینی، وەرگێڕانی محمد مراد بن عبدالرحمن، تاران: زانکۆی تاران، ١٣٧١ ك.

١٠٠– **تاریخ دولت خوارزمشاهیان،** نووسینی ابراهیم قەفەس ئۆغڵیی، وەرگێڕانی داود ئیسفەهانیان، تاران: گسترە، ١٣٦٧ ك.هـ.

١٠١– **صبحی الاعشی فی صناعەالانشاء** ، نوسینی ابوالعباس احمد، قەلقەشقەندی، بی جاو **مؤسسة التاريخ العربي، ١٩٩١ زایینی.**

١٠٢- **مدارس نظامیه و تأثیرات علمی واجتماعی ان،** نووسینی نورالله کەسایی، تاران: ئەمیر کەبیر، ١٣٧٤ك.هـ.

١٠٣- **شهریاران گمنام**، نووسینی ئەحمەد کەسرەویی، تاران: جامی، ١٣٧٩ ك.ه.

١٠٤- **دائرەالمعارف بزرگ اسلامی، (ابن اثیر مجدالدین)**، نووسینی محمد علی لسانی فشارکی، بەرگی دووهەم، لە ژێر چاودێریی کازم مووسەویی بجنوردی، تاران: مرکز دائرەالمعارف بزرگ اسلامی، ١٣٧٤ ك.ه.

١٠٥- **جغرافیای تاریخی سرزمینهای شرقی**، نووسینی " گای لسترنج" وەرگێڕانی محمود عیرفان، تاران: علمی و فرهنگی، ١٣٧٧ ك. ه.

١٠٦- **تاریخ دولتهای اسلامی و خاندانهای حکومتگر**، نووسینی ستانلی لین پۆل، و کەسانی تر، وەرگێڕانی سادق سەججادی، تاران: تاریخ ایران، ١٣٧٥ ك . ه.

١٠٧- **اربیل فی عهد الاتابکی**، نووسینی محسن محمد حسین، بەغدا: **مطبعة اسد، ١٩٧٦ زایینی**.

١٠٨- **حدودالعالم من المشرق الی المغرب**، نووسەرەکەی نەناسراوە، وەرگێڕانی میر حوسین شا، تاران: دانشگاه الزهرا ، ١٣٧٢ ك.ه.

١٠٩- **سیری در تاریخ سیاسی کرد و کردهای قم**، نووسینی ئایەت محمدی، تاران: پرسمان، ١٣٨٢ ك.ه.

١١٠- **دانشمندان کرد در خدمت علم و دین**، نووسینی عبدالکریم مدرس، وەرگێڕانی احمد حواری نسب، تاران: **اطلاعات، ١٣٦٢ ك.ه.**

١١١- **تاریخ گزیده**، نووسینی حمدالله موستەوفی، بە گرینگی پێدانی ئیدوارد براون، تاران دنیای کتاب، ١٣٦١ ك.ه.

١١٢- **نزهةالقلوب**، بە گرینگی پێدان و هەوڵی "لسترنج گای" تاران: دنیای کتاب، ١٣٦٢ ك.ه.

١١٣– **احسن التقاسيم فى معرفه الاقاليم،** نووسینی ابوعبدالله محمد، مەقدیسی، وەرگێڕانی عەلی نەقی مونزەوی، تاران: شرکت **مؤلفان و مترجمان ایران، ١٣٦١ ك.ھ.**

١١٤– **تاريخ روضة الصفا،** نووسینی محمد بن خاوەندشا، میر خاند، تاران: کتابفروشیهای مرکز، خیام و پیروز، ١٣٣٩ ك. ھ.

١١٥– **تأملي در مدرنيتة ايراني،** نووسینی عەلی میر سوپاسی، وەرگێڕانی جەلال تەوەککولیان، تاران: طرح نو، **١٣٨٤ ك**. ھ.

١١٦– **شكل گيرى انقلاب اسلامى،** نووسینی موحسین میلانی، وەرگێڕانی موجتەبا عەتارزادە، تاران: گام نو، **١٣٨٣ ك**. ھ.

١١٧– **پژوهشهايى در تاريخ قفقاز،** نووسینی ڤیلادیمیر مینۆرسکی، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی محسن خادم، تاران: بنیاد دائرەالمعارف بزرگ اسلامی، **١٣٧٥ ك**. ھ.

١١٨– **سيرت جلال الدين منكبرنى،** نووسینی شهاب الدین محمد نەسەویی، بە هەوڵی موجتەبا مینۆیی، تاران: بنگاه ترجمه و نشر کتاب، ١٣٤٤ ك.ھ.

١١٩– **الدارس فى التاريخ المدارس،** نووسینی نەعیمی دیمەشقی، بە هەوڵی ابراهیم شمس الدین، بیروت: دارالکتب العلمیه، ١٤١٠ کۆچیی مانگیی.

١٢٠– **سلجوقنامه،** نووسینی زەهیروددین نیشابووریی، تاران: نشریات گلاله خاور، ١٣٣٢ك.ھ.

١٢١– **فرقه اسماعيليه،** نووسینی مارشال هاجسن، وەرگێڕانی فەرەیدوون بەدرەیی، تاران: علمی و فرهنگی، ١٣٧٨ ك.ھ.

١٢٢– **عقل در تاريخ** ، نووسینی " گئورك ویلهەم، هێگل" وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی حەمید عینایەت، تاران: شفیعی، ١٣٨١ك.ھ.

١٢٣- **غزالى نامه**، نووسینی جلال الدین هومایی، بی جا، کتابفرشی فروغی، ١٣٤٢ ك. هـ.

١٢٤- **جامع التواريخ**، نووسینی رشیدالدین **فضل الله** هەمەدانیی ، بە کۆششی بەهمەن کەریمیی، تاران: محمد حسین اقبال و شرکاه، ١٣٣٨ ك.هـ.

١٢٥- **معجم البلدان**، نووسینی ابو عبدالله یاقوت حەمەویی، بە کۆششی فەرید عبدالعزیز الجندی، بیروت: دارالکتب العلمیه، ١٤١٠ کۆچیی مانگیی.

١٢٦- **دائره المعارف بزرگ اسلامی، (ابن أثیر ضیاءالدین) بەرگی دووهەم**، لە ژێر چاودێریی کازم مووسا بجنوردی، تاران: مرکز دائرەالمعارف بزرگ اسلامی، ١٣٧٤ ك.هـ.

127- **ذیل مرات الزمان**، نووسینی قوتبەددین یونینی، حید راباد دکن، **مطبعة مجلس دائرة المعارف اعثمانیية، ١٣٧٤** کۆچیی مانگیی.

١٢٨- carole،Hillenbrand ، “Marwanids” **،Encyclopaedia of islam**
. 626-627، pp، v ، v، 1991، E.J.Brill،New edition

١٢٨- kurds،v،minorsky “ ، **Encyclopaedia** Kurdistan” **.of islam**
. 447-467، pp،v.vi ،Brill 1986،J،New Edition E

١٢٩- Richards، “salahadin” D.S. ، **Encyclopaedia of .islam**
. 910-914، PP،v. vIII ،Brill 1995،J، E، Edition،New

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | سـەدەیەك تەمـەنی نـوورین، مامۆسـتا عەبدولکـەریمی مـودەڕیس بـە پێنووسـی خـۆی بناسە | ئـا: عەبدولـدائیم مـەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵـەتی خیلافـەت، بوژاندنـەوەی کۆمەڵگـەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئـەدەبی گاڵتەوگـەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان‌و سەرنج‌و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست‌و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتـۆر صـەباح بـەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئـان وەحـی ئاسمانـە، نـەك ڕەنگدانـەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیـسلام‌و سیاسـەت، لێکۆڵینەوەیـەك لەمـەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام‌و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهـاتنی، ڕێکخـستنی، چـەکەکانی، هێـزی دەریایی‌و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ – ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەلامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵلا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان |

| | | |
|---|---|---|
| | | و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:<br>ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٧ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٨ | کـۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێڕی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفی محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧–٦٥٦ ک | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحیم معرفتی |